زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
٧






# ڕۆژی دوایی ١

# قیامەتی گچکە

وەرگێڕانی: ژیوانی گەلالی

لە بڵاوکراوەکانی: نووسینگەی تەفسیر

بسم الله الرحمن الرحيم

# قیامەتی بچکە

## نیشانەکانی قیامەتی گەورە

**مەبەست لە:**

## زنجیرەی هەزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی‌یە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی‌و سازێنەری بێداری‌و رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچونی تەسکی حزبایەتی‌و تاکرەوی‌و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت.

﴿ الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فَيَتبَعونَ أَحسَنَهُ؛ أولئكَ الذّينَ هَداهُمْ الله وَأولئِكَ هُمْ أولُوا الألباب ﴾ الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر

بیروباوەڕ لەبەر ڕوشنایی
قورئان وسوننەتدا

# ڕۆژی دوایی

# ١

# قیامەتی گچکە

# و

# نیشانەکانی قیامەتی گەورە

نوسینی : د. عومەر سلێمان ئەشقەر
وەرگێڕانی : ژیوانی گەلالی
پێداچونەوەی : نەوا محمد سعید

| | |
|---|---|
| زنجـــــیرەی: | بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا |
| ناوی کتێبە بە عارەبی: | القيامة الصغرى |
| نـــاوی نوســـەر: | د. عومەر سلێمان ئەشقەر |
| نـــۆرەی چـــاپ: | دووەم |
| ســـاڵی چـــاپ: | ١٤٠٨ك ١٩٨٨ز |
| ناوی کتێب بەکوردی: | قیامەتی گچکە |
| نـــاوی وەرگـــێڕ: | ژیوانی گەلاڵی |
| پێداچوونـــەوەی: | نەوا محمد سعيد |
| ئـــەرکی چـــاپ: | پرۆژەی وەرگێران |
| پیتچنـــــین: | نوسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر |
| نـــۆرەی چـــاپ: | یەکەم |
| ســـاڵی چـــاپ: | ١٤٢٢ك ٢٠٠١ز |
| چـــــاپکردن: | ئۆفسێتی هەولێر |
| تـــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |
| ژمـــارەی ســـپاردن: | ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠ |

# پێشەکی وەرگێران

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارتر و بەرهەمی بەپێزتر و پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کە گەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێوی‌و داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی ئازاد کرد، باڵی بەزەیی و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێلا و سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت و بڕ و تالان و بڕۆ و بەرهەڵدایی و بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری و خۆشی و داد و رێز و هێمنی و خۆشگوزەرانی و ئازادی و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە دێتەدی، بەلام تەقینەوەی بورکانی وێرانی و خراپەکاری و ناخۆشی و ستەم و بێهودەیی و نیگەرانی و تاڵگەردی و ژێردەستەیی و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامیەوە بەرپا دەبێ، چونکە هەموویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندناسی و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانکەر وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیاتنان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری

کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کە بەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانیو سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دو جەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەمو رۆژێ بۆمبای ئەتۆمی و هایدرۆجینی و نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتی و زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی بزاڤێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێ و لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرابێ. ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپا دەبێ و مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکار و دڵڕەق و بێبەزەیی و وێرانکاریش بێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەر و ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هزر و ئاوەز و دەرونی رێك دەخاتەوە و تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەست و خۆپەرستی لەسەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتەوە، ئەمجار رێوشوێنێکی راستاڵی بۆ رادەنوێنێو پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنە و نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یان لەهەر گۆشەنیگایەکەوە تێی روانیبێ و خزمەتێکی پێشکەش کردبێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەرد و دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ، هەڵبەت کارێکی گەورەی ئەنجام داوە و خزمەتەکەی بەشێکە لەم رزگاربونە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەوداڵە.

دیاره ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر نوسیویەتیو ناوی ناوە ((العقيدة في ضوء الكتاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کە متمانەی کردۆتە سەر سەرچاوەو ژێدەرە رەسەنەکانی بیروباوەڕ و بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێ و ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوە و پاك و پوختەکەی راگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لە رانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادە و رێکوپێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لە بەرگەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەرتوکەکەش پڕ ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەر تیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی رۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکیو سودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە وەرگێڕانی ئەم زنجیرەیە گەلێك پێویست بو بۆ رابونی ئیسلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگیو لەبەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لە وەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە ئاستێکی زمانەوانی باشی پێبدەین و ئیشکالات بۆ خوێنەر بەجێنەهێڵین، وا بەرهەمەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسەنگێنن، لەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتو بین و توانیبمان خزمەتێك بەم رابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمە و ئێوەش ببەخشێ.

ئارامی گەلاڵی ژیوانی گەلاڵی

بسم الله الرحمن الرحيم

ەسپێکی هەمو چاکە و خێرێك و مایەی تەواوی هەمو نیعمەتێکە.

**قورطوبی لە (التذكرة)دا دەڵێ:**

" زاناکانمان دەڵێن: هەر کەسێك مرد، قیامەتی لێ هەستا، بەڵام قیامەتی گچکە و گەورە هەیە، بچوکەکەیان ئەوەیە کە بە دەرچونی گیان لە هەمو مرۆڤێك هەڵدەستێ و بریتیە لە دابڕان لە کەسوکاری و پچڕانی کۆششی و، وەدەست هێنانی کردەوەکانی، گەر چاك بن بە چاکە و ئەگەر خراپیش بن بە خراپە، قیامەتی گەورەش ئەوەیە کە لە هەمو خەڵکی هەڵدەستێ و، تێکڕا هەموان دەگرێتەوە."

# پێشەکی پەرتوکەکە

سوپاس بۆ خودای ژیانبەخش و ژینستێن، کە گیانان لە جەستەکاندا جێگیر دەکا و دەشیانکێشی، ئەو خودای لە خۆڵی بەدیهێناوین و دەمانکاتەوە خۆڵ، کەنگیش بیەوێ هەر لەخۆڵی قیتمان دەکاتەوە و دەمانژێننەوە.

درود و سڵاویشم پێشکەش بەو بژاردە و سەرپشکەی گەلێك فەرمودەی لەبابەت مردن و سەختی مردن و، قیامەت و پەرژەنگ و کارەسەتەکانی و، ئاگر و ئەشکەنجەکانی و، بەهەشت و شادی نیعمەتەکانی فەرمون. جا بەندەکانی لە بێئاگایی وەئاگاهێناوە و، لەسەرگەردانی دەربازی کردون و، بەرەو ڕاسترین ئاڕاستە هەڵی ناون.

هەروەها درود و سڵاو پێشکەش خانەوادە بێگەردەکەی و هاوەڵە پاك و چاکەکانی دەکەم، لەگەڵ ئەوانەی بە چاکەکاری شوێنیان کەوتون و بە دڵانێکی پەیوەست بە دوایین لە دونیا نیشتەجێ بون، کرد و کۆشیان بۆ ئەو ماڵە هەرماوە بوە و دەسەنەیان بۆ گەیشتنە ئەو مرازە بوە. هەتا بە پەروەردگاری خۆشیان گەیشتون هەر ئەوە حاڵیان بوە. بەرمیهری خودا کەون و لێیان ڕازی بێ.

ئەوجا: ئێمە بەویستی خودای ژینبەخش و داهێنەر بۆ ژیان هاتوین، ئەو کاتەش ژیان جێدێلین کە خودای خاوەن ئەسپاردە دەیسێننەوە و دەیکێشێ، کۆمەڵانێك دێن، هی دیکەش گوزەر دەکەن، وەکو شەپۆڵە یەك لە دوایەکەکانی دەریا وان، کە یەکێکیان لە لێوار دەشکێتەوە و کۆتایی دێ، یەکی دیکە بە دوایدا دێ. وەکو ئەو روبارە لە گوڕەش وان، کە بەردەوام ڕێ دەکا. بەڵام ئەو ئاوەی تۆ ئێستا دەیبینی، جودایە لەوەی پێش تەنها چرکەیەك دیبوت. هەروەها وەك چیمەنی بەهارێ هەمیشە سەوزن، هەرکاتێك شتێکی لێ وشك دەبێ، یەکێکی دی چرۆ دەکا، وەکو تابلۆیەکی رۆشن دەر وان بە سەدان هەزار مۆم رۆشن کرابێتەوە، هەردەم دەیبینین ڕوناکە، بەڵام

که لێی ڕادەمێنین، لەو ڕازو نهێنییە دەگەین کە بەردەوام ڕۆناکی هێشتۆتەوە. چونکە هەر مومێکی دەسوتێ یەکی دی بەدوادا دێ، بەڵکو ڕەنگە ئەو مۆمانەی دادەگیرسێن زێتر بن لەوانی دەسوتێن و کۆتاییان دێ.

بەڵام ئەم کشان و درێژ بونەوە مرۆڤانە یەك بە دوای یەکە ڕۆژێك دێ کۆتایی دێ. ئەو ڕۆژە دێ کە کۆتا بەسەرجەم بونی مرۆڤ دێ، بەڵکو تێکڕای گەردون دادەڕمێ، جا هەمو ئەستێرەکانی شەو دەکوژێنەوە، شەپۆلەکانی دەریا دەوەستن، هەرچی گژوگیا و دارودەوەنە وشك دەبن. ئاوی ڕوبار و کانیاوان چك دەکەن، بەڵام ئەم تەفروتونابونە کۆتایی نیە. بەڵکو ئەمە یەکێکە لەو قۆناغانەی مرۆڤی پێدا ڕەت دەبێت، ئەویش ڕۆژێکی دێ کە هەموانی تێدا دێینەوە ژیان و، لەبابەت ئەوی پێشکەشمان کردوە و کردومانە لێمان دەپرسرێتەوە.

بڕوابون بە گەڕانەوە بۆ ژین و، پاشانیش نەمری و جاویدانی، بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی مرۆڤ زۆر پێویستە، چونکە ئارەزوی جاویدانی و مان لە ناخی مرۆڤ ڕەگاژۆ بوە، هەر بۆیە ئیبلیس توانی ئادەم هەڵخەتێنێ بۆ خواردنی ئەو دارەی لێی حەرام کرابو، بەوەی گوایە دەبتە مایەی نەمری و جاویدانی خۆی و ژنەکەی، ﴿يَاآدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى: هۆ ئادەم داری نەمریت پێ نیشان دەم لەگەڵ موڵکێکی تا هەتایی و لەبن نەهاتو﴾طه /١٢٠.

بێبڕواییش بە ژیانەوە و زندوبونەوە، ناخی مرۆڤ توشی داڕمان و سەرگەردانی دەکات و، لاڕێبون و وێڵیش دەخاتە ڕاڕەوی مرۆڤ لە ژیاندا.

هەندێك لەوانی باوەڕیان بەگەڕانەوە بۆ ژیان نیە، دەست بە ناڵە و فیغانی خەمگین دەکەن بۆ ئەو ژیانەیان کە بە تێپەڕبونی هەر چرکەیەك لێی کەم دەبتەوە و دەتاشرێ، جا ڕەنگە ئەمە بیانخاتە باوەشی گۆشەگیری و ژانی پڕ سوێوە هەتا ئەوکاتەی مردن دەیانگاتێ. خۆ ئەگەر نوسەر و هۆنەر(شاعیر) بن، ئەو هەستە خەمۆکانەیان تۆمار دەکەن کە سەردولکەی ژیانی خۆیان پێ هەڵبەستاوە و، دەیانخەنە دو توێی وتار و پەڕتوك و هۆنراوەی وا کە ژان و ژوار و ناشادی و سەرگەردانیان بەرجەستە دەکات، تا ببێتە دڵدانەوەیەك بۆ ئەوانی بەهەمان دەردی وان چوینە. کەچی لەڕاستیدا دەردە

و دەچێتە سەر دەردان، جا نەخۆشان ماڵ وێرانتر دەکات لەباتی چارەکردنیان. هەندێکی دیش لەبێبڕوایان بە ژیانەوە و زندوبونەوە، هەڵپە دەکەن بۆ قۆزتنەوەی چێژ و تێرکردنی ئارەزوەکانیان، وەك بڵێی ململانێی کات دەکەن و، دەترسێن ڕۆژانیان تێپەڕ بێ و هێشتا لە خۆشیەکانی ژیان تێر نەبوبن.

ئەو ماوە کەمەی ئێمە لەم دونیایەدا دەیگوزەرێنین، بەهایەکی گەورەی هەیە بۆ دیاریکردنی ڕێڕەومان لەپاش ئەم ژینە، ڕێگەی ئاسودەیی هەمیشە و هەتاهەتاش کە دەگاتە هەرمان لە خانەی نەمراندا، بەوەی بەندە کە بالأبونی ڕاستەقینە لە ناخی خۆمان و خەڵکی دیکە وەدی بێنین. جا ئەم بالأبون و بەرەوژور چونەی گیانمان دەپاڵێوێ و، کردەوەمان ڕاست دەکاتەوە و، ڕەوشتمان مشتوماڵ دەکا، بەرنامەیەکی ڕەسەن و رونی هەیە لەوەی پەیامبەرە بەڕێز و پایەدارەکان بۆیان هێناوین و کتێبە ئاسمانیەکان لە خۆیان گرتون.

کاتێك کە ژیان و ژیانەوەمان هێندە پێکەوە پەیوەست بن و، ئەم ژیانە وەکو چاندن و کشتوکاڵ وابێ و، ئەوی دیکەش وەك درونە و چنین و ڕنین، پێویستە مرۆڤ هێندە لەبارەی ژیانی دوایی بزانێ کە هانی بدات تا خۆی بۆ ئامادە بکات و تفاقی بۆ سازبدا و، ژیانی دنیای بەو جۆرە بەسەر ببات کە لە دواییدا خێر و پایەداریی بۆ دابین بکات.

لەبەر ئەوەی ژیانی دواییشمان پەنهانە و، هیچ کەسێك لە خاوەن ئاوەز(عەقڵ)ە سموك و دڵە روناکەکان نایانکرێ پەردەکانی شەق کەن، چ جای ئەوانی خوار ئەمان. جا خوای گەورە هەواڵی ڕێڕەوی گەشتی ئەو دیو ژیان و چارەنوسی حەتمی پێ ڕاگەیاندون، و باسی ژیانی دوایین لەگەڵ باسی ئەم ژیانەدا، تا ڕادەی تێکهەڵکێشران بەتێکەڵی هێناوە، بۆ وەدیهێنانی چاکسازی و ڕاستکردنەوەی ناخ و دەرونان، لە جیهانێکی وادا کە گەلێك بەدیهێنراو لە مرۆڤ و جنۆکان بۆ گومڕاکردنی بەندان و وەدەرنانیان لە شاڕێگەی ڕاستی هەوڵ دەدەن.

ئەو زانستانەش کە خودای مەزن پێی داوین لەبارەی ڕۆژە پەنهان و داپۆشراوەکەی کە تێیدا دەگەڕێینەوە لای خوا، ئاماژە و هێما لەو زانستەدا

ناگونجێن، بەڵکو پێویستی بە قسە و باسێکی رون و هەمەلایەنەیە. مرۆڤ ئەوەی تێدا بەدی بکات، کە ئاوەر(یقین)ێکی وا پتەوی لەلا دروست بکا و هیچ گومان و دودڵیەکی تێکەڵ نەبێ. هەر کەسێك چاو بگێرێ بەوەی لەم کتێبەدا لەبابەت رۆژی دوایی تۆمارمان کردوە، دەبینێ برێکی چەند زۆر دەقی قورئانی پیرۆز و فەرمودەی صەحیحی لە خۆ گرتوە. ئەم دەقانەش وێنەیەکی ورد بۆ زۆر مەسەلان بەدەستەوە دەدەن کە لە ژوان(معاد)ی دوای مردنێ رودەدەن.

ئەو ژوانەش پەنهانە، بەلام پەنهانێکی راست. واش نابێ مەگەر هەواڵەکە یەکراست لە خوای گەورە بێ یا لە پێغەمبەرﷺەوە بەراستی گەیشتبێتە ئێمە، هەر بۆیەش لەم نوسراوەدا پشتم لەو هەواڵانە کردوە کە بەسەنەدێکی راستەوە لە پێغەمبەرﷺەوە نەهاتون، هەروەك پشتیشم لە پەیرەوی ئەوانە کردوە کە بیانو و بەڵگەهاوردن بە فەرمودەی صەحیح رەت دەکەنەوە، ئەگەر فەرمودەکە یەکیەکی (آحاد) بێ.

هەروەك بەشوێن بەرنامەی ئەوانەش نەکەوتوم کە بەکەیفی خۆیان دەقەکان لێك دەدەنەوە و تەئویلیان دەکەن و مانایان دەگۆڕن، ئەوانە کە هۆش و ئاوەز(عەقڵ)ی خۆیان کردۆتە دادوەر و دەقەکانی پێ هەڵدەسەنگێنن، جا تەرازوەکەیان ئاوەژۆ کردۆتەوە، دادکاریان لەلا بۆتە بەرداد(محکوم)، بەخۆیان گومڕا بون و خەڵکیشیان گومڕا کردوە. باری هەندێکیان گەیشتۆتە ئاستێك زۆر لە روداوەکانی دوایی بە درۆ دەخەنەوە، کە بەهۆی هەواڵی راست و دروستەوە پێمان گەیشتون، پێودانگیشیان هەر پێوەرە ئاوەزیەکانە، ئەگەر بەوردی تێی بڕوانن، گەندەڵیان لا رون دەبێتەوە، ئەگەر بە زانستەکانی رۆژی دواییشدا قوڵ ببنەوە و ڕۆبچن، بۆیان دەردەکەوێت دوایین(آخرة) لەم دونیایە جیاوازە، کێشانە و پێوانەکانی دوایینیش لەهی دونیا جودان.

سۆراخ و تۆژینەوەش بۆ رونکردنەوە و دەرخستنی ئەم بنەما مەزنەی بیروباوەڕ، درێژەی کێشا، بۆیە پێویست بو بۆ سێ بەشان دابەشی کەین، هەر بەشێکی بەجیا لە کتێبێکدا دەربچێ:

بەشی یەکەم: بابەتەکەی قیامەتی گچکە و نیشانەکانی قیامەتی گەورەیە.

بەشی دوەم: قیامەتی گەورە.

بەشی سێیەم: بەهەشت و دۆزەخ.

جا ئەمە کتێبی یەکەمە، کە لە دو دەروازان پێك دێ هەروەك لە ناونیشانەکەیڕا دیارە، دەروازەی یەکەم، لەقیامەتی گچکە دەکۆڵێتەوە، کە مەبەستمان پێی مردنە، جا مردن و، گۆڕ وفیتنەکەی و، نیعمەت و ئازارەکەی. پاشان گیان و چارەنوسی گیان لەبەرزەخدا.

دەروازەی دوەمیش لەبابەت نیشانەکانی قیامەتە، ئەو نیشانانەی بەڵگەشن لەسەر نزیك بونەوەی قیامەت زۆرن و گەورەیان هەیە و، گچکەشیان تێدایە، لە نیشانە گچکەکانیش هەیانە ڕویداوە و بەسەرچوە، هەشیانە هێشتا ڕویان نەداوە. نیشانە گەورەکانیش هێشتا ڕویان نەداوە، هەروەك لەم دەروازەیە لەبابەت هەموی دەدوێین.

لە کۆتاییشدا لە خودای بەرز دەپاڕێمەوە، ئەم کتێبە بکاتە مایەی سود و، بە پاکی قبوڵی بکاو، درود و سڵاویش پێشکەش بە موحەمەدی بەندە و پەیامبەری و خانەوادە و یارو یاوەرە بەڕێزەکانی.

د. عومەر سلیمان ئەشقەر

کوێت

لە شەشی ڕەمەزانی ١٤٠٦

١٤ / ٥ / ١٩٨٦

# بەندی یەکەم
# پێناس و ڕونکردنەوە

**ئەو قۆناغەی کە مرۆڤ لەپاش ژیانی دونیا پێیدا تێپەڕ دەبێت، چەند ناوێکی هەیە: قیامەتی گچکە، بەرزەخ، مردن، جا بڕێك بە وردی ئەم سێیە دەخەینە ڕو:**

## جێباسی یەکەم

## پێناسی قیامەتی گچکە

**قیامەتی گچکە بریتیە لە مردن، جا هەر کەسێکی مرد ئەوا قیامەتی لێ هەڵساوە و، کات و دەمی داهات، لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە، لە عائیشەوە دەڵێ: پیاوانێك لە دەشتەکیەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و لەبارەی قیامەت لێیان دەپرسی، ئەویش سەیری بچوکترینیانی دەکرد و دەیفەرمو: ((ان یعش هذا، لا یدرکه الهرم حتی تقوم علیکم ساعتکم: ئەگەر ئەمە بژی، پێش ئەوەی پیر بێ قیامەتتان بەسەردا ڕادەبێ))[1]، ئیبنی کەثیر دەڵێ: (مەبەست بەسەرچونی سەردەمی ئەوان و، چونیانە بۆ جیهانی دوایین(آخرة)، چونکە هەر کەسێکی مرد، دەچێتە بەر حوکمی دوایین، هەندێك خەڵکیش دەڵێن: ئەوەی مرد قیامەتی لێ هەڵسا، جا ئەم قسەیە بەم مانایە ڕاستە)[2]**

**ئیبنی کەثیر ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە پیتۆڵان(فلاسفة) بەمەبەستێکی گەندەڵ**

---

[1] مشكاة المصابيح: (٣/٤٨).

[2] النهاية لأبن كثير: (١/٢٤).

ئەم قسەیە دەڵێنەوە، بێباوەڕان وایان مەبەستە کە مردن قیامەتە پاشی وی چ قیامەتێکی دی نیە، ئیبنی کەثیر دەڵێ: (( ڕەنگە هەندێك بێبڕواش هەبن وا بڵێن، بەڵام ئاماژەیان بەمەبەستێکی دیکەی ناڕەوا بێت، جا هەرچی قیامەتی مەزنە، کەبریتیە لە وەختی کۆبونەوەی پێشین و پاشینان، ئەوە خودای مەزن زانستی ئەو کاتەی تەنها بۆ خۆی جێهێشتوە.)[1]

هەروەها قیامەتی گچکە بە ژوانی(معاد) یەکەم ناو دەبرێت و پێشی دەگوترێت بەرزەخ.

ئیبنیقەیم دەڵێ: (مردن ژیانەوە و ژوانی یەکەمە)، چونکە خودای مەزن دو ژوان و دو ژیانەوەی بۆ ئادەمیزاد داناوە. بەخراپە سزای خراپەکاران و بە چاکە پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە. جا ژیانەوەی یەکەم: جیابونەوەی گیانە لەلەش و، چارەنوسەکەی بۆ یەکەم خانەی سزاو پاداشە))[2].

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[2] الروح، لأبن القيم: ص١٠٣.

## جێباسی دووەم

# بەرزەخ

لەنێو قسەی عارەباندا مەبەست لە بەرزەخ ناوبڕە(حاجز)ی نێوان دو شتانە. خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا: ناوبڕەیەکی خستە نێوانیان.﴾[1].

بەپێی زارەوەی شەرعیش مەبەست لە بەرزەخ؛ ئەو خانەیە کە لە دوای مردن تا ژیانەوە دەگرێتەوە. خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ: پاش ئەوەی دەمرن بەرزەخێکیان لە پشت سەرەوە هەیە تا رۆژێك کە زیندو دەکرێنەوە﴾[2].

موجاهید دەڵێ: بەرزەخ بریتیە لەنێوانی مردن و ژیانەوە. بە (شەعبی)یان گوت: فلانەکەس مرد، گوتی: ئەو ئێستا نە لە خانەی دونیایە نە لە دوایین.[3]

ئیبنیقەیم دەڵێ: سزاو بەهرە(نعیم)ی گۆڕ ناوە بۆ سزاو بەهرەی بەرزەخ کە بریتیە لە نێوانی دونیاو دوایین، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ جا ئەهلی ئەم بەرزەخە لەسەر رۆخی دونیاو دوایيندان.

---

[1] سورة الفرقان: ٥٣.

[2] سورة المؤمنون: ١٠٠.

[3] التذكرة للقرطبي: ١٧٧.

جیاسی سێیەم

# مردن

## خوازگەی یەکەم

## مردن لە ڕوی زمان و زاراوەدا

ژیان و مردن وەکو روناکی و تاریکی و ساردی و گەرمی پێچەوانە و دژیەکن. بۆیە فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی، هەر یەکەیان بە دژ و پێچەوانەی ئەوی دی دەناسێنێ. جا لە پێناسەی ژیاندا دەڵێ: (ژیان پێچەوانەی مردنە، زیندو لە هەر شتێکیشدا پێچەوانەی مردنە، بەکۆ و سەرجەمیش دەڵێن زندوان)[1]. لە پێناسی مردنیشدا دەڵێ: (مردن دژ و پێچەوانەی ژیانە)[2] بنەڕەتی مردنیش لە زمانی عارەباندا: داسەکنان(سکون)ە، هەرشتێکی داسەکنا و دامرکا ئەوە مردوە[3]، جا دەبینی عارەب دەڵێن: (ئاگرەکە تەواو مردوە، ئەگەر خۆڵەمێشەکەی تەواو سارد بوبێتەوە و چ پەنگر(پشکۆ)ی تێدا نەمابێ، هەروەها گەرمی و ساردی مردن، ئەگەر هێور بونەوە و، بایەکە مرد ئەگەر هێدی بۆوە داسەکنا و، شەڕابەکە مرد ئەگەر هەڵچونی داسەکنا، هەروەها مردو هەمو شتێکی بێگیانە).[4]

ئەگەر بنەڕەتی مردنیش لە زمانی عارەباندا، داسەکنان بێ، کەواتە جوڵە بنەڕەتی ژیانە، لە (لسان العرب)دا هاتوە: (زیندو هەمو قسەکەرێکی خاوەن دەنگە، زیندوش

---

[1] لسان العرب، لأبن منظور: (١/٧٧٤).

[2] لسان العرب: (٣/٥٤٧).

[3] لسان العرب: (٣/٥٤٧).

[4] لسان العرب: (٣/٥٤٧).

له ڕوەكدا ئەوەیە كە نەرم و تەڕە و دەهەژێ))[1] ژیانی مرۆڤیش بەوە دێتەدی كە گیان فو دەكرێتە جەستەی كۆرپەڵە لە پزدان(رحم)ی دایكیدا، مردنیش (دابڕانی پەیوەستبونی گیانە بە لاشە و، جێهێشتن و جیابونەوەی نێوانیانە، لەگەڵ گۆڕانی بار و، گواستنەوە لە خانەیەكەوە بۆ خانەیەكی دیكە))[2].

## خوازگەی دووەم

## مەرگی گەورە و مەرگی گچكە

نوستن بە مردن دەچێ، هەر بۆیەش زاناكانمان بە مەرگی گچكە ناوزەدیان كردوە، نوستن مردنە، لە خەو ڕابونیش ژیانەوە و زندوبونەوەیە ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ: هەر خوداشە لە كاتی شەودا لە نوستن گیانتان دەگرێ، دەتانمرێنی و دەزانێ لە ڕۆژدا چی دەكەن، كە ڕۆژیش بۆوە زندوتان دەكاتەوە﴾[3]. جا لە خەودا گیانی بەندان دەكێشرێ، هەركەس خودا بیەوێ گیانی بگرێ لەكاتی نوستندا دەیگرێ و، ئەوی بیەوێ بشمێنێ گیانەكەی دەداتەوە تا ئەو كاتەی خودای گەورە بۆی دیاریكردوە. خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى: خودا لەكاتی مەرگدا گیانگەلێ دەستێنێ و، كەسێكیش نەمردبێ لە خەوی خۆیدا بێ، جا ئەو گیانانە دەستێنێ كە فەرمانی مەرگیان بۆ هاتوە، ئەوانی دیش تا كات و سەردەمی دیاریكراو دەیانهێڵێتەوە﴾.[4]

(خودا هەواڵی پێ داوین كە هەر دو ڕەوان(نەفس)ی ڕاگیراو و ناردراوە، بە مەرگی

---

[1] لسان العرب: (٧٧٣/١).

[2] التذكرة للقرطبي: ٤

[3] سورة الأنعام: ٦٠.

[4] سورة الزمر: ٤٢.

خەوێ مردون، ئەوانەش سێیەم بەشن کە بەمەرگی مردنێ مردون، ئەوانەی خوای گەورە لە فەرمودەی خۆی پێشی خستون: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا﴾. جا خودا دو مەرگی باسکردوە؛ مەرگی مردن و، مەرگی نوستن، باسی ڕاگرتنی یەکیان و ناردنەوەی ئەوی دی کردوە.

ئاشکرایە کە خودا گیانی هەمو مردوێك ڕادەگرێ؛ جا چ لە نوستنێدا مردبێ چ پێشتر، کە دەفەرمێ: ﴿ اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا﴾ ئەوانە دەگرێتەوە، کە لەکاتی وەئاگایی مردون و ئەوانەش کە لە نوستندا مردون. کە باسی هەردو جۆرە مەرگیشی فەرموە، باسی ئەوەی کردوە کە لە یەکێکیان گیانان رادەگرێ و لەوی دیکە دەیاننێرێتەوە. ئەمەش روکەشی بێژکەیە بێ خۆگرانبارکردن.)[1]

## خوازگەی سێیەم

## مردن هەردێ و چارەی نیە

مردن هەر دێ و هیچ چارە و دەرفەت و بوارێکی لێ دەرباز بونی نیە، هەروەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ: هەمو شتێك تێ دەچێ لە زاتی پاکی خودا بترازێ. فەرمان و حوکم تایبەت بەوە و تەنیا بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە﴾[2]. هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ: هەرچی لەسەر ڕوی زەوی دایە لەناو دەچێ، تەنیا زاتی خاوەن شکۆ و بەڕێزی پەروەردگارت دەمێنێتەوە﴾[3]. دیسان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَنْ زُحْزِحَ عَنْ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ: هەمو نەفسێك چێژەری مەرگە، و بەڕاستی لە ڕۆژی بەرێدا(قیامەت) پاداشتان بە تەواوی وەردەگرن، جا هەرکەسێکی لە ئاگر دوربکرێ و

---

[1] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٥/٤٥٢).
[2] سورة القصص: ٨٨.
[3] سورة الرحمن: ٢٦ – ٢٧.

بردرێته بەهەشت، بەڕاستی رزگار بوه و، ژیانی دنیاش لە فریو بترازێ هیچی دیکە نیه﴾[1].

ئەگەر کەسێك لە مردن دەرباز ببا، چاکترین ئافەریدە(بەدیهێنراو)ی خودا کە موحەمەدەﷺ لێی دەرباز دەبو: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ: بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن﴾.[2] خودای گەورەش بەوە دڵی پێغەمبەرەکەی داوەتەوە، کە مردن سونەتی خۆیەتی لەنێو بەدیهێنراوەکانیدا: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِيْنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ: ئێمە بەر لە تۆ جاویدانی(نەمری)مان بۆ هیچ مرۆڤێك دانەناوە. جا ئایا ئەگەر تۆ بمری، نەمری و جاویدانی بۆوان دەبێ؟!﴾[3].

مردنیش حەقێکە لەسەر مرۆڤ و جنۆکە، لە فەرمودەیەکی صەحیحدا لە ئیبنی عەبباسەوە رضي الله عنه هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((اعوذ بعزتك الذي لا اله الاّ انت الذي لا يموت، والإنس والجن يموتون: سوێند بە عیززەتی تۆ کە جگە لە تۆ هیچ خواوەندێکی دیکە نیە، کە تۆ نامری و، مرۆڤ و جنۆکە دەمرن)).

## خوازگەی چوارەم

## مردن وادەیەکی دیاریکراوی هەیە

مردن لەکاتێکی تایبەت دێ، کەس ناتوانێ ئەو ئاکام و ئەو وادەیە ببەزێنێ کە خودا دایناوە. خوداش ئاکامی بۆ بەندان خەملاندوە. قەڵەمیش ئەو وادە و ئاکامەی لە تەختی پارێزراو(لوح المحفوظ)دا نوسیوە. فریشتە بەڕێزەکانیش ئەو کاتە نوسیویانە کە مرۆ لە زگی دایکیدا بوە. جا مرۆڤ بۆی نیە پێشکەوێ یان پاشکەوێ لەوەی بۆی نوسراوە، هەر مرۆڤێکیش بمرێ یان بکوژرێ یان بخنکێ یان لە فڕۆکە بەربێتەوە، یاخود بەکارەساتی ئۆتۆمبیل بچێ، یان بسوتێ، یان بە هەر هۆکار و

---

[1] سورة آل عمران: ١٨٥.
[2] سورة الزمر: ٣٠.
[3] سورة الانبياء: ٣٤

**کارەساتێکی تر، ئەوا بەو ئاکامە چوە کە خودا بۆی خەملاندوە و بڕیاری داوە. دەقێکی زۆریش بەڵگەن لەسەر ئەمە، خوای بەرز دەفەرموێ:**

﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلاً: **بۆ هیچ کەسێك نابێ بمرێ، مەگەر بە ئیزنی خودا، مردن نوسراوێکە کاتێکی بۆ دیاریکراوە**﴾[1].

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ: **لەهەر کوێ بن مردن دەتانگاتێ، هەرچەند ئەگەر لەناو قوڵنگرە و قەڵای قایمیش دابن.**﴾[2]

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ: **هەر نەتەوەیەك ماوە و وادەیەكی دیاریکراوی هەیە. جا کاتێك وادەیان هات، سەعاتێك پاش و پێشیان بۆ نیە**﴾[3].

**وە دەفەرموێ:** ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلاَقِيكُمْ: **بڵێ: بەڕاستی ئەو مردنەی کە لەبەری هەڵدێن، بێگومان دەتانگاتێ**﴾[4].

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ: **ئێمە لە نێو ئێوەدا مردنمان دانا و کەس لە ئێمە وەپێش ناکەوێ**﴾[5].

**لە صەحیحی موسلمیشدا لە عەبدوڵلای مەسعودەوە هاتوە، دەڵێ: ئوم حەبیبە**(ڕەزای خوای لێبێ) **هاوسەری پێغەمبەر ﷺ گوتی: (خودایە، تەمەنی پێغەمبەری خودای هاوسەرم و، ئەبو سوفیانی باوکم و، موعاویەی برام بۆ درێژکە).**

**جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لقد سألت الله لآجال مضروبة، وأيام معدودة، و أرزاق مقسومة، لن يعجل الله شيء قبل أجله، ولن يؤخر الله شيئا بعد اجله، ولو كنت سألت الله أن يعيذك من عذاب النار، وعذاب في القبر كان خيرا و أفضل: **تۆ لە وادە و ئاکامی دیاریکراو و، ڕۆژانێکی ژمێردراو و، ڕزق و ڕۆزی بەشکراو، داوات لە خودا کردوە. هیچ شتێك وە پێش وادەی خۆی ناخرێ و، خودا هیچ شتێکیش دوا ناخاتە پاش وادەی خۆی،**

---

[1] سورة آل عمران: ١٤٥.
[2] سورة النساء: ٧٨.
[3] سورة الأعراف: ٣٤.
[4] سورة الجمعة: ٨.
[5] سورة الواقعة: ٦٠.

ئەگەر لە خودا بپاڕابایەوە لە ئەشکەنجەی ئاگر و، ئەشکەنجەی گۆڕ پەنات بدات چاکتر و باشتر بو)).[1]

## خوازگەی پێنجەم

## کاتی مردن لە ئێمە بزرە

بەندەکان نازانن کەینێ مردن دێت و، دەبێتە میوان، چونکە ئەو زانستە تەنها بۆ خودایە و، یەکێکە لە کلیلەکانی نیهانی(غەیب)، کە خودا ئەو زانستانەی تەنها بەخۆی داوە. خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ: کلیلەکانی نیهانی لای خودان و، وبێجگە لە خودا کەس پێیان نازانێ﴾[2]

هەروەها دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ: بەڕاستی زانستی داهاتنی وەختی دیار لای خودایە و، هەر ئەو باران دەبارێنێ و، دەزانێ چی لە پزدانی دایکان هەیە و، هیچ کەس نازانێ سبەینێ چی وەدەست دێنی و کەسیش نازانێ لە کام زەویدا دەمرێ، بەڕاستی خودا زاناو ئاگادارە﴾[3].

هەروەها بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئیبنی عومەرەوە دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((مفاتيح الغيب خمس لا يعلمهن الاّ الله؛ ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ

---

[1] رواه مسلم في كتاب القدر من صحيحه، و احمد في المسند (١/٣٩٠،٤١٣،٤٤٥).

[2] سورة الانعام: ٥٩.

[3] سورة لقمان: ٣٤.

تَمُوتُ إِنَّ اللَّـــــهَ عَلِيــمٌ خَبِـــيرٌ﴾: کلیلەکانی نیهانی پێنجن بێجگە لە خودا کەس نایانزانێ: (بەڕاستی زانستی داهاتنی وەختی دیار لای خودایەو، هەر ئەو باران دەبارێنێ و، دەزانی چی لە پزدانی دایکاندا هەیەو، هیچ کەس نازانێ سبەینێ چی وەدەست دێنی و کەسیش نازانێ لەکام زەویدا دەمرێ، بەڕاستی خودا زانا و ئاگادارە)).[١]

هەروەها ئەحمەد و تیرمذی و جگە لەوانیش لە کۆمەڵە یاوەرێکی پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە گوتویانە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((اذا اراد الله قبض روح عبد بأرض جعل له فيها –او قـــال: بهـــا– حاجـــة: ئەگەر خودا ویستی گیانی بەندەیەك لە زەویەکی بکێشێ، ئەوا پێویستی و ئاتاجیەکی دەخاتە ئەو زەویە)).

---

[١] رواه البخاري في كتاب الاستسقاء وفي كتاب التفسير.

# بەندی دووەم

# ئاوزینگ (سەرەمەرگ)

## جێباسی یەکەم

## ئامادەبونی فریشتان لەکاتی ئاوزینگان

ئەگەر ئاکام (ئەجەل) نێزیک بۆوە، ژینی مرۆڤ هاتە لێواری ئاوابونێ، خودا نێرد راوانی مردنێ دەنێرێ، بۆ کێشانی ئەو گیانەی جەستە بەرێوە دەبا و دەیجولێنێ: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ: هەر ئەو زاڵە بەسەر بەندەکانیدا و چاوەدێرانتان لەسەر دادەنێ، تا ئەو کاتەی مردنی یەکێك لە ئێوە دەکات. ناردراوانی ئێمە گیانی دەستێنن. ئەوانەش کەموکوڕی و کۆتایی ناکەن.﴾[٣١] جا فریشتەکانی مردن، بە وێنەی جوان و شیرین دینە لای بڕوادار و، بە وێنەی ترسناکیش دێنە لای دەغەڵ و بێباوەڕان. هەروەك لە فەرمودەی بەڕائی کوڕی عازیب هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: إن العبد المؤمن إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة، نزل اليه ملائكة من السماء؛ بيض الوجوه كأن وجوههم الشمس، معهم كفن من أكفان الجنة وحنوط من حنوط الجنة، حتى يجلسوا منه مدّ بصره، ثم يجيء ملك الموت ﷺ جتى يجلس عن راسه فيقول: أيتها النفس الطيبة (وفي رواية: المطمئنة) أخرجي الى مغفرة من الله ورضوان، قال: فتخرج كما تسيل القطرة من في السقاء، فيأخذها...

وإن العبد الكافر (وفي رواية: الفاجر) إذا كان في أنقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة، نزل اليه من السماء ملائكة [غلاظ شداد] سود الوجوه، معهخ المسوح [من النار] فيجلسون منه مد

---

[٣١] سورة الأنعام: ٦١.

بشر. ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه، فيقول: أيتها النفس الخبيثة اخرجي إلى سخط من الله وغضب. قال: فتفرق في جسده فينتزعها كما ينتزع السفود (كثير الشعب) من الصوف المبلول [فتقطع معها العروق والعصب]: **ئەگەر بەندەی بڕوادار لە دونیا دابڕا بو و بەرەو دوایین دەچو، فریشتە لە ئاسمانەوە دادەبەزنە لای، ڕویان سپیە هەروەکو ڕۆژ وایە، کفنێکیان لە کفنەکانی بەهەشت پێیە، تێکەڵە بۆنێکیشیان لە بۆن و گوڵاوی بەهەشت پێیە، تا چاوی بڕ دەکا لە دەوری دادەنیشن، ئەوجا فریشتەی مەرگەوانﷺ دێ، تا لەلای سەری دادەنیشێ و دەڵێ: هۆ نەفسی پاك و ئارخەیان، وەرە دەرێ بۆ لێخۆشبون و ڕەزامەندی خودا. فەرموی: جا گیان دەردەچێ و دەتکێ، وەکو چۆن دڵۆپ لە دەمی کوندە دەتکێ، ئەو جا دەیبا....**

**بەندەی بێبڕواش، ئەگەر لە دونیا دادەبڕا و بەرەو دوایین دەچو، لە ئاسمانەوە فریشتەی توندوتیژ و بەهێز، بەڕەنگ و ڕوی ڕەشەوە دادەبەزنە سەری، پۆشاکی دڕی ئاگرینیان پێیە و، تا چاو بڕکا لای دادەنیشن، ئەوجا فریشتەی مەرگەوان دێ، تا لەلای سەری دادەنیشێ، جا دەڵێ: هۆ نەفسی پیس، وەرە دەرێ بۆ ڕق و توڕەیی خودا. دەفەرمێ: گیانەکە لەناو جەستەکەی بەش بەش دەبێت، جا دەری دەهێنێ بە شێوەی شیشەیەکی دڕکن کە لە خوریەکی تەڕ هەڵدەکێشرێ و دەیڕنێتەوە، ئاوا هەمو ڕەگ و دەمارانی لەگەڵ دەپچڕێ))**.[1]

**ئەوەی بەسەر مردوشدا دێت لەکاتی ئاوزینگاندا، ئێمە نایبینین و هەستی پێ ناکەین، بەڵام شوێنەواری بەدی دەکەین. خودای پاك و بەرزیشمان دەربارەی حاڵی ئەو کەسی لەگیانەڵاو ئاوزینگان دایە دەفەرموێ:** ﴿فَلَوْلاَ إِذَا بَلَغَتْ الْحُلْقُومَ، وَأَنْتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ، وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِنْ لاَ تُبْصِرُونَ: **بۆچی لەکاتێکدا کە گیان**

---

[1] شێخ ئەلبانی هەمو گێڕانەوەکانی ئەم فەرمودەیەی کۆکردۆتەوەو ئینجا دایڕشتۆتەوەو هەمو ئەو زیادەو سودانەی لەهەمو ڕێگا ڕاستەکانیەوە هاتوە بۆی زیاد کردوە لە پەڕتوکە بەنرخەکەی (احکام الجنائز)، و ئەمەی داوەتە پاڵ ابی داود (٢٨١/٢) و حاکم (٢٧/١-٤٠) و طیالیسی (ژمارە ٧٥٣) و احمد (٢٨٧/٤، ٢٨٨، ٢٩٥، ٢٩٦) و سیاقەکەی هی ئەوە، و الآجري لە الشريعة (٣٦٧-٣٧٠)، حاکم گوتویەتی: صحيح على شرط الشيخين، و أقره الذهبي و هو كما قالا، و صححه ابن القيم في اعلام الموقعين (٢١٤/١) و تهذيب السنن (٣٣٧/٤) و نقل فيه تصحيحه عن ابي نعيم و غيره.

دەگاتە گەرو و ئێوە لەو دەمەدا تەماشا دەکەن. وە ئێمە لەئێوە نێزیکترین لە مردوەکە، بەڵام ئێوە نامانبینن.﴾[1]. جا ئەوەی لەم ئایەتەدا باسی کراوە گیانە. کاتێ دەگاتە قورقوڕاگە لە دەمی ئاوزینگاندا، ئەوانی دەوربەریشی تەماشای دەکەن، دوچاری چی بۆتەوە لەژان و ژوارەکانی مردنێ. هەرچەندە فریشتەکانی خودا نابینن کە بۆ کێشانی گیانی هاتون ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْكُمْ وَلَكِنْ لاَ تُبْصِرُونَ﴾، هەروەها خودای گەورە دەفەرمێ: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ: هەر ئەو بەسەر بەندەکانیدا زاڵە و چاوەدێرانتان لەسەر دادەنێ، تا کاتێك مەرگی یەکێکتان دەگا، ناردراوانی ئێمە گیانی دەستێنن و، ئەوانەش کەموکوڕی و کۆتایی ناکەن.﴾[2]. هەروەها لە ئایەتێکی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿كَلاَّ إِذَا بَلَغَتْ التَّرَاقِي، وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ، وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ، وَالْتَفَّتْ السَّاقُ بِالسَّاقِ، إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ: نا، کاتێك گیان گەیشتە قورقوڕاگە و گوترا: کێیە چارەساز؟ وە زانی ئەوەی توشی بوە مردن و جیابونەوەیە، وە قاچ لە قاچ ئالا، لەو ڕۆژەدا ڕاپێچکردن بۆ لای پەروەردگارتە﴾.[3]

لە فەرمودەشدا بەڕاشکاوی هاتوە، کە فریشتەی مەرگەوان موژدەی لێخۆشبون و ڕازیبونی خودا بەبڕوادار دەدات.

هەروەك موژدەی ڕق و توڕەبونی خودا دەداتە بێبڕوا گوناهکاران. گەلێك دەقی کتێبی خوداش لەم بابەتە ئاخاوتون، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ، نُزُلاً مِنْ غَفُورٍ رَحِيمٍ: بەڕاستی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خودایە و پاشان خۆڕاگر بون، فریشتە دادەبەزنە سەریان و پێیان دەڵێن: مەترسێن و خەم مەخۆن و، مزگێنی بێ لێتان بەو بەهەشتەی بەڵێنتان

[1] سورة الواقعة: ٨٣-٨٥.
[2] سورة الأنعام: ٦١.
[3] سورة القيامة: ٢٦-٣٠

پێدرابو، ئێمە لە دونیا و دواییندا یارو پشتیوانی ئێوەین، هەرچی دڵ و ئارەزوتان بیەوێ لە بەهەشتدا بۆ ئێوە هەیە، لەگەڵ هەرشتێکی بیخوازن، لەلای خودای میهرەبانەوە ئامادە کراون﴾.[1]

کۆمەڵێك لە پێشەوایانی ڕاڤەی قورئان وەکو موجاهید و ئەلسەدی، ڕایان وایە؛ مەبەست لەوەی کە فریشتە دادەبەزنە سەریان، کاتی سەرەمەرگ و ئاوزینگ دانە[2]، گومانیش لەوەدا نیە مرۆڤ لەکاتی ئاوزینگدانی لەبارێکی ناهەموار و زەحمەت دایە، لەو داهاتوە دەترسێ کە بەرەو ڕوی دێ و، ترسی ئەوانەشی هەیە کە لەپاش خۆی جێیان دێڵێ. جا فریشتە دێن و دڵارام و ئەرخەیانی دەکەن لەو شتانەی لێیان دەترسێ و خەمیان لێ دەخوا و، پێی دەڵێن: ترسی داهاتوی بەرزەخ و دوایینت نەبێ، خەفەتیش مەخۆ بۆ ئەو ماڵ و منداڵ و قەرزەی دوای خۆت جێت هێشتون، و مزگێنی هەرە مەزنی پێدەدەن، ﴿وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ: ئەوجا مزگێنیتان لێبێ بەو بەهەشتەی وادەتان پێدرابو﴾[3]، ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ: هەرچی دڵ و ئارەزوتان دەیەوێ و هەرچی دەیخوازن بۆ ئێوە لە بەهەشتدا هەیە﴾[4]. مادام بەندەش هەر تەنیا خودا بە پشتیوان بگرێ، خوداش هەردەم پشتیوانی دەکات، بەتایبەتی لە هەڵوەستە و کاتە تەنگ و ناخۆشەکاندا، کە ئەمەیان لە هەموی توند و ناخۆشترە، ﴿نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾[5].

هەرچی بێبڕوا و گوناهکارانیشن، بەبارێکی پێچەوانە فریشتانیان دادەبەزنە سەر، ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا: بە ڕاستی کەسانێکی کە بەهۆی بێبڕوایی ستەمیان لەخۆ کردبو، فریشتە گیانیان دەکێشان، پێیان گوتن: لەسەر ڕچەی چ کۆمەڵێك بون؟ گوتیان: ئێمە

---

[1] سورة الفصلت: ٣٠-٣٢.
[2] تفسير ابن كثير: (٦/١٧٤).
[3] سورة فصلت: ٣٠.
[4] سورة فصلت: ٣٢.
[5] سورة فصلت: ٣١.

بێچارەی سەر زەوی کوفرین، فریشتە پێیان گوتن: ئەدی زەوی خودا بەرفراوان و ئاوەڵا نەبو کۆچی تێدا بکەن؟! جا جێگای ئەوانە دۆزەخە و سەرنجامێکی بەدفەڕانەیان هەیە﴾[1]. جا هەروەکو بوخاری لە ئیبنی عەبباسەوە تەخریجی کردوە ئەم ئایەتە لە ئاست کەسانێك دابەزیوە کە موسڵمان بون بەڵام کۆچیان نەکردوە و مردنیان گەیشتۆتێ، یان لە ریزی دوژمناندا کوژراون[2]، جا فریشتەکان لەسەرەمەرگدا ئەوانە سەرکۆنە دەکەن و شەرمەزاریان دەکەن و موژدەی ئاگریان پێ دەدەن.

هەروەها پەروەردگارمان لەبارەی مراندنی بێبڕوایان لەلایەن فریشتانەوە لە جەنگی بەدردا، بۆمان باس دەکا و دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ، ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ: ئەگەر لەسەرەمەرگ و ئاوزینگاندا چاوت بە بێبڕوایان بکەوێ کە فریشتە دەیانمرێنن، لە دەم و چاو و پشتیان دەدەن و دەڵێن: ئازاری سوتێنەر بچێژن، ئەمە ئەوەیە کە دەستەکانتان پێشتر هەناردبویان، بەڕاستی خودا لە ئاست بەندەکانیدا هیچ ستەمکار نیە﴾[3]. ئیبنیکەثیریش لە ڕاڤەی ئەم ئایەتانەدا دەڵێ: (ئەی موحەممەد، ئەگەر لەکاتێ کە فریشتە گیانی بێبڕواکان دەکێشن، بتدیتبان بارێکی مەزن و کاریگەرت دەبینی، فریشتە لە دەم و چاو و پشتی کافران دەسرەوێنن و پێیان دەڵێن: سزای ئاگری سوتێنەر بچێژن).[4]

ئیبنیکەثیری ڕاڤەکار و زانای هەرە بلیمەت و لێهاتو، ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە هەرچەندە لە جەنگی بەدردا بێ، بەڵام بۆ هەمو بێبڕوایەك گشتگیرە، هەر بۆیەشە خودای بەرز بە ئەهلی بەدری تایبەت نەکردوە، بەڵکو فەرمویەتی:

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ﴾.[5]

ئەوەی ئیبنیکەثیریش گوتویەتی ڕاستە، گەلێك ئایەتیش لە کتێبی خوادا بەڵگەن

---

[1] سورة النساء: ٩٧

[2] تفسير ابن كثير: (٣٦٩/٢)

[3] سورة الانفال: ٥٠ – ٥١

[4] تفسير ابن كثير: (٣٣٥/٣)

[5] تفسير ابن كثير: (٣٣٥/٣)

**لەسەر راستیەکەی. وەك دەفەرموێ:** ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ أُوْلَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُمْ مِنْ الْكِتَابِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا وَشَهِدُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ: **جا کێ لەوە ستەمکارترە کە بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستێ یا نیشانەکانی خودا بە درۆ دەخاتەوە. ئەوانە بەشی خۆیان دەبەن لەوەی بۆیان خەملێنراوە. تا ئەوێ رۆژێ کە ناردراوانی ئێمە دەچنە لایان و گیانیان دەکێشن، لێیان دەپرسن: لە کوێن ئەو پەرستراوانەی بێجگە لە خوا هاوارتان لێ دەکردن، دەڵێن: لێمان بزر بون و، بە دژی خۆیان گەواهی دەدەن کە کافر بون.﴾**[1].

**هەروەها دەفەرموێ:** ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمْ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ فَأَلْقَوْا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِنْ سُوءٍ بَلَى إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ: **کەسانێك کە فریشتەکانی مردنێ گیانیان دەکێشن، لە بارێکدا کە بەخۆیان ستەم و زۆریان لە خۆ دەکرد. لەو دەمەدا خۆ دەدەن بە دەستەوە دەڵێن: ئێمە کاری خراپمان نەدەکرد. بەڵێ، بەڕاستی خودا بەوەی کە ئەنجامتان دەدا زانا و ئاگادارە﴾**[2].

**دیسان دەفەرموێ:** ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ، ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ، فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمْ الْمَلاَئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ: **بەڕاستی ئەوانەی کە دوای رون بونەوەی هەق و رێنوێنی پاشگەز بونەوە سەر لاڕێیی خۆیان، شەیتان کردەوەکانیان لەبەر شیرین کردون و ئەوانی بە ئاوات و ئارەزوی درێژ هێشتۆتەوە. لەبەر ئەوەی دەیانگۆتە ئەوان کەسانی ڕقیان دەبۆوە لەوەی خوا دایبەزاندوە، ئێمە لە هەندێ کارەکاندا گوێڕایەڵی ئێوەین، خودا لە رازی ئەوانە ئاگادارە، جا چلۆن دەبن ئەو کاتی فریشتەکان بیانمرێنن و لەسەر و چاو ویشتیان بسرەوێنن.﴾**[3].

[1] سورة الاعراف: ٣٧

[2] سورة النحل: ٢٨.

[3] سورة محمد: ٢٥ — ٢٧

## جێباسی دووەم

# ژوار و بێهوشی مردن

**مردن بێهوشی و ژواری هەن کە هەمو مرۆڤێك لەکاتی ئاوزینگاندا توشی دێ. هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ:**

﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ: **ژوار و بێهوشی مردن بەهەق دێ، ئەمەیە ئەوەی لەبەری هەڵدەهاتن.**﴾[1].

**بێهوشی مردنیش بریتیە لە سەختی ئازار و ناخۆشیەکانی. راغیبی ئەصفەهانی لە (مفردات)دا دەڵێ: (بێهوشی حاڵەتێکە هۆشی مرۆڤ لادەبا، زیاتریش بۆ شەڕابی بێهوشکەر بەکاردێ، هەروەك بە تورەیی و عیشق و ژان و بۆرژان و ئەو لەهۆشخۆچونەش دەگوترێ کە بەهۆی ژان و ژوارەوەیە. لێرەشدا ئەمەیان مەبەستە)**[2].

**پێغەمبەریش ﷺ دوچاری ئەو ژان و ژوارانە بووە، کە پێغەمبەر ﷺ نەخۆشی سەرەمەرگی بو جامە ئاوێکی لەبەر دەستان بو، دەستی لە ئاوەکە هەڵدێناو بەڕوی خۆیدا دەهێنا و دەیفەرمو: ((لا اله الاّ الله، ان للموت سكرات: لا اله الا الله، بە ڕاستی مردن ژان و ژواری زۆرن))**[3].

**عائیشە** (رەزای‌خوای لێبێ) **لەبارەی نەخۆشی پێغەمبەرﷺەوە دەڵێ: (کەسم نەدیت ژان و ژواری هێندەی پێغەمبەر ﷺ توند بێت)**[4].

---

[1] سورة ق: ١٩

[2] فتح الباري: (٣٦٢/١١).

[3] هذا الحديث اخرجه البخاري عن عائشة في كتاب الرقاق، باب سكرات الموت، فتح الباري: (٣٤١/١١).

[4] اخرجه البخاري ومسلم و الترمذي، انظر جامع الاصول: (٦٩/١١).

(کە ئەبوبەکر ﷺ نەخۆشی مردنی بو، عائیشەی کچی (رەزای‌خوای لێبێ) چوە لای، کە باری شڵەژاو تێکچو، عائیشە ئەم دێڕە شیعرەی هێناوە:

لعمرك مايغني الثراء عن الفتى اذا حشرجت يوماً وضاق بها الصدر

واتە: بەڕاستی هەبون و دەوڵەمەندی هیچ سودێکی بۆ خاوەنی نیە لەو ڕۆژەی گیان دەگاتە قوڕقوڕاگە و سینەی پێ تەنگ دەبێ.

جا ئەبوبەکر ﷺ سەری خۆی هەڵداوە، گوتی: (وامەڵێ، بەڵکو بڵێ: ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾).[1]

گومانیش لەوەدا نیە بێبڕوا و تاوانکاران لە بڕواداران زێتر تاوی ژان و ژواری مردنێ دەچێژن. بەشێکمان لە فەرمودەکەی بەڕائی کوڕی عازیب هێناوە کە تێیدا هاتبو: گیانی گوناهکار و بێبڕوا لە جەستەی بەش بەش دەبێت ئەو کاتەی فریشتەی مەرگەوان پێی دەڵێ: هۆ نەفسی پیس وەرە دەرێ بۆ ڕق و توڕەیی لە خواوە، جا وا ئەو گیانەی هەڵدەکێشێ، چۆن شیشێکی دڕکن لە خوریەکی تەڕ هەڵدەکێشێ، بەمشێوەیە دەمار و ڕەگەکانی دەگەڵ دەپچڕێنێ. قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو بارە سەختەی کردوە کە بێبڕوایان دەیچێژن و دوچاری دەبن:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَنْ قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَوْ تَرَى إِذْ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُوا أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمْ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾: کێ ستەمکارترە لەو کەسی کە بە خواوە درۆ هەڵدەبەستێ، یا بڵێ: نیگام بۆ هاتوە و، هیچ سروشێکیشی بۆ نەهاتبێ، وە کەسێك بڵێ: خودا چی دابەزاند منیش دایدەبەزێنم. وە خۆزگە دەتبینی کاتێك ئەم ستەمکارانە لە پەلەقاژەی مەرگ و ئاوزینگان دان، چۆن گرفتار بون و

[1] رواه ابن ابي الدنيا، وقد قال ابن كثير في تفسيره(٦/٤٠١) بعد سياقه له: لهذا الاثر طرق كثيرة.

**فریشتەکانیش دەستیان بۆ درێژ دەکەن و پێیان دەڵێن: دەخۆتان لە گیانکێشان رزگار بکەن. ئەمڕۆ بەدەردو ئازاری شەرمەزاری سزا دەدرێن، لەبەر ئەو قسانەی بەناهەق دەربارەی خودا دەتانگوت و لە ڕاست ئایەت و نیشانەکانی خودا خۆتان بەزل دادەنا﴾** [1].

**ئیبنی کەثیر دەڵێ: ئەوەی لە ئایەتەکەدا هاتوە، ئەو کاتی رودەدا کە فریشتەکانی ئەشکەنجەدان موژدەی ئازار و ئەشکەنجەو کۆت و زنجیر و ئاگری سەخت و ئاوی کوڵیو و تورەبونی خودای میهرەبان بەکافران دەدەن. جا گیان لەجەستەیدا پەرت دەبێ و نایەوێ بێتە دەرێ، ئەوجا فریشتەکان لێیان دەدەن تا گیانیان لە جەستە دەردێنن و، پێیان دەڵێن:**

﴿أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمْ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّـــهِ غَـيْرَ الْحَقِّ: **دەخۆتان لەگیانکێشان رزگار بکەن. ئەمڕۆ بەدەردو ئازاری شەرمەزاری سزا دەدرێن. لەبەر ئەو قسانەی بەناهەق دەربارەی خودا دەتانگوت.﴾**.

**ئیبنی کەثیریش لەبابەت مانای دەست درێژکردنی فریشتاندا، کە دەفەرموێ:** ﴿وَالْمَلاَئِكَةُ بَاسِطُوا أَيْدِيـــهِمْ﴾ **دەڵێ: مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە فریشتەکان لێیان دەدەن و، مانای ئایەتەکە وەکو مانای ئەو ئایەتانەیە کە دەفەرموێ:** ﴿لَئِنْ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي: **ئەگەر تۆ بۆ کوشتنی من دەست درێژ بکەی﴾** [2]. **هەروەها کە دەفەرموێ:** ﴿وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ: **دەست و زمانیان بۆ ئازار دانتان دەکەنەوە و درێژیان دەکەن.﴾** [3].

**جاری واش هەیە ژیران و ئاوەزمەندان لەکاتی ئاوزینگاندا باسی ئەوە دەکەن کە دوچاری چ سەختی و ژان و ژوارێکی مردن بونەتەوە. عەمری کوڕی عاص یەکێکە**

---

[1] سورة الانعام: ٩٣

[2] سورة المائدة: ٢٨.

[3] سورة الممتحنة: ٢.

لەوانەی لەم بابەتە دواوە؛ لەکاتی سەرەمەرگدا کوڕەکەی پێی گوت: هۆ باوە گیان! ئەتۆ دەتگوت: خۆزگە پیاوێکی ژیر و ئاوەزمەندم بدیتبا لەسەرەمەرگێ، تا باسی بۆ کردبام دوچاری چی دەبێ، دەتۆش ئەو پیاوەی، جا بۆم باس بکە، گوتی: هۆ کوڕەکەم، سوێند بەخوا وەکو تەرۆکم لە تەختی بێ وام، دەڵێی لە کونی دەرزی پشی هەڵدەمژم. وەك ئەوەیە کە لکە دڕکێك لە پێمەوەتا سەرم راکێشێ، ئەوجا ئەمەی دارشت و گوتی:

لیتني کنت قبل ما قد بدا لي في تلال الجبال ارعى الوعولا[1]

خۆزی پێش ئەوەی ئەو شتانەم بۆ دەرکەوتبا لە گردوڵکە و کێوان شوان و گاوانی کەلاّن بام.

## ئەوی ژان و ژواری مردنی لەسەر سوك دەکرێ

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوینێ کە ئەو شەهیدەی لە جەرگەی جەنگێدا دەپێکرێ، ژواری مردنی لەسەر سوك دەکرێ، ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((الشهيد لا يجد الم القتل الاّ كما يجـد احدكـم الم القرصـة: شەهید هەست بە ژانی کوشتنێ ناکا، مەگەر هێندی ئەوەی کە ئێوە هەست بە ژانی نقورچێك دەکەن)).[2]

---

[1] التذكرة للقرطبي: ص ١٩.

[2] رواه الترمذي والنسائي والدارمي، وقال الترمذي هذا حديث حسن غريب؛ مشكاة المصابيح: (٢/٣٥٨) ورقم الحديث: (٣٨٣٦) وقال محقق المشكاة: اسناده حسن.

## جێباسی سێیەم

# گەڕانەوە بە ئاوات خواستن لەکاتی سەرەمەرگدا

ئەگەر مردن بوە میوان، مرۆڤ ئاواتی گەڕانەوەی دنیایێ دەخوازێ. جا ئەگەر کافر بێ بەڵکو بڕوا دێنێ و، ئەگەر یاخی و گوناهکار بێ بەڵکو ژیوان دەبێتەوەو تەوبە دەکات،

﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمْ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ، لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلاَّ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ: تا کاتی مەرگی یەکێکیان دێ، هەنگی دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمگێڕەوە، بەڵکو ئەوەی نەمکردوە بەکاری چاکە تۆڵەی بکەمەوە، نەخێر، ئەمە هەر قسەیەکەو دەیلێت، بەرزەخێکیان لە پشت سەرەوە هەیە، تا ئەو رۆژەی زندو دەکرێنەوە﴾[1].

ئەو کاتی مردنیش دێ باوەڕهێنان قبوڵ نابێ و، کاتێك کە گیان دێتە قوڕقوڕاگە، گەڕانەوە و پەشیمانیش سودی نابێ؛

﴿إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيبٍ فَأُولَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا، وَلَيْسَتْ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ وَلاَ الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا: ژیوانی و تەوبە تەنها لەوان کەسان قبوڵە کە بە نەزانی خراپە بکەن و زو ژیوان ببنەوە، جا خودا تۆبەی ئەوانە قبوڵ دەکا و خودا زانا و دانایە، کەچی ژیوانبونەوە بۆ کەسانێك نیە کە کاری خراپ دەکەن و کاتێك یەکێکیان مردنی دەگاتێ دەڵێ: پەشیمانم و تۆبەم کرد، هەروەها تۆبە بۆ ئەو کەسانەش نیە کە

---

[1] سورة المؤمنون: ٩٩-١٠٠.

بەکافری دەمرن، سزایەکی پڕ ژانمان بۆ ئەو دو پێڕە ئامادە کردوە﴾.[1]

ئیبنی کەثیری حافیز زۆری فەرمودە هێناوەتەوە کە بەڵگەی ئەوەن خودا تەوبەی بەندە لەسەرەمەرگدا قبوڵ دەکا، هەتا نەگەیشتۆتە پلەی گەرگەرە؛ ((ان الله يقبل توبـــة العبد مالم يغرغر: خودا تەوبەی بەندە قبوڵ دەکات تا نەگەیشتۆتە گەرگەرە کردنێ))[2].

هەر کەسێکی پێش مردنیش بەشیمان بێتەوە، زو بەشیمان بۆتەوە، بەڵام دڵراستی و ڕاستگۆیی مەرجن بۆ ژیوانی. ڕەنگە لەنێو ناخۆشی و پەرژەنگی سەرەمەرگ و ئاوزینگانیش مرۆ نەیپەرژێتە سەر بەشیمان بونەوە و بۆی نەکرێ. بۆیە دەبێ مرۆڤ پێش هاتنی ئاکامی دیار بگەڕێتەوە و ژیوان بێتەوە:

قدم لنفســـك توبـــة مرجـــوة    قبل الممات وقبل حبس الألســـن

بادر بها غلـــق النفـــوس فانهـــا    ذخر وغنم للمنيــــب المحســـن

واتە: تۆبە و ژیوانیەکی تەمادار پێش خۆت بخە، بەر لە مردن و لەپێش زمان گیرانێ، نەفست بە تۆبەکردنێ داخە چونکە گەڕانەوە گەنج و دەسکەوتە بۆ ژیوانی چاکەکار.

---

[1] سورة النساء: ١٧ – ١٨.

[2] رواه الترمذي و ابن ماجة، تفسير ابن كثير: (٢٢٤/٣)

## جێباسی چوارەم

# شادبونی بڕوادار بەگەیشتنە پەروەردگاری

كە فریشتەكانی خوای میهرەبان، مزگێنی لەخوداوە بۆ بەندەی بڕوادار دێنن، ئاسودەیی و شادی لێ وەدەر دەكەوێ، هەرچی بێبڕوا و گوناهكاریشە دڵتەنگی و پەژارە و ماندویی لێ وەدەر دەكەوێ، پاشان بەندەی بڕوادار لەكاتی ئاوزینگدا تاسە و ئارەزوی گەیشتنە خوا دەكا. كەچی بەندەی بێبڕوا یان تاوانبار ڕقی لە گەیشتن بەخوای بەرز دەبێتەوە، ئەنەسی كوڕی مالیك لە عوبادەی كوڕی صامیت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرﷺەوە كە فەرموی:

((من احب لقاء الله احب الله لقاءه، ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه: ئەو كەسی حەز بەدیداری خوا بكا، خوا حەز لە دیداری دەكا، ئەوی ڕقی لە دیداری خوا ببێتەوە خوا ڕقی لە دیداری دەبێتەوە))، عائیشە یا یەكێك لە خێزانەكانی گوتی: ئێمە ركمان لە مردنە!، فەرموی: ((ليس كذلك، ولكن المؤمن إذا حضره الموت بشر برضوان الله وكرامته، فليس شيء أحب إليه مما أمامه، فأحب لقاء الله وأحب الله لقاءه. وإن الكافر إذا حضر بشر بعذاب الله وعقوبته، فليس شيء أكره إليه مما أمامه، فكره لقاء الله وكره الله لقاءه: ئەمە وانیە، بەڵكو بڕوادار كە دەگاتە سەرمردنێ موژدەی ڕەزامەندی و ڕێزی خودێی دەدرێتێ، هیچ شتێكی هێندی ئەو پێشهاتە لەلا خۆشەویست نیە، جا حەز بە دیداری خودا دەكا و خوداش حەز بە دیداری دەكا. بەڵام كە بێبڕوا دێتە سەرەمەرگ مزگێنی ئازار و سزای خودای دەدرێتێ، جا ڕقی لە هیچ شتێك نابێتەوە هێندی ئەو پێشهاتە، ڕقی لە دیداری خواش دەبێتەوە و، خوداش ڕقی لە دیداری دەبێتەوە))[1].

هەر بۆیەشە بەندەی چاكەكار هێندە بە تاسەی بەهرەی خودایە؛ هەڵپەیەتی و داوا

[1] رواه البخاري؛ كتاب الرقاق، باب من احب لقاء الله احب الله لقاءه، انظر فتح الباري (١١/٣٥٧).

**لە هەلگرانی دەکا خێرا بن و زو بیگەیەننە گۆڕ. کەچی بەندەی خراپەکار واوەیلایەتی لەو چارەنوسەی بەرەو ڕوی دەچێ. لە صەحیحی بوخاری و سونەنی نەسائیدا لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((اذا وضعت الجنازة فأحتملها الرجال على اعناقهم، فان كانت صالحة قالت: قدمـــوني، وان كانت غير صالحة قالت لأهلها يا ويلها اين يذهبون بها؟ يسمع صوتها كل شيء الاّ الإنسان، ولـــو سمع الإنسان لصعق: **ئەگەر تەرم ئامادە و سازکراو، پیاوان خستیانە سەرشان و هەڵیان گرت، ئەگەر چاکەکار بێ دەڵێ: زو بمبەن و پێشم خەن، ئەگەر خراپەکاریش بو، بە خانەوادەکەی دەڵێ هەشی بەسەر کێوەی دەبەن؟! بێجگە لە مرۆڤ هەمو شتێك گوێی لەو دەنگە دەبێ، ئەگەر مرۆڤ بیبیسێ لەهۆش خۆی دەچێ))**.[1]

---

[1] رواه البخاري؛ كتاب الجنائز، قول الميت وهو في الجنازة: قدموني، فتح الباري: (١٨٤/٣). ورواه النسائي في كتاب الجنائز، باب السرعة في الجنازة: (٤١/٤).

## جێباسی پێنجەم

# ئامادەبونی شەیتان لەکاتی مردن

کە مردن دێ شەیتان مکورە لەسەر ئەوەی مرۆڤی لە دەست دەرباز نەبێت، لە صەحیحی موسلیمدا لە جابری کوڕی عەبدوڵلا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن الشيطان يحضر أحدكم عند كل شيء من شأنه، حتى يحضره عند طعامه، فإذا سقطت من أحدكم اللقمة فليمط ما كان بها من أذى ثم ليأكلها ولا يدعها للشيطان، فإذا فرغ فليلعق أصابعه، فإنه لا يدري في أي طعامه تكون البركة: شەیتان لەهەمو کاروبارێکتان لەگەڵتان ئامادە دەبێ، تەنانەت لەکاتی خواردنیشتان ئامادە دەبێ، جا ئەگەر پارویەك لە دەست یەکێکتان بەربۆوە، با هەڵیگرێتەوە و ئەو پیسیەی پێیوە نوساوە لایباو پاشان بیخوا و بۆ شەیتان بەجێی نەهێڵێ، ئەگەر لە خواردنیش بۆوە، با پەنجەکانی بلێستەوە، چونکە ئەو نازانێ پیت و فەڕی خۆراکەکەی لە کامەدایە)).

جا زانا پایەدارەکانمان باسی ئەوەیان کردوە، لەکاتی ئاوزینگدا، لەو کاتە ترکزەیە(حرجة)دا شەیتان بە وێنەی باوك یان دایك یان کەسانێکی دیکەی ئازیز و خۆشەویست و ئامۆژگارەوە دێ، جا بۆ ئەوەی بانگ دەکا کە شوێن جولەکایەتی یان گاورێتی یا ڕێبیرەکانی دیکەی دژ بە ئیسلام بکەوێ. لێرەدا ئەوان کەسان لاڕێ دەبن کە ناشادی و بەدفەڕیان لە چارە نوسراوە،[1] ئەوەش مانای ئەو ئایەتەیە کە خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ: ئەی پەروەردگاری ئێمە، پاشی ئەوەی ڕێنوێنیت کردوین دڵمان لاڕی مەکە، لەلای

[1] سەیری (التذكرة)ی قورطوبی: ٣٣ بکە.

خۆتەوە میهرو بەزەییمان پێ ببەخشە، چونکە هەر تۆی زۆر بەخشندە﴾[1] .

عەبدوڵڵای کوڕی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگێڕتەوە و دەڵێ: لەکاتی مەرگی ئەحمەدی بابم ئامادە بوم، پەڕوکێکم پێبو تا ریشی پێ ببەستم، جار جارە ڕۆدەچو، پاشان وە ئاگا دەهاتەوە و، بەدەستی ئاماژەی دەکرد و دەیگوت: هێشتا نا، هێشتا نا، چەند جارێك وایکرد، منیش پێم گوت: باوەگیان چیت لێ دیارە؟ گوتی: شەیتان لەناو پێلاوم دایە و پەنجەکانی گەستوە، دەڵێ: هۆ ئەحمەد، ئەوە لەدەستم دەرچوی؟! منیش دەڵێم: هێشتا نا هێشتا نا، هەتا دەمرم[2].

هەروەها قورطوبی دەڵێ: لە ئەبولعەبباسی ئەحمەدی کوڕی عومەری قورطوبی پێشەوا و شێخی ئێمە، بیستم دەیگوت: چومە لای برای شێخمان ئەبو جەعفەر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی قورطوبی لە قورطوبە، لەکاتی ئاوزینگان بو، پێیان گوت: بڵێ لا اله الا الله، ئەویش دەیگوت: نا نا، کە هاتەوە هۆش خۆ، بۆمان باس کرد، گوتی: دو شەیتان دەهاتنە لای ڕاست و لای چەپم، یەکێکیان دەیگوت: بە جولەکاتی بمرە لەهەمو دینان چێترە، ئەوی تریان دەیگوت: بە گاورێتی بمرە لە هەمو دینان چێترە، منیش بەوانم دەگوت: نا نا....)[3]

بەڵام، هەروەك ئیبنی تەیمییە دەڵێ؛ مەرج نیە هەمو کەسێك توشی ئەوە بێ، بەڵکو خەڵکی وا هەن لەپێش مردنێ ئاینەکانیان بۆ دەخرێتە ڕو، هی واش هەیە بۆی ناخرێتە ڕو، ئەوەش بەسەر کۆمەڵێکی خەڵك داهاتوە، هەموشی لە ئاشوب و ئەزمونی ژین و مردنێیە، کە فەرمانمان پێکراوە لە نوێژێدا خۆمانی لێ پەنابگرین[4]. هەروەها ئیبنی تەیمییە باسی لەوە کردوە کە لەکاتی مردندا شەیتان لە هەمو کاتێك مکوڕترە بۆ فریودانی مرۆڤ، چونکە ئەو کاتە کاتی پێویستی‌یە. ئەو فەرمودەشی بە

---

[1] سورة آل عمران: ٨.

[2] (التذكرة)ي قورطوبي: ٣٤

[3] (التذكرة)ي قورطوبي: ٣٤

[4] مجموع الفتاوى: (٤\٢٥٥)

بەڵگە هێناوەتەوە کە دەفەرموێ: ((الاعمـــال بخواتيمـــــها: مەرجی کردەوان بەبنەتاکەیەتی)). هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((إن العبد ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع فيسبق عليـــه الكتـــاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها، وإن العبد ليعمل بعمل أهل النار حتى ما يكون بينـــه وبينـــها إلا ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها: بەندە هەر کردەوەی بەهەشتیان دەکا هەتا تەنها باڵیکی لەنێواندا دەمینێ لەگەڵ بەهەشتێ، جا نوسراوەکەی پێشی دەکەوێ و کردەوەی دۆزەخیان دەکا و لەئاگری دەکەوێ، بەندەش هەیە هەر کردەوەی دۆزەخیان ئەنجام دەدا هەتا تەنها باڵیکی دەمێنی بچێتە دۆزەخێ، نوسراوەکەی پێشی دەکەوێ، جا کردەوەی بەهەشتیان دەکا و، دەچێتە بەهەشتێ)).

بۆیەش دەگێڕنەوە: ((ان الشيطان اشد ما يكون على ابن آدم حين الموت، يقول لأعوانـــه: دونكم هذا فإنه ان فاتكم لن تظفروا به ابداً: لە کاتی مردندا شەتیان لەهەمو کاتێك لەسەر مرۆڤ توند ترە، بە دەست و پێوەندەکەی دەڵێ: بەمەوە خەریك بن، چونکە ئەگەر لە دەستان دەربچێ، هەرگیز زەفەری پێ نابەن)).[1]

[1] مجموع الفتاوى: (٤/٢٥٦).

## جێباسی شەشەم

# هۆیەکانی سەرەنجام خراپی

هێندێك لەوانەی بە ڕوکەش ئیسلامن و کاری پێدەکەن، پەنا بە خوا، سەرەنجامیان خراپ دەبێ، و ئەم سەرەنجامەش لە هەندێك کەس دەردەکەوێ کە دەگەنە ئاوزینگان، صیدیق حەسەن خان لەبابەت خراپی سەرەنجام دواوە و، دەڵێ: (هەندێك هۆ و ئەنگێزەی هەن دەبێ بڕوادار خۆی لێیان بپارێزێ)[1]، ئەوجا هۆیەکانی هێناوەتەوە و دەڵێ:

١- گەندی لە بیروباوەڕ، هەرچەندە ئەوپەڕی پارسایی(زوهد) و چاکەکاری دەگەڵ بێ، جا ئەگەر گەندی لە باوەڕمەندیدا هەبێت و ئاوەری(یقین) پێ بێ و واگومان نەبا هەڵەی کردوە، ڕەنگە لەکاتی ژوارەکانی مردنێ بۆی ڕون بێتەوە ئەو بیروباوەڕە ڕاستانەی باوەڕی پێ هەبوە ناتەواو و بەتاڵن. ئەو جۆرە بیروباوەڕە بەتاڵەو هیچ بنەمایەکی نیە ئەگەر جیاوازی نەکات لە نێوان بیروباوەڕێك و بیروباوەڕێکیتر. جا دەرکەوتنی پوچێتی هێندێك لە بیروباوەڕەکانی دەبێتە هۆی نەمانی بیروباوەڕەکانی تریشی، جا ئەگەر لەو ساتەدا گیانی دەرچو، بەر لەوەی پێ ڕابگا بگەڕێتەوە سەر بنەڕەتی بڕوا، سەرەنجامەکەی خراپ دەبێ و بە بێبڕوایی لە دونیا دەدەرچێ و، دەبتە یەکێك لەوانی خودای بەرز دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿وَبَدَا لَهُمْ مِنْ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ: لەلایەن خوداوە شتانێکیان بۆ دەردەکەوێ کە بیریان لێ نەکردوبۆوە﴾[2].

---

[1] يقظة اولي الاعتبار: ٢١١

[2] سورة الزمر: ٤٧.

له ئایەتێکی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا: ئایا له زیانکارترینی خەڵکی ئاگادارتان بکەین، کەکێن؟ کەسانێکن کە کۆششیان لە دونیادا لەناوچوە و، پێشیان وایە کاری چاك دەکەن﴾[1].

هەر کەسێك بڕوای بە شتێکی جودا هەبێ لەوەی لەسەریەتی، جا چ بەپێی ڕاوبۆچونی خۆی ئەو بڕوایەی لا دروست بوبێ، چ لەیەکێکی وەرگرتبێ کە ئەمە حاڵی بێ؛ ئەو کەسە لەو ترکزە(خطر)یە دەکەوێت و، گۆشەگیری و پارسایی و چاکەکاری دادی نادا و سودی بۆ نین. بەڵکو ئەوەی بە کەڵکی بێ تەنها باوەڕی ڕاست و دروستە بە کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکەی، چونکە باوەڕە ئایینیەکان بەتاڵن، جگە لەوانەی لەو دو سەرچاوە هەڵدەقوڵێن.

٢- **مکوڕی لەسەر گوناهان**: مکوڕی و لەسەرڕۆیشتن و بەردوام بون لە گوناهان، دەبتە مایەی ڕاهاتن و هۆگر بونی دڵان بەو گوناهانە. هەر شتێکیش مرۆڤ بە درێژایی تەمەنی هۆگری بوبێ لەکاتی مردنی دەگەڕێتەوە یادی، جا ئەگەر زێتر ڕوی دابێتە تاعەتان، لەکاتی مردنێ زیاتر یادی تاعەتان دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر زێتر بەلای گوناهانەوە بو، ئەوا لەسەرەمەرگێدا پتر یادی گوناهان دەکاتەوە. جا ڕەنگە لە کاتی مردنێ و پێش تەوبەو ژیوان بونەوە ئارەزوی گوناهێك بەسەریدا زاڵ بێت و دڵی پێوە پەیوەست بێ و ببێتە پەردەیەك لەنێوان بەندە و پەروەردگاری و ببتە هۆکاری ناشادی لەدوادوایی ژیانیدا. چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((المعاصي بريد الكفر: گوناهەکان پۆستەی بێبڕواین)).

جا ئەوی هەر لەبنەڕەتەوە گوناهی نەکردوە، یا کردونی و ژیوان بۆتەوە، ئەو کەسە لەو ترکزە(مەترسی)یە دورە. بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە تاوان و گوناهی زۆری کردون، بەشێوەیەك کە لە تاعەتەکانی زۆرتر بن و، لێشیان ژیوان نەبوبێتەوە،

---

[1] سورة الكهف: ١٠٣-١٠٤.

بەڵکو لەسەریان بەردەوام ومکوڕ بوبێت، ئەو ترکزەیە لە ئاست ئەو کەسی گەلێك مەزنە، چونکە ڕەنگە بەهۆی هۆگربون و خو پێوەگرتنی، وێنەی لە دڵیدا جێگیر بێ و، دڵی بەلای ئەو گوناهەدا لاربیبێتەوە و لەوکاتە گیانی بکێشرێ و، ببێ بەهۆی بەدی و خراپی سەرەنجامی.

ئەمەش بە نمونەیەك چاکتر ڕون دەبێتەوە؛ گومان لەوەدا نیە مرۆڤ زۆر جاران لە خەونێدا ئەو شتانە دەبینێ کە لە تەمەنی خۆی هۆگریان بوە، تا وای لێ دێ ئەوی تەمەنی خۆی لە زانستدا بەسەر بردوە، باری پەیوەست بە زانست و زانایانەوە دەبینێ، ئەو کەسەشی تەمەنی خۆشی بە دورمان بەسەر بردوە، باری تایبەت بە دورین و بەرگدروانی دێتە خەونێ، هیچ شتێکیش لە خەونێ نابینرێ بێجگە لەوانەی لەگەڵ دڵدا ساز و گونجاون و ماوەیەکی درێژ هۆگریان بوە، جا ئەگەرچی مردن لەسەرو نوستنەوەیە، بەڵام ئەو ژوار و بێهوشیانەی لەسەرەمەرگدان، لە نوستن نزیکن، بۆیە خوگرتنی درێژ بەگوناهان، دەبێتە مایەی وەیاد هاتنەوەیان لەکاتی مردندا، لەگەڵ ئارەزو و بۆچون و وەرچەرخانی دڵ بۆ ئاڕاستەکەی. خۆ ئەگەر لەو ساتەدا گیانی کێشرا ئاخیرشەڕ و سەرەنجامی خراپ دەبێ.

ذەهەبی لە (الکبائر)دا دەڵێ: (موجاهید گوتی: هەر کەسێك بمرێ هاو کۆڕو مەجلیسەکانی دەهێنرێنە بەرچاوی، جا پیاوێکی شەترەنجزان لە ئاوزینگی دابو، پێیان گوت: بڵێ: لا الە الا اللە، ئەو گوتی: کش مەلیك. ئەوجا مرد، ئەوەی بەسەر زاری داهات کە لەماوەی ژیانی و لەمیانەی یاریکردنی خوی پێوە گرتبو و لێی ڕاهاتبو، بۆیە لە باتی شادە هێنان گوتی: کش مەلیك.

ئەوەش وەکو ئەو کەسەیە کە هاوکۆڕی مەیخۆرەوان بو، کاتێك گەیشتە مردنی، مرۆڤێك هاتە لای شادەی پێ دەگوت، بەڵام ئەو پێی گوت: بخۆوە و بیدە منیش. ئەوجا مرد. توانا و هێز هەر لە خودای بەرز و مەزنە)[1].

---

[1] الکبائر للذهبي: ص٩١

٣- **لادان لە ڕاستالی:**[1] ئەو كەسەی لەسەرەتادا ڕاستاڵ(مستقیم) بێ و پاشان حاڵی بگۆڕێ و لەباری پێشوی بشۆرێ، ئەمە دەبێتە هۆی سەرەنجامی خراپ. هەروەك چۆن ئیبلیس لەسەرەتادا سەرۆكی فریشتان و مامۆستایان بو، زێتر لە هەموان دەكۆشا بۆ پەرستش كردن، بەڵام پاشان كە فەرمانی پێكرا سوژدە بۆ ئادەم ببا، خۆی بەزل زانی و بەرفەرمان نەبو و چوە ریزی بێبڕوایان. هەروەها وەكو بەلعامی كوڕی باعور كە خودا نیشانەكانی خۆی پیشاندا، بەڵام ئەو ڕوی لە دونیا كرد و خۆی لێ داماڵین و، شوێن ئارەزوی خۆی كەوت و گومڕا بو. هەروەها وەكو بەرصیصای خواپەرست كە شەیتان پێی گوت كوفر بكە، كە كوفری كرد، شەیتان گوتی: من لە تۆ بێبەریم و من لە خودای پەروەردگاری جیهانیان دەترسێم، شەیتان بۆ كوفر فریوی دا، بەڵام كە خۆی كافر كرد، شەیتان خۆی لێ نەكردە خاوەن، نەوەك ببێتە شەریكی ئازارەكانی، بەڵام ئەوەش دادی نەدا، هەروەك خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ: سەرەنجامی كاریان ئەوەبو كە هەردوكیان لە ئاگردان و بە نەمری و هەمیشەیی لەناویدا دەمێننەوە، ئەوەیە سزای ستەمكاران.﴾[2]

٤- **بڕوا لاوازی:** ئەگەر لاوازیەك لە بڕوایدا هەبو، خۆشویستنی خودای بەرزی لە لا لاواز دەكا و، خۆشەویستی دنیای لە دڵیدا زێدە دەكات و بەسەریدا زاڵ دەبێ، بەجۆرێك هیچ شوێنێك بۆ خۆشەویستی خوای بەرز نایەڵێ، تەنیا لە ئاخاوتنی دەروندا نەبێ. بەشێوەیەك هیچ كاریگەری نابێ لەسەر ناكۆكی لەگەڵ نەفس و شونی دیار نابێ لە وازهێنان لەگوناهان و، لە هاندان بۆ تاعەت كردن، جا مل دەنێتە بەر ئارەزوبازی و خراپەكاری، بەم شێوەیە تاریكاییەكانی گوناهان لەسەر دڵدا كەڵەكە دەبێت، هەتا ئەو هێندە روناكی ئیمانەش دەكوژێنێتەوە كە بەلاوازی تێیدا ماوەتەوە. جا ئەگەر ژوارەكانی مردنی هاتن و هەستی كرد دونیا جێ دێڵێ، زیاتر خۆشەویستی خودای لە دڵدا لاواز دەبێ، چونكە ئەو دونیای خۆشدەوێ و ئەو

---

[1] یقظة اولي الاعتبار: ص٢١٢

[2] سورة الحشر: ١٧

خۆشەویستیە بەسەریدا زاڵە و حەز ناکا جێی بێڵێ و، لە داخی جیابونەوەی جەرگی ژان دەکا. خودای بەرزیش لەوە ئاگادارە. ترسی ئەوەش هەیە لەباتی خۆشویستن لە ناخیدا خودا ببوغزێنی و، ئەو خۆشەویستیە لاوازە ببێتە ڕق و بوغز، خۆ ئەگەر لەو چرکەیەی ئەو خەیاڵانەی بۆ دێ گیانی دەربچێ، سەرەنجامی خراپ دەبێ و تاهەتایە لە ئەشکەنجە و ئازار و فەوتان دەبێ.

هۆکاری گەیشتن بەو سەرەنجامە بەدەش دونیاویستی و، خۆ هەڵواسین و شادبون بەو دونیایەیە، لەگەڵ لاوازی ئیمان کە مایەی لاوازی خۆشویستنی خودای بەرزە. ئەمەش ئەو دەردە ترسناکەیە کە زۆرینەی خەڵکی پێوە گرفتار بوە، چونکە هەر کەسێکی لەسەرەمەرگدا دڵی پێوەند بێ بەکاروبارێکی دونیاییێ، ئەو شتەی لە دڵدا ڕەنگ دەداتەوە و تێیدا ڕۆدەچێ، بەشێوەیەك جێگەی چیدی لەو دڵەیدا نامێنێ، جا ئەگەر لەو بارەدا گیانی دەرچێ ڕوی دڵی لە دونیایەو پەردە دەکەوێتە نێوان وی و پەروەردگاری.

دەگێڕنەوە کە سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك کە بە حاجیاتی چوە مەدینە، گوتی: کەسی تێدایە گەیشتبێتە کۆمەڵێك لە هاوەڵان؟ گوتیان: بەڵێ؛ ئەبو حازمی لێیە. ناردیە دوای، کە هات، گوتی: ئەی ئەبو حازم! هۆی چیە ڕقمان لە مردنە؟ گوتی: ئێوە دونیاتان بنیات ناوە و دوایتتان وێران کردوە، جا ڕقتان لەوەیە لە ئاوەدانیەوە بچنە وێرانە. گوتی: ڕاست دەکەی، پاشان گوتی: خۆزگە دەمزانی چیم لەلای خودای بەرز هەیە؟ گوتی: کردەوەکانت بە تەرازوی کتێبی خوا هەڵسەنگێنە، گوتی: جا ئەوە لە کوێ دەبینمەوە؟ گوتی: لەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ: بەڕاستی کارچاکان لە بەهرە و نازدان و، بەڕاستی گوناهکاران لە دۆزەخێ دان.﴾[1]. گوتی: ئەدی بەزەیی خوا لە کوێیە؟ گوتی: بەزەیی و میهری خوا لە چاکەکاران نێزیکە. گوتی: خۆزی بمزانیبا سبەینێ چۆن دەچینە بەر دەستی خوا؟ گوتی: هەرچی چاکەکارە وەکو کەسێکە لە خانەوادەکەی دور بێ و بگەڕێتەوە، خراپەکاریش وەکو کۆیلەیەکی هەڵاتوە بێتەوە بەردەم خاوەنەکەی. جا سلێمان هێندە

---

[1] سورة الانفطار: ١٣ — ١٤.

گریا تا دەنگی بەرز بۆوە، ئەوجا گوتی: ئامۆژگاری و راسپێریم بکە، گوتی: نەکەی خوای بەرز لەو شوێنانە بتبینێ کە نەهی لێ کردوی، یا لەو شوێنانە ونت کا کە فەرمانی پێکردوی).

هەروەها صیدیق حەسەن خان لە غەزالی ڕایگوازتوە لە کتێبی (الاحیاء) کە سەرەنجامی خراپ دو پلەیە: یەکێکیان لەوی دیکە مەزنترە؛ هەرچی پایە مەزن و گەورەکەیە ئەوەیە کە لە کاتی ژوارو بێهۆشییەکانی مردنێدا گومان یا بێباوەڕی بەسەر دڵدا زاڵ بێ، و گیانەکە لەسەر ئەم بارە بکێشرێ و پەردەیەکی تا هەتایی بخاتە نێوان وی و خودای بەرز و کاربەجێ، ئەوەش مایەی دوری هەمیشەیی و سزا و ئەشکەنجەی نەبڕاوەیە.

دوەمیش؛ لەویان نزمترە، ئەوەیە لە کاتی مردنێ کارێك لە کاروباری دونیایێ یان یەکێك لە ئارەزوەکانی بەسەر دڵدا زاڵ بێ، جا ئەوەی لە دڵدا بچەسپێ و تێیدا قوڵ ببێتەوە، تا دەگاتە حاڵەتێك جێگەی چیدیکەی تێیدا نەمێنێ. جا هەرچەند گیانکێشان ڕێك بێ لەگەل زاڵی خوشەویستی دونیا، هێندە خەتەرناکە، چونکە مرۆڤ لەسەر چی بژی لەسەر ئەوەش دەمرێ، لەو کاتەدا داخ و حەسرەت مەزن دەبێ. بەڵام ئەگەر بنەڕەتی باوەڕو خۆشەویستی خودای بەرز لە دڵدا بۆ ماوەیەکی درێژ رەگاژۆ بوبێ و رەگی داکوتابێ و بە کردار و کردەوەی چاك سەلما بن و جێگیر بوبن، ئەو حاڵەتە لە دڵدا دەسڕێتەوە کە لەسەرەمەرگدا توشی بێ. هەرچەندە بڕوای تۆزقاڵێك بەهێزتربێ هێندە زوتر لە ئاگر دەریدەهێنێ. ئەگەر کەمتریش بێ زیاتری دەهێڵێتەوە. ئەگەر هەر تەنها یەك تۆزقاڵیش بڕوا لە دڵدا هەبێ لە ئاگری دەردەهێنێ، ئەگەر پاش هەزاران ساڵیش بێ. هەر کەسێکیش بڕوامەندی بەخودای بەرز و سیفەت و کردارەکانی بەشێوەیەکی جودابێ لەوەی کە هەیە، جا چ بە چاولێکەری بێ، یا بە بۆچون و تێڕوانینی هۆش، ئەو کەسە لەمەترسیدایە، پارسایی(زهد) و چاکەکاریش بە تەنێ بەس نین تا لەو مەترسیەی دەرێنن، لە بیروباوەڕی راست و ڕەواش بترازێ چیدیکە دەربازی ناکا، ئەمەش بەپێی کتێبی خودا و سوننەتی بێگەرد.. گێلۆکەش لەو مەترسیە دورن.[١]

---

[١] يقظة اولي الاعتبار: ص٢١٦

## جێباسی هەفتەم

# سەرپشك كردنی پێغەمبەران لەكاتی مردندا

كە كاتی مردنی پێغەمبەران دێ، خودا ئەو پاداشتە مەزنەیان پێشان دەدات كە لای خۆی بۆی ئامادە كردون، ئەوجا سەرپشك دەكرێن لەنێوان مانەوە لە دونیا و گواستنەوە بۆ ئەو پایە بەرز و بەرێزە، گومانیش لەوەدا نیە كە هەمو پێغەمبەرێك بەهرەی بەردەوام و نەبڕاوە هەڵدەبژێرێ، ئەمە بەسەر پێغەمبەری ئێمەش ﷺ داهات؛ سەرپشك كراو هەڵی بژارد. لە صەحیحی بوخاریدا لە عائیشە (رەزای خوای لێبێ) هاتوە دەڵێ: كە پێغەمبەر ﷺ ساغ بو دەیفەرمو: ((انه لم يقبض نبي قط حتى يرى مقعده من الجنة ثم يخير: هیچ پێغەمبەرێك گیانی نەكێشراوە تا نشینگەی خۆی لە بەهەشت دەبینێ و ئەوجا سەرپشك دەكرێ)). دەڵێ: جا كە مەرگی گەیشتێ، سەری لەسەر رانی من بو، سەعاتێك لەخۆچو، پاشان وەئاگا هاتەوە، چاوی بڕیە ساپیتەكە و پاشان فەرموی ((اللهم الرفيق الاعلى: خودایا، هاوەڵی هەرە بەرز)). گوتم: كەواتە ئێمە هەڵنابژێرێ، و زانیم ئەمە ئەو فەرمودەیە كە جاران باسی دەكرد، دەڵێ: ئەمە دوا وشە بو پێغەمبەرﷺ كە فەرموی: ((اللهم في الرفيق الاعلى)).[1]

لە گێڕانەوەیەكی دیكەش داهاتوە[2]:((گوێم لەپێغەمبەرﷺ بو لەكاتی دوا نەخۆشی ژیانی، دەنگیشی گریەكی بەسەر هاتبو، فەرموی:﴿مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا:لەگەڵ ئەوانی كەخودا بەهرەو نیعمەتی پێداون لەپێغەمبەران و راستبێژان وشەهیدان وچاكان، و ئەوانە هاونشینانێكیچاكن.﴾[3]،عائیشەدەڵێ: ئەوڕۆژی زانیم سەرپشك كراوە.

---

[1] رواه البخاري في كتب الرقاق، باب من احب لقاء الله، فتح الباري: (١١/٣٥٧)، وقد أخرجه ايضا مسلم في صحيحه، ومالك في موطئه، والترمذي في سننه، وقد ساق روايات الحديث عن عائشة ابن الأثير في جامع الأصول: (١١/٦٧).

[2] ئەمە لەلای هەموان هەیە.

[3] سورة النساء: ٦٩

## بەندی سێیەم

# گەشتی گیان بەرەو ئاسمان

لەموسلیمدا: لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، دەڵێ: (ئەگەر گیانی بڕوادار دەرچو، دو فریشتە دەیگرنە خۆ، بەرزی دەکەنەوە) حەماد[1] دەڵێ: (جا باسی بۆنخۆشی گیانەکەی کرد، لەوانەش بۆنی مسك) دەڵێ: (ئاسماننشینان دەڵێن: گیانێکی باش لەلای زەویەوە دێ، درودی خودا پێشکەش بە تۆ و بەو جەستەی ئاوەدانت کردبۆوە، ئەوجا دەیبەنە لای پەروەردگاری خاوەن شکۆ، پاشان دەفەرموێ: بیبەن بەرەو دوایین ئاکام).

دەڵێ: (ئەگەر گیانی بێبڕوا دەرچو ـحەماد دەڵێ: جا باسی بۆن بۆگەنی و نەفرەتی ئەو گیانەی کرد– وە ئاسماننشینان دەڵێن: گیانێکی پیس لەلای زەویەوە دێ، دەڵێ: جا دەگوترێ: بیبەن بەرەو دوایین ئاکام).[2]

پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمودەی بەڕائدا، باسی ئەو ڕێزلێنانەی کردوە کە لە گیانی بەندەی کارچاك دەگیرێ. پاش ئەوەی لە جەستەی دەردەچێ، فریشتەکانی خودا درود پێشکەش بەو گیانە پاکە دەکەن و دەرگەکانی ئاسمانی بۆ ئاوەڵا دەکرێ و، دەخرێتە ناو کفن و بۆن گوڵاوی بەهەشتێ، ئەوجا بۆنێکی زۆر خۆشتر لە بۆنی مسکی لێوە دێ. پاشان فریشتەکان بۆ گەشتێکی بەرز و بالای پڕ ڕێز و شکۆی دەبەن، دەرگەکانی ئاسمانی بۆ دەکرێنەوە.. هەرچی گیانی پیسیشە لەکاتی مردندا فریشتەکانی ئاسمان نەفرەتی لێدەکەن و دەرگەکانی ئاسمانی لەڕو دادەخرێن و هەر تیپێك لە فریشتەکانی خودا داوا دەکەن لەلای ئەوانەوە هەڵنەکشێ، ئەوجا ئەو گیانە لە بۆن و برینگ و کفنی ئاگرین داوێژرێ و، بۆنی هێند گەنیو و پیسی لێ دێت

---

[1] یەکێك لە بگێڕەوەکانی فەرموذەی ئەبو هویرەرە لەلای موسلیم.

[2] صحیح مسلم، كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت، (٤/٢٢٠٢) حديث رقم: (٢٨٧٢).

فریشتە پاكەكانی خودا بێزار دەكا، پاشان بەرەو ئاسمان دەبردرێ و دەرگەكانی ئاسمانی بۆ ناكرێتەوە، جا لەو بەرزیەوە ڕۆحی هەڵدەدرێتەوە خواریێ.

لە فەرمودەی بەڕائی كوڕی عازیبدا، كە پێغەمبەر ﷺ تێیدا باس لە گەشتی مرۆڤ دەكا لە مردنێوە تا بەرزەخ؛ دەفەرموی:

((حتى اذا خرجت روحه صلى عليه كل ملك بين السماء والأرض، وكل ملك في السماء، وفتحت له ابواب السماء، ليس من اهل باب الاّ وهم يدعون الله أن يعرج من قبلهم، فاذا أخذها (يعني ملك الموت) لم يدعوها في يده طرفة عين، حتى يأخذوها فيجعلوها في ذلك الكفن، وفي ذلك الحنوط، [فذلك قوله تعالى ﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ﴾] ويخرج منها كأطيب نفخة مسك وجدت على وجه الأرض، قال: فيصعدون بها، فلا يمرون -يعني- بها على ملأ من الملائكة الاّ قالوا: ما هذا الروح الطيب؟ فيقولون: فلان ابن فلان -بأحسن اسمائه التي كان يسمونه بها في الدنيا-. حتى ينتهوا الى السماء الدنيا، فيستفتحون له، فيفتح لهم، فيشيعه من كل سماء مقربوها، الى السماء التي تليها، حتى ينتهي الى السماء السابعة، فيقول اللهﷻ: أكتبوا عبدي في عليين، ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ، كِتَابٌ مَرْقُومٌ، يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ﴾، فيكتب كتابه في عليين، ثم يقال: اعيدوه الى الأرض فاني منها خلقتهم، وفيها اعيدهم، ومنها اخرجهم تارة اخرى..:

كە گیان دەرچو، هەمو فریشتەیەك لەنێوان ئاسمان و زەویدا درودی پێشكەش دەكەن، هەروا هەمو فریشتەكانی ئاسمانیش، دەرگەكانی ئاسمانی بۆ دەكرێتەوە، هەر چینە فریشتەیەكی لای هەر دەرگەیەك لە خوا دەپاڕێنەوە لەلای ئەوانەوە هەڵكشێ، كە فریشتەی مەرگەوان ئەو گیانە دەستێنێ بەقەدەر چاوتروكانێكیش لەدەستیدا نایهێڵن، بەڵكو دەیبەن و دەیخەنە ناو كفن و گوڵاوی بەهەشتێ، (ئەمەش مەبەستی ئەو ئایەتەیە كە دەفەرموێ: ﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ: نادرداوانی ئێمە گیانی دەستێنن و كۆتایی و كەموكوڕی ناكەن.﴾[1]. جا وەكو خۆشترین بۆنی مسك لەسەر زەویدا لەلاشە دەردەچێ. دەڵێ: ئنجا بەرزی دەكەنەوە، بەلای هەر كۆمەڵە فریشتەیەكی دادەبەن، دەڵێن: ئەو روحە چاك و پاكە چیە؟ دەڵێن: فلانی كوڕی فلانە -بەچاكترین ناوێك كە لەسەر دونیا پێی ناوبرابێ ناوی دەبەن- تا دەگاتە

---

[1] سورة الأنعام: ٦١.

ئاسمانی دونیا، داوای دەرگە کردنەوەی بۆ دەکەن، بۆیان ئاوەڵا دەکرێ، جا لە هەر ئاسمانێکدا لەلایەن نزیک و پایەدارەکانەوە بەرێ دەکرێ تا ئاسمانەکەی دوای وی. هەتا دەیگەیەننە هەفتەمین ئاسمان، ئەوجا خودای بەرز دەفەرموێ: نوسراوی بەندەکەم لە پەڕاوی هەرەبەرز بنوسن؛ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ، كِتَابٌ مَرْقُومٌ، يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ﴾: تۆ چوزانی ئەو پەڕاوە بەرزە چییە؟! دەفتەرێکی ئەوەندە بەفەرە، نزیکانی بارەگا تەماشای دەکەن.﴾[1]. ئەوجا دەگوترێ: بیگەڕێننەوە بۆ زەوی، چونکە من لە زەوی بەدیم هێناون و بۆ ئەویشیان دەگێڕمەوە و، جارێکی دیکەش هەرلەوێوە زندویان دەکەمەوە.....)).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەبابەت گیانی پیسیش دواوە کە لە بەندەی بێبڕواو تاوانکار دەستێنرێ. جا دەربارەی قۆناغی دوای ئەستاندنی دەفەرموێ:

(([فيلعنه كل ملك بين السماء والأرض، وكل ملك في السماء، وتغلق ابواب السماء، ليس من اهل باب الا وهم يدعون الله الاّ تعرج روحه من قبلهم]، فيأخذها، فاذا أخذها، لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يجعلوها في تلك المسوح، ويخرج منها كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الأرض، فيصعدون بها، فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة الاّ قالوا: ما هذا الروح الخبيث؟ فيقولون: فلان ابن فلان، بأقبح اسمائه التي كان يسمى بها في الدنيا، حتى ينتهي به الى السماء الدنيا، فيستفتح له، فلا يفتح له، ثم قرأ رسول اللهﷺ ﴿لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾، فيقول اللهﷻ :اكتبوا كتابه في سجين، في الأرض السفلى [ثم يقول: اعيدوا عبدي الى الأرض، فاني وعدتهم اني منها خلقتهم وفيها اعيدهم ومنا اخرجهم تارة اخرى] فتطرح روحه من السماء طرحا [حتى تقع في جسده]، ثم قرأ ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنْ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾، فتعاد روحه الى جسده..: هەرچی فریشتەی نێوان ئاسمان و زەوی هەن نەفرەتی لێدەکەن، هەروا ئەوانی ئاسمانیش، دەرگەکانی ئاسمان دادەخرێن، دەرگەوانی هەمو دەرگەکان لەخوا دەپاڕێنەوە لەلای ئەوانەوە هەڵنەکشێ، جا

[1] سورة المطففين: ١٩ – ٢١

مەرگەوان دەیستێنێ، کە ئەستاندی، بۆ ماوەی چاوتروکانێکیش لە دەستی نایهێڵێن، و دەیخەنە ئەو کفنە درِ و ئاگرینانەوە، جا بۆنێکی پیسی وەك بۆگەنیترین کەلاکی سەر ڕوی زەوی لێوە دێ، پاشان بەرزی دەکەنەوە، بەلای هەر کۆمەڵێك لە فریشتان ڕەت دەبن، دەڵێن: ئەو گیانە پیسە چیە؟ دەڵێن: فلانی کوڕی فلانە، بە ناشیرینترین ناوی سەردونیای ناو دەبەن. تا دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، داوای دەرگا کردنەوەی بۆ دەکەن، بۆی ناکرێتەوە، ئەوجا پێغەمبەرﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ: دەرگەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە و ناچنە بەهەشتێ، تا حوشتر بە کونی دەرزی دورماندا ڕەت دەبێت.﴾[1]. جا خودای بەرز دەفەرموێ: نوسراوەکەی لە پەڕاوێکی پەستی ڕەشدا بنوسن، لە زەوی هەرەژێری. (پاشان دەفەرموێ: بەندەکەم بۆ زەوی بگێڕنەوە، چونکە من بەڵێنم پێداون، هەر لە زەوی بەدیم هێناون، بۆ ئەویشیان دەگێڕمەوە و، جارێکی دیکە هەر لەو زندویان دەکەمەوە، جا لە ئاسمانێ ڕا گیانی بە فڕێدان هەڵدەدرێتە خوارێ تا دەکەوێتەوە جەستەی)، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنْ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ: هەر کەسێکی هاوبەش بۆ خودا دابنێ وەکو ئەوەیە کە لە ئاسمان کەوتۆتە خوارەوە و باڵندە بیفڕێنی، یا گژەبا فڕێی بداتە شوێنێکی دور﴾[2]. جا گیان بۆ جەستەی دەگێڕدرێتەوە)).[3]

ئبینی ماجە لە ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((ان الميت تحضره الملائكة، فإذا كان الرجل صالحاً قال: اخرجي أيتها النفس الطيبة كانت في الجسد الطيب، اخرجي حميدة وأبشري بروح وريحان ورب غير غضبان، فلا يزال يقال لها ذلك حتى تخرج، ثم يعرج بها إلى السماء، فيستفتح لها، فيقال: من هذا؟ فيقول: فلان، فيقال: مرحبا بالنفس الطيبة كانت في الجسد الطيب، ادخلي حميدة وأبشري بروح وريحان ورب غير غضبان،

---

[1] سورة الأعراف: ٤٠.

[2] سورة الحج: ٣١.

[3] فەرمودەیەکی صەحیحە پێشتر تەخریج کراوە لەلاپەرە:٢٨.

فلا يزال يقال لها ذلك حتى ينتهي بها إلى السماء التي فيها الله تبارك وتعالى.. فإذا كان الرجل السوء، قال: اخرجي أيتها النفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث، اخرجي ذميمة وأبشري بحميم وغساق وآخر من شكله أزواج، فلا يزال يقال لها ذلك حتى تخرج، ثم يعرج بها إلى السماء فيستفتح لها، فيقال: من هذا؟ فيقال: فلان، فيقال: لا مرحبا بالنفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث، ارجعي ذميمة فإنها لا تفتح لك أبواب، فترسل من السماء ثم تصير إلى القبر...:

فریشته دێنه لای مردو؛ جا ئەگەر پیاوێکی کارچاك بێ، دەڵێ: وەرە دەرێ، هۆ ئەو گیانە پاك و چاكەی لە جەستەیەکی پاك و چاكدا بوی؛ بە ستایشکراوی وەرە دەرێ، موژدەی حەسانەوە و میهر و ڕۆزیت لێبێ، لەگەڵ پەروەردگارێکی تۆرەنەبوو، هەر ئەوەی پێدەگوترێ تاکو دێتە دەرێ. پاشان بەرەو ئاسمانی هەڵدەکێشن و بەرزی دەکەنەوە، داوای دەرگەکردنەوەی بۆ دەکرێ، دەڵێن: ئەوە کێیە؟ دەڵێ: فلان، دەڵێن: بەخێر بێ ئەو گیانە پاك و چاکەی لە جەستەیەکی پاك و چاكدا بوی، بەستایشکراوی وەرە ژور و، موژدەی حەسانەوە و میهر و ڕۆزیت لێبێ؛ دەگەڵ خودایەکی تورەنەبوو. جا هەر ئەوەی پێ دەگوترێ تا دەگاتە ئەو ئاسمانەی خودای پاك و بەرزی لێیە[1].. بەڵام ئەگەر پیاوێکی خراپ بێ دەڵێن: وەرە دەرێ هەی گیانی پیس، کە لە جەستەیەکی پیس دابوی. بەزەم کراوی وەرە درێ و، موژدەی ئاوی زۆر کوڵیو و گەرم و کێم و خوزاوی جەستەی دۆزەخیانت لێبێ، لەگەڵ هی دیکەی هاوشێوەی جوت جوت. هەر ئەوەی پێدەگوترێ هەتا دێتە دەرێ، پاشان بۆ ئاسمان

---

[1] مەبەست لێرەدا ئەوە نیە کە ئاسمان خودای لەخۆوە گرتوە و دەوری داوە، خودا لەوە مەزن و بەرزترە، بەڵکو خودا لەسەروی ئاسمانەکانیەتی و لە ئافەریدەکانی جودایە، خوای گەورە لەبابەت کورسیەکەی دەفەرموێ: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾، پێغەمبەریش ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە ئاسمانەکان لە چاو کورسی وەکو ئاڵقەیەك وایە لەساراو دەشتێك فڕێ درابێ، کورسیش لەچاو عەرش وەکو ئاڵقەیەك وایە لە سارایەك فڕێ درابێ.. ئەم ئایەتەش وەکو ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾. هەروەها کە دەفەرمێ: ﴿فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ﴾، لێرەدا مەبەست ناوقەدی دارو ناخی زەوی نیە. ئاواش مەبەست ئەوەیە کە خودای بەرز لەسەرو ئاسمانەکانە و لەسەریانە. ئەم فەرمودەیەش وەك ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿أَأَمِنتُم مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمْ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ واتە لەبەرزیدا، یا وەك ئەو فەرمودەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە کەنیزەکەی پرسی ((این الله: خوا لە کوێیە؟)) گوتی: لەئاسمانە، ئینجا فەرموی: ((اعتقها فانها مؤمنة: ئازادی کە چونکە بڕوادارە)). ئەم فەرمودەیەش موسلیم لە صەحیحەکەی گێراویەتیەوە.

بەرزی دەكەنەوە. داوای دەرگەكردنەوەی بۆ دەكەن، دەڵێن: ئەوە كێیە؟ دەڵێن: فلانە، دەڵێن: بەخێرنەیەت، ئەو گیانە پیسەی لە جەستەیەكی پیس دابـو. بـەزەم كـراوی بگەڕێوە، چونكە دەرگە بۆ تۆ ناكرێتەوە، جا لە ئاسمانێوە ڕەوان دەكرێتەوە و دێتەوە ناو گۆڕ...))[1]

---

[1] رواه ابن ماجه في سننه وقد صححه الالباني في صحيح الجامع الصغير: (١٩٦/٢)

# بەندی چارەم

# گۆڕ

## جێباسی یەکەم

## ترسناکی و سەختی گۆڕ

هانیئی ئازادکراوی عوسمانی کوڕی عەفان دەگێڕتەوە، دەڵێ: ئەگەر عوسمانﷺ لە سەر گۆڕێك راوەستابا دەگریا تا ڕدێنی تەڕ دەبو، پێیان گوت: باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکەی ناگری، بەڵام کە یادی گۆڕ دەکەی دەگری؟ گوتی: من لە پێغەمبەرﷺم بیست فەرموی: ((القبر أول منازل الآخرة، فإن نجا منه فما بعده ايسر منـه، وإن لم ينج منه فما بعده اشدّ منه: گۆڕ یەکەمین مەنزڵگەکانی دواییینە، ئەگەر مرۆڤ لێی دەرباز بێ ئەوەی لەپاشان دێ ساناترە و ئەگەر لێشی دەرباز نەبێ، ئەوەی لەپاشان دێ سەختترە))، هەروەها گوتی لە پێغەمبەرﷺم بیست فەرموی: ((مارأيت منظرا قط الا القبر افضع منه: هەر دیمەنێکم دیتبێ، گۆڕ لەوی سەختتر بوە)).[1]

چونکە ئەوەی پاش گۆڕ بۆ ئەو کەسە ساناترە، کە رزگار بوە، ئەگەر بەندەی بڕوادار لە گۆڕەکەیدا ببینێ خودا چ بەهرەیەکی بۆ ئامادەکردوە، دەڵێ: ((رب عجل قيام الساعة، كيما ارجع الى اهلي و مالي: پەروەردگارم، با زو قیامەت دابێ، تاکو بگەڕێمەوە نێو ماڵ و منداڵم)). بەڵام ئەگەر بەندەی بێبڕوا و گوناهکار ببینێ خودا چ ئەشکەنجەیەکی توندی بۆ ئامادە کردوە، ئەوسا سەرەڕای ئەو ئازار و

---

[1] رواه الترمذي و ابن ماجة وقال الترمذي: هذا حديث غريب؛ انظر مشكاة المصابيح: (٤٨/١) وجامع الأصول: (١٦٤/١١)؛ وقال الألباني في تعليقه على المشكاة: (وسنده حسن)؛ وانظر صحيح الجامع الصغير.

ئەشکەنجەی تێیدایە دەڵێ: ((رب لاتقم الساعة: پەروەردگارم، قیامەت دامەهێنە))[1]، ئەوەش چونکە خراتر لە پاشترە و دوای گۆڕ سەختره.

## تاریکایی گۆڕ

لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێك مرد، کە گسکی لە مزگەوت دەدا و خاوێنی دەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ لێی پێچاوە، پێیان گوت کە بەشەو مردوە و شاردیتیانەوە و، حەزیان نەکردوە پێغەمبەرﷺ وەئاگا بێت. پێغەمبەرﷺ داوای لەهاوەڵانی کرد گۆڕەکەی پێشان بدەن، جا کە هاتە سەر گۆڕەکەی نوێـژی لەسـەر کـردو، پاشـان فەرموی: ((ان هذه القبور مليئة ظلمة على اهلها، وان الله ﷻ منورها لهم بصلاتي عليهم: ئەم گۆڕانە پڕ تاریکایین لەسەر خاوەنەکانیان، خودای بەرز و بەدەسەڵات، بە نوێژەکەی من بۆیان روناك دەکاتەوە))[2].

## جێباسی دوەم

## گۆڕەوشار

کاتێك مردو لە گۆڕ دەنرێ، گۆڕ دەیگوشێ و هیچ کەسێکیش لەو گوشینە رزگار نابێت، گەورە بێ یا گچکە، پیاوچاك بێ یان پیاوخراپ. لە فەرمودەاندا هاتوە کە گۆڕ سەعدی کوڕی موعاذی گوشیوە، لە کاتێکدا کە عەرش لە تاو مردنی وی لەرزیوە و دەرگەکانی ئاسمانی بۆ کراوەتەوە و هەفتا هەزار فریشتە لە ناشتنی ئامادەبون.

لەسونەنی نەسائی لە ئیبنی عومەر ﷺ هاتوە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((هذا الذي تحرك له العرش، وفتحت له ابواب السماء، وشهده سبعون الفاً من الملائكة، لقـــد

---

[1] بەشێکە لە فەرمودەی بەراء، لە لاپەرە ۲۸ تەخریج کراوە.

[2] احكام الجنائز: ص۸۷

ضم ضمة، ثم فرج عنه: ئەوە ئەو کەسەیە کە عەرشی بۆ جولا و دەرگەکانی ئاسمانی بۆ کرایەوەو هەفتا هەزار فریشتە لە دیاری ئامادەبون، گۆڕ جارێکی گوشی و پاشان بەری‌دا))[1].

هەروەها لە موسنەدی ئەحمەدی پێشەوا دیسان لە ئیبنی عومەر هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((ان للقبر ضغطة لو كان احدا ناجيا منها نجا منها سعد بـــن معـــاذ: گۆڕ فشارێکی هەیە، ئەگەر یەکێکی لێ ڕزگار بوبا، سەعدی کوڕی موعاذ ڕزگاری دەبو))[2].

هەروەها لە هەردو موسنەدی گەورە و ناوەنجی طەبەرانیدا هاتوە، لە ئیبنی عەبباسەوە رضي الله عنه کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لو نجا احد من ضمة القبر، لنجا سعد بن معاذ، ولقد ضم ضمةً، ثم روخي عنـــه: ئەگەر یەکێك لە گوشینی گۆڕ ڕزگار ببوایە، سەعدی کوڕی موعاذ ڕزگار دەبو، جارێك گوشراو، پاشان لەسەری خاو بۆوە))[3].

بەڵگەی ئەوەش کە گوشینی گۆڕ بۆ هەمو مرۆڤێکە و تەنانەت منداڵیش لێی دەرباز نابن. ئەو فەرمودەیە کە لە موسنەدی گەورەی طەبەرانی لە ئەبوئەیوبی ئەنصاری بەسەنەدێکی صەحیح و، لە موسنەدە ناوەنجیەکەی طەبەرانیدا هەیە، هەروا لە (الكامل)ی ئیبنی عەدی لە ئەنەس هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لـــو افلت احد من ضمة القبر لنجا هذا الصبي: ئەگەر یەکێك لە گوشینی گۆڕ ڕزگار ببا، ئەم منداڵە ڕزگاری دەبو))[4].

---

[1] رواه النسائي في كتاب الجنائز، باب ضمة القبر و ضغطته: (٤/١٠٠)، وقال الشيخ ناصر في المشكاة، (٤٩/١) وسنده صحيح على شرط مسلم.

[2] رواه احمد في مسنده، وقال الشيخ ناصر في صحيح الجامع: (٢٣٦/٢) اسناده صحيح.

[3] قال في صحيح الجامع (٧١/٥) اسناد صحيح.

[4] صحيح الجامع: (٥٦/٥).

## جێباسی سێیەم

# تـاقـیکردنەوەی گۆڕ

## خوازگەی یەکەم

## تـاقـیکردنەوەکە چۆن دەبێ

**کە بەندە دەخرێتە نێو گۆڕ، فریشتە بەشێوەی ناشیرین دێنە لای، لە سونەنی تیرمیذیدا هاتوە:** ((اذا قبر الميت -او قال: احدكم- أتاه ملكان أسـودان أزرقـان، يقـال لأحدهما المنكر، وللآخر النكير، فيقولان: ما كنت تقول في هذا الرجل؟ فيقول: ما كان يقـول؛ هو عبدالله ورسوله، اشهد ان لا اله الا الله، وأن محمداً عبده ورسوله.. وإن كان منافقـا قـال: سمعت الناس يقولون قـولاً، فقلـت مثلـه، لا أدري..: **ئەگەر مردو خرایە نێو گۆڕ، دو فریشتەی ڕەش و شین دێنە لای، بەیەکێکیان دەڵێن: مونکەر، بەوی دیکەش دەڵێن: نەکیر. جا پێی دەڵێن: چیت بەو پیاوەی دەگوت؟ ئەوە دەڵێ کە بەخۆی دەیگوت؛ بەندەو پێغەمبەری خوا، گەواهی دەدەم کە لە خوا بترازێت چ خوداو پەرستراوێکی دیکە نین و موحەممەدیش بەندەو پەیامبەری خوایە.... جا ئەگەر دوڕوش بێ دەڵێ: بیستم خەڵکی شتێکیان گوت و، منیش وام گوت، نازانم....))**[1]

**هەروەها لەو فەرمودەی کە بەڕاء دەیگێڕتەوە، لە پێغەمبەرﷺەوە هاتوە:** ((فيأتيـه ملكان [شديدا الإنتهار] فـ[ينتهرانه، و] يجلسانه فيقولان له: من ربك؟ ما دينك؟ من نبيـك؟

---

[1] رواه الترمذي في كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر؛ (٣٨٣/٣)؛ وقال الترمذي: حديث حسن غريب، وقال محقق الكتاب الشيخ احمد شاكر: لم يخرجه من اصحاب الكتب الستة سوى الترمذي، وقد رمز له الشيخ ناصر بالحسن في صحيح الجامع: (٢٥٩/١)، وأورده في سلسلة الأحاديث الصحيحة حديث رقم (١٣٩١).

وهي آخر فتنة تعرض على المؤمن، فذلك حين يقول الله ﷻ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّـــهُ الَّذِيـــنَ آمَنُـــوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ فيقول: ربي الله، وديني الإسلام، ونبيي محمدﷺ، فينــــادي منادٍ مــــن الســــماء: أن صــــدق عبــــدي: **دو فريشتەی توند دێنە لای تیێڕادەخوڕن و دایدەنیشێنن، جا پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ دینت چیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەمەش دوایین تاقیکردنەوەیە دێتە بەردەم بڕوادار، لەبارەی ئەمەشە خودای بەرز دەفەرموێ:** ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَـــا: **ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێنــاوە، لەبەر وتــار و بــاوەڕی پتــەویان، خــودا لــەم دونیــا بــە پتــەوی جێگیریان دەکات.**﴾[1]، **جا دەڵێ: پەروەردگارم خوایە و، دینم ئیسلامە، پێغەمبەریشم موحەمەدﷺـە. ئەوجا بانگوێژێك لە ئاسمانێدا بانگ دەکا کە بەندەکەی من راستی کرد)).**

**هەروەها لەبابەت بەندەی بێبڕوا و گوناهکاریش فەرموی:** ((ويأتيه ملكان [شــــديدا الإنتهار، فينتهرانه، و] يجلسانه، فيقولان له: من ربك؟ فيقول: هاه، هاه، لا أدري، فيقولان لــــه: ما دينك؟ فيقول: هاه، هاه، لاأدري، فيقولان: فما تقول في هذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فــــلا يهتدي لأسمه، فيقال: محمد، فيقول: هاه، هاه، لا أدري، [سمعت النــــاس يقولــــون ذاك، قــــال: فيقولان: لا دريت ولا تلوت]؛ فينادي منادي أن كــــذب عبــــدي: **دو فریشتەی توندوتیژ دێنە لای و تێڕادەخوڕن و دایدەنشێنن، جا پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم، پێی دەڵێن: دینت چیە؟ دەڵێ: ها، ها، نازانم، دەڵێن: ئەدی چ بەو پیاوەی دەڵێی کە لە نێوتان ڕەوانە کرابو؟ بەڵام بەناوی ناکەوێتەوە، دەڵێن: موحەمەد، دەڵێ: ها، ها، نازانم، گوێم لێبو خەڵکی وایان دەگوت، فەرموی: ئەوجا پێی دەڵێن: نە دەتزانی و نە وەکو ئەو خەڵکەشت گوت. جا بانگوێژێك لە ئاسمانێدا بانگ دەکات کە بەندەی من درۆی کرد))**[2].

**هەروەها لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرﷺـەوە فەرموی:** ((إن العــــبد اذا وضــــع في

---

[1] سورة ابراهيم: ٢٧.

[2] فەرمودەیەکی صەحیحە پێشتر لە لاپەرە (٢٨) تەخریج کراوە.

قبره، وتولى عنه اصحابه، انه ليسمع قرع نعالهم اذا انصرفوا، اتاه ملكان، فيقعدانه، فيقولان لـه: ما كنت تقول في هذا الرجل، محمد؟ فأما المؤمن فيقول: اشهد انه عبدالله و رسوله.. وأما الكـافر والمنافق فيقول: لا أدري، كنت أقول ما يقول الناس فيه، فيقال: لا دريـت ولا تليـت...: كـه بـەندە خرايـە نێـو گۆڕەكـەی و، هـاوەڵانی پشـتیان تێكـرد، گوێـی لـە تەپـەی پێڵاوەكانيـان دەبێ، كـە جێـی دێڵـن، دو فريشـتە دێنـە لای دايدەنشـێنن، جـا پێـی دەڵێـن: لـەبارەی ئـەو پيـاوە چيت دەگـوت كـە نـاوی موحەممـەدە؟ هـەرچی بـڕوادارە دەڵـێ: شـايەتی دەدەم كـە بەندە و پێغەمبـەری خوايـە... بـەڵام بێـبڕوا و دوڕو دەڵـێ: نـازانم، خـەڵكی چيـان پـێ دەگـوت، منيـش وام دەگـوت، دەڵێـن: نـەتزانی و وەك ئـەو خەڵكەشت نەگوت))[1].

لەسەرەتادا، پێغەمبەر ﷺ نەيدەزانی ئەم ئومەتە لە گۆڕەكانيان تاقیدەكرێنەوە، پاشان خودا ئەو زانستەی پـێ سروش كرد، عوروەی كوڕی زوبێر لە عائيشەی پلكی دەگێڕتەوە كە گوتی: پێغەمبەر ﷺ لێم هاتـە ژوریێ و، مـن ئافرەتێكی جولەكـەم لـەلا بـو، ئـەو ئافرەتـە دەيگـوت: هەسـت دەكـەی ئێـوە لـە گـۆڕدا تاقیدەكرێنەوە؟ عائيشـە دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ راچڵـەكی و، فـەرموی: ((انمـا تفـتن اليـهود: بـەڵكو جولەكـە تاقیدەكرێنـەوە))، عائيشـە دەڵـێ: چـەند شـەوێك تێپـەڕين، ئينجـا پێغەمبـەر ﷺ فەرموی: ((هل شعرت انه اوحي الي تفتنون في القبور: هەستت كرد سروشم بۆ هات كە لە گۆڕدا تاقیدەكرێنەوە)). عائيشە دەڵێ: لەپاش ئەوكاتـەوە لـە پێغەمبـەرﷺم بيست: خۆی لە ئەشكەنجەی گۆڕ پەنا دەدا.[2]

---

[1] رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي؛ جامع الاصول: (١٧٣/١).

[2] رواه مسلم صحيحه، كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب استحباب التعوذ من عذاب القبر، حديث رقم (٥٨٤)، (٤١٠/١).

## خوازگەی دووەم

# ئایا بێبڕوا لە گۆڕ تاقیدەکرێتەوە

ئەو فەرمودانەی هێنامانەوە بەڵگەی ئەوەن کە بێبڕوایان لەگۆڕدا تاقیدەکرێنەوە، کەچی حەکیمی تیرمیذی و ئیبنی عەبدولبەڕو سیوطی بۆچونی پێچەوانەیان هەیە[1].
حەکیمی تیرمیذی بیانوی لێنەپرسینەوەیان بەوە دێنێتەوە کە نەتەوەکانی پێشو ئەگەر بەدەم وەڵامی پێغەمبەرەکانیان نەچووبان هەر زو لە دنیادا سزا دەدران، بەپێچەوانەی ئەم ئومەتە، کە سزای لێ گیراوەتەوە و، پێغەمبەر ﷺ بە شمشێر ڕەوانە کراوە. جا ئەوی لە ترسی کوشتنی موسڵمان بێ و پاشان دەغەڵی بکا، لە گۆڕدا ئەشکەنجە دەدرێ.

بەڵام ئەم ڕاو بۆچونە هێندێکی دەوێ، چونکە خودا پاش دابەزینی تەورات بەدرۆخەرەوانی نەتەوەکانی تونا نەکردون[2].

ئیبنی عەبدولبەڕیش بیانوی ئەو فەرموده صەحیحەی پێغەمبەرﷺە. کە تێیدا دەفەرموێ: ئەم ئومەتە لە گۆڕەکانیان تاقی دەکرێنەوە، هەندێك گێڕانەوەش دەڵێن پرسیاریان لێدەکرێ[3]. جا فەرموده صەحیحەکان ئەو چەمکە ڕەت دەکەنەوە و. بەڵگەی ئەوەن کە ئەمە بە بڕواداران تایبەت نیە و، بەتەنێ بۆ ئەم ئومەتەش نیە.

عەبدولحەققی ئیشبیلیو ئیبنیقەییم و قورطوبیو سەفارینیو بێجگە لەوانیش وای بۆ دەچن کە ئەزمون و پرسیارەکە گشتیە.[4]

---

[1] لوامع الانوار البهية: (٢/١٠)

[2] سەیری (لوامع الانوار البهية) ي سەفارینی بکە: (٢/١٠)

[3] لوامع الانوار البهية للسفاريني: (٢/١٠)، وتذكرة القرطبي: (١٤٧).

[4] لوامع الانوار البهية للسفاريني: (٢/١٠)، وتذكرة القرطبي: (١٤٧).

## خوازگەی سێیەم

# ئایا ئەوانەی ئەرکبار نین تاقی‌دەکرێنەوە

تاقی‌کردنەوەی گۆڕ بۆ سەرجەم ئەرکباران سەرتاپاگیرە، جگە لە پێغەمبەران کە جیاوازییەکیان دەربارە هەیە[١]، هەروەها بێجگە لەشەهیدان و سەنگەرگرتوان و ئەوانی دەقی قورئان و فەرمودە بونەتە بەڵگەی دەربازبونیان لە تاقی‌کردنەوەی گۆڕ. هەروەك ڕون دەکرێنەوە.

هەروەها جیاوازییەك لەبارەی منداڵ و شێتانیش هەیە کە ئەرکبار(مکلف) نین، کۆمەڵێك لە زانایان، لەوانە ئەبویەعلای قازی و ئیبنی عەقیل، وای بۆچون کە ئەوانە تاقی‌ناکرێنەوە، لە دیدی ئەوانە تاقیکردنەوە تەنها بۆ کەسێکە ئەرکبار بێ، بەڵام ئەوی قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوە ناکەوێتە تاقیکردنەوە، چونکە هیچ مانای نیە کە پرسیاری لە شتێك لێبکرێ پێی ئەرکبار نەکرابێ.

زانای دیکەش دەڵێن: بەڵکو تاقی‌دەکرێنەوە، ئەمەش گۆتەی ئەبولحەکیمی هەمەدانی و ئەبولحەسەنی کوڕی عەبدوسە، لە هاوەڵانی شافیعی ڕاگواستوە، هەروەها مالیك و هی دیکەش لەئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر منداڵێك کردوە فەرموی: ((اللهم قه عذاب القبر و فتنة القبر: خودایە بیپارێزە لە ئەشکەنجەی گۆڕ و تاقی‌کردنەوەی گۆڕ)). ئەم گۆتەیەش کۆکە دەگەڵ گۆتەی ئەوانەی دەڵێن: ئەوانە لە دواییندا تاقی دەکرێنەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا ئەرکبارن، هەروەکو گۆتەی زۆربەی زانستخواز و سونەتخوازانە لە ئەهلی فەرمودە و کەلام. هەر ئەوەشە کە ئەبولحەسەنی ئەشعەری لە ئەهلی سونەتەوە باسی دەکا و هەڵیبژاردوە. دەقەکانی ئەحمەدی پێشەواش هەر ئەمە دەگەیەنن.[٢]

---

[١] مجموع الفتاوي: (٤/٢٥٧).

[٢] بگەڕێوە بۆ: مجموع الفتاوي، لشيخ الاسلام ابن تيمية: (٤/٢٥٧، ٢٧٧)

## جێباسی چوارەم

# ئەشکەنجە و بەهرەی گۆڕ

## خوازگەی یەکەم

## فەرمودەکانی ئەشکەنجە و بەهرەی گۆڕ پەیاپەی( متواتر ) هاتون

ڕاڤەکاری طەحاوی دەڵێ: (هەواڵەکان پەیاپەی لە پێغەمبەرﷺەوە هاتون کە ئەشکەنجە و بەهرەی گۆڕ دەسەلمێنن، هەریەکەیان بۆ کەسێکی شیاوی خۆی، لەگەڵ پرسیاری هەردو فریشتەکە. جا دەبێ باوەڕ بە سەلماوی ئەوە هەبێ و بڕوای پێ بهێنرێ و، لەبارەی چۆنیەتیەکەشی نادوێین، چونکە ئاوەز(عەقڵ) پەی بە چۆنیەتیەکەی نابا، لەبەر ئەوەی لەم خانەیەدا بەشتێکی وا ئاشنا نەبوە، شەرعیش هەر ئەو شتانە ناهێنی کە ئاوەز پێی ئاشنا بێ، بەڵکو شەرع شتی وا دێنی ئاوەزان سەراسیمە و سەرگەردان دەکا. هەروەك گەڕانەوەی گیان بۆ جەستە بەشێوازی دنیایی نیە، بەڵکو بە چۆنیەتیەکی نەبان بەوەی دنیایی بۆی دەگێڕدرێتەوە).[1]

لەشوێنێکی تریشدا دەڵێ: (ئەشکەنجەی گۆڕ هەمان ئەشکەنجەی بەرزەخە، جا هەر کەسێکی بمرێ و شیاوی سزابێ، بەشی خۆی لێ دەچێژێ، جا لە گۆڕ نرابێ یان نا، درندە خواردبیان، یا سۆتابێ تا بوبێتە مشکی و بە با درابێ، یان لە خاچ درابێ یا لە دەریایی نقوم بوبێ وخنکابێ، هەمان ئەو ئەشکەنجەیە دەگاتە گیان و جەستەی، کە دەگاتە مردوی لە گۆڕ نراو، ئەوەی هاتوشە لەبارەی دانیشاندن و تێکپەڕینی پەراسوەکانی و شتی لەم بابەتە، دەبێ مرازی پێغەمبەر ﷺ چ بوبی وای

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية: (٤٥٠)

تێبگەین، بێ زێدەڕۆیی و کورتبڕی)[1].

بێ ئاینان و ئەو ئیسلامیانەی ڕێچکەی پیتولانیان گرتوە، باوەڕ بە ئەشکەنجەی گۆڕ ناکەن و، دەڵێن: ڕاستەقانی(حقیقی) نیە. بیانوشیان ئەوەیە، کە گۆڕ هەڵدەکەنن هیچ لەوان شتان بەدی ناکەن کە دەقەکان هەواڵیان پێداوە.[2]

هەروەها خەواریج و هەندێك موعتەزیلەی وەکو ضیراری کوڕی عەمر و بیشری مەریسی، باوەڕیان بە ئەشکەنجەی گۆڕ نیە. سەرجەم ئەهلی سونەت، زۆرینەی موعتەزیلانیش پێچەوانەی وانەن.[3]

ئەوانە شتێکیان وەدرۆ خستۆتەوە کە بەزانستەکەی شارەزا نین، وایان گومان بردوە کە چاویان هەمو شتێك دەبینێ، گوێیان هەمو شتێك دەبیسێ. کەچی ئەمڕۆ ئێمە لە رازو نهێنیەکانی گەردون شتی وا دەزانین کە گوێ وچاوانمان دەستەوسان بون لە ئاست بیستن و بینینیان. هەر کەسێکی بڕواشی بەخودا هەبێ، هەواڵەکانی بە ڕاست دەزانێ و باوەڕیان پێدەکا.

لە قورئانیشدا ئاماژەگەلێك هاتون کە بەڵگەن بۆ ئەشکەنجەی گۆڕ، بۆخاریش لە کتێبی (الجنائز)دا باسی ئەشکەنجەی گۆڕی کردوە و، لەژێر ناوی: دەروازەی ئەوەی لەبارەی ئەشکەنجەی گۆڕدا هاتوە، جا ئەم ئایەتە پیرۆزانەی لە باسەکەیدا هاوردەوە: ﴿إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلاَئِكَةُ بَاسِطُوا أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمْ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ: کاتێك ستەمکارەکان لە پەلەقاژەی مەرگ دان چۆن گرفتار بون و فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن و پێیان دەڵێن دەخۆتان دەربازکەن. ئەمڕۆ بەئەشکەنجەیەکی شەرمەزارکەر سزا دەدرێن.﴾.[4] هەروەها دەفەرموێ: ﴿سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَى عَذَابٍ عَظِيمٍ: دو جاران ئەشکەنجەیان

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية: (٤٥١)

[2] بڕوانە: تذكرة القرطبي: (١٢٥)

[3] فتح الباري: (٣/٢٣٣).

[4] سورة الانعام: ٩٣.

**دەدەین و ئەوسا بۆ لای ئەشکەنجەی مەزنیان بەرێ دەکەین.﴾[1]. دیسان کە دەفەرموێ:** ﴿وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ، النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ: **ئەو ئەشکەنجە بەدفەرە خانەوادەی فیرعەونی داگرت، بەیانیان و هێواران ئاگریان بۆ تێ دەدرێ و پیشانیان دەدرێ، لە رۆژی دواییشدا رێ بە فریشتەکانی ئازار دەدرێ خانەوادەی فیرعەون بخەنە نێو سەخت و دژوارترین ئەشکەنجە و ئازار﴾.[2]**

**وەکو پێشتر باسکرا؛ یەکەم ئایەت کە بوخاری هاوردویەتی لەبابەت ئەشکەنجەی فریشتانە بۆ کافر و بێبڕوایان لەسەرەمەرگدا، ئایەتی دوەمیش بەڵگەی ئەوەیە کە مونافیقان دوچاری دو ئەشکەنجە دەبن، پێش ئەشکەنجەی رۆژی قیامەت؛ ئەشکەنجەی یەکەم ئەوەیە کە خودا لە دونیا لەلایەن خۆیەوە سزایان دەدا، یا بە دەستی بڕواداران، دوەمیشیان ئەشکەنجەی گۆڕە. حەسەنی بەسری دەڵێ: (دو جاران ئەشکەنجەیان دەدەین، واتە: ئەشکەنجەی دنیاو، ئەشکەنجەی گۆڕ).[3]**

**طەبەری دەڵێ: (وادیارە جارێکیان ئەشکەنجەی گۆڕە و، ڕەنگە ئەوی دیکەشیان برسیەتی یا بە کۆیلەکردن یا کوشتن یا مل پێکەچکردن یا بێجگە لەوانەبێ)[4].**

**سێیەم ئایەتیش بەڵگەیەکی رونە بۆ ئەهلی سونەت، کە ئەشکەنجەی گۆڕیان سەلماندوە، چونکە خودای بەرز بڕیاری داوە کە خانەوادەی فیرعەون بەیانیان و هێواران دەدرێنە بەر ئاگر، دیارە ئەمەش بەر لە رۆژی قیامەتە، چونکە خودای بەرز پاش ئەمە فەرمویەتی:** ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ: **لە رۆژی دواییشدا رێ بە فریشتەکانی ئازار دەدرێ خانەوادەی فیرعەون بخەنە نێو سەخت و دژوارترین ئەشکەنجە و ئازار﴾. قورطوبی دەڵێ: (جەماوەر لەسەر ئەوەن**

---

[1] سورة التوبة: ١٠١.

[2] سورة غافر: ٤٥ – ٤٦.

[3] فتح الباري: (٢٣٣/٣).

[4] فتح الباري: (٢٣٣/١١).

که له بەرزەخدا دەدرێنە بەر ئاگر، ئەمەش بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ئەشکەنجەی گۆڕ)[1]

ئاشکراترین ئاماژەی قورئانیش کە بەڵگە بێ بۆ تاقیکردنەوە و ئەشکەنجەی گۆڕ، ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ: ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوە، بە گوتاری پتەو لەم دنیایە و لەو دنیایەش خودا بە پتەوی رایان دەگرێ﴾[2]. لەو فەرمودەیەش کە بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە، فەرموی: ((اذا اقعد المؤمن في قبره أتي ثم شهد أن لا اله الاّ الله وأن محمداً رسول الله، فذلك قوله ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ﴾ وفي رواية اخرى: وزاد ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ نزلت في عذاب القبر: کە بڕوادار لەنێو گۆڕەکەیدا دادەنیشێندرێ و پاشان شایەدی دەدا کە بێجگە لە خودا هیچ خوایەکی دی نیە و موحەممەدیش نێردراوی خوایە. ئەمەیە مەبەستی فەرمودەی خوای گەورە ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ: ئەو کەسانی بڕوایان هێناوە بەگوتاری پتەو خودا بە پتەوی رایاندەگرێ﴾. لە گێڕانەوەیەکی دیکەشدا: ئەمەشی زیاد کرد کە: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ لەبارەی ئەشکەنجەی گۆڕ دابەزیوە)).[3]

هەروەها عائیشە خانم (رەزای خوای لێبێ) بۆمان دەگێڕێتەوە (کە ئافرەتێکی جولەکە چوە لای و باسی ئەشکەنجەی گۆڕی کرد و پێی گوت: خودا لە ئەشکەنجەی گۆڕ پەنات بدا. جا عائیشە لەبارەی ئەشکەنجەی گۆڕ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرموی: ((نعم، عذاب القبر حق: بەڵێ، ئەشکەنجەی گۆڕ ڕەوایە))، عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لەوکاتەوە دەمدیت لە هەمو نوێژێکدا پێغەمبەر ﷺ خۆی لە ئەشکەنجەی گۆڕ پەنا دەگرت).[4]

---

[1] فتح الباري: (١١/٢٣٣).

[2] سورة ابراهيم: ٢٧.

[3] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر، فتح الباري: (٣/٢٣١).

[4] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر، فتح الباري: (٣/٢٣١).

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە، لە عائیشە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: (دو پیرێژنە جولەکـەی مەدینـە هاتنـە لام و گوتیـان: گۆڕنشـینان لـەنێو گۆڕەکانیـاندا ئەشکەنجە دەدرێن، دەڵێ: منیش بەدرۆم خستنەوە و، دڵم دانەکەوت و پێم خۆش نەبو باوەڕیان پێبکەم، ئەوان چونە دەرێ و، پێغەمبەرﷺ هاتە لام، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، دو پیرێژنە جولەکەی مەدینە هاتنە لام و گوتیان گوایە گۆڕنشینان لە گۆڕەکانیان ئەشکەنجە دەدرێن؟ فەرموی: ((صدقتا، انهم يعذبون عذابا تسمعه البـهائم: ڕاسـتیان گوتـوە، گۆڕنشـینان ئەشـکەنجەیەکی وا دەدرێـن، چـارەوێ دەیبیسـتن))، عائیشە دەڵێ: پاش هەنگی لە هەمو نوێژێکـدا دەمدیـت پێغەمبـەر ﷺ خـۆی لـە ئەشکەنجەی گۆڕ پەنا دەگرت)[1].

لەبەر مەزنێتی و ترسناکی‌ی ئەم مەسەلەیە، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی خۆی فێری ئەمە دەکرد، تەنانەت جارێکیان لەم بارەوە وتارێکی بۆ دان، هەروەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، لە ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵێ: (پێغەمبـەری خوا ﷺ هەستا وتارێکی دا و، باسی تاقی‌کردنەوەی گۆڕی کرد کە مرۆڤ توشی دێ، کە ئەمەی باسکرد موسڵمانان کردیانە دەنگە دەنگ)[2]، لەلای نەسائی ئەوەی زێترە: جا ئەو دەنگەدەنگە لێنەگەڕا لە فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەم، کە بێ دەنگ بون، بە پیاوێکی نزیکی خۆم گوت: خودا بەهرەوەرت کات، پێغەمبەر ﷺ لەدوادوای قسەکانیدا چی فەرمو؟ گوتی: فەرموی: ((قد اوحي الي انكم تفتنون في القبور قريباً من فتنة الدجال: سروشم بۆ هاتوە کە ئێوە لەنێو گۆڕدا توشی ئاشوب و ئەزمونی نێزیك لەئاشوبی دەجال دێن))[3].

---

[1] صحيح مسلم، كتاب المساجد، باب استحباب التعوذ من عذاب القبر: (٤١١/١).

[2] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر، فتح الباري: (٢٣٢/٣).

[3] رواه النسائي، انظر جامع الاصول: (١٧٠/١١).

# بیستینی دەنگی ئەشکەنجەدراوان لەلایەن پێغەمبەر ﷺ

خودا توانای ئەوەی بەخشیوەتە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەنگی ئەشکەنجەدراوان لەنێو گۆڕەکانیانەوە ببیستێ، لەو فەرمودەیە هاتوە کە موسلیم لە صەحیحەکەی دەیگێڕێتەوە، لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە ﷺ دەڵێ: (کە پێغەمبەر ﷺ لەنێو غەڕەو حەسارێکی بەنی نەججار بو، بەسواری هێسترێکی خۆیەوە و ئێمەش لەگەڵیدا بوین، لەناکاو هێسترەکەی لەڕێ لایدا و خۆی هەڵدا، هێندەی نەمابو پێغەمبەر ﷺ بەرداتەوە، دەبینین چوار یا پێنج یا شەش گۆڕی لێیە، فەرموی: ((من یعرف اصحاب هذه الأقبر؟: کێ خاوەنی ئەم گۆڕانە دەناسێ؟)) پیاوێك گوتی: من، فەرموی: ((فمتی مات هؤلاء ؟: کەی ئەوانە مردون؟)) گوتی: لەسەر شیرك مردون. فەرموی: ((ان هذه الامة تبتلی في قبورها فلولا ان لا تدافنوا، لدعوت الله ان یسمعکم من عذاب القبر الذي اسمع منە: ئەم نەتەوەیە لە گۆڕەکانیان تاقی دەکرێنەوە، لە ترسی ئەوە نەبا کە یەکتر نەشارنەوە، لە خودا دەپاڕامەوە ئێوەش ئەو ئەشکەنجەی گۆڕەتان ببیستبا کە من دەیبیستم)).[1] هەروا لە هەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم و سونەنی نەسائی لەئەبو ئەیوبی ئەنصاری هاتوە، دەڵێ: (پاش ڕۆژاوابونێ پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرێ، دەنگێکی بیست، فەرموی:((یهود تعذب في قبورها: جولەکەن لە گۆڕەکانیان ئەشکەنجە دەدرێن)).[2]

ئەو فەرمودەیەش کە بەڵگەی بیستنی پێغەمبەرﷺە بۆ دەنگی ئەشکەنجەدراوان لە نێو گۆڕەکانیاندا، بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا لە ئیبنی عەبباسەوە دەیگێڕنەوە و ئەوەی تێدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بەلای دو گۆڕدا تێپەڕی، فەرموی: ((انهما یعذبان و مایعذبان في کبیر...)) الحدیث. بەیاریدەی خودا ئەم فەرمودەیە بەتەواوی باس دەکرێت.

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الجنة، باب عرض معقد الميت من الجنة او النار عليه، (٢١٩٩/٤).

[2] جامع الأصول: (١٧٢/١١).

## بیستنی دەنگی ئەشکە نجەدراوان لەلایەن غەیری پێغەمبەر ﷺ

تا ئێستاش خەڵکی واهەن باس لە بارەی بیستن و دیتنیان بۆ ئەشکەنجەدراوان لەنێو گۆڕەکانیاندا دەکەن، لە نێو ئەوانەشدا خەڵکێکی متمانەداری دیار هەن کە گومان لە دین و سەرڕاستیان نیە. ئیبنی تەیمیە لەم بارەیە دەڵێ: (رەنگە ئەمە بۆ زۆر لە ئەوەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە هەڵدرێتەوە و ئاشکرابێ، چ لە بێداری بێ یا بەنوستویی، جا دەشیزانن و دەشیتوێژنەوە، ئێمەش گەلێکی لەم بابەتەمان لایە).[1]

لە شوێنێکی دیکەشدا لەمیانەی وەرامی بۆ ئەوانەی ئەشکەنجەی گۆڕ بە درۆ دەخەنەوە، دەڵێ: (ئەگەر زانرابێ کە نوستو، نوستوە و، گیانی ڕادەبێ و دادەنیشێ و هەڵدەستێ و دەڕوا و دەچێ و قسان دەکا و کاری جیاجیاش بەناخی لاشە و لەگەڵ گیانەکە دەکات و، بەمەش لاشە و گیان توشی بەهرە و ئەشکەنجە دەبن، لەگەڵ ئەوەی کە جەستەکەی راکشاوە و، چاوانی نوقاوە و زاری داخراوەو، ئەندامەکانی داسەکناون، ڕەنگە لەبەر هێزی جوڵەی ناخی بشجوڵێتەوە و هەستێتەوە و بڕوا و بدوێ و هاوار بکا، لەبەر هێز و توندی مەسەلەکە لەناخیدا. ئەمە دەبێتە پەند بۆ مەسەلەی مردو لەگۆڕەکەیدا، کە گیانی ڕادەبێ و دادەنیشێ و پرسیار دەکا و بەهرە دەبینێ و ئەشکەنجە دەچێژی و هاوار دەکا و ئەمەش بە لاشە پەیوەستە، لەگەڵ ئەوەی لە گۆڕەکەشیدا راکشاوە، ڕەنگە ئازارەکە ئەوەندە بە هێز بێ تا لە لاشەشیدا رەنگ دەداتەوە، و لە دەرەوەی گۆڕەکەی ببینرێ و ئەشکەنجەی لەسەربێ و، فریشتەکانی ئەشکەنجەدانیشی پێ راسپێردراون، جا لاشەکەی دەجوڵێ و دەڕوا و لەگۆڕەکەی دێتە دەرێ، زیاتر لە یەکێکیش دەنگی ئەشکەنجەدراوانیان لە گۆڕەکانیان بیستوەو، هی واش دیتراوە کە بەدەم ئەشکەنجەدرانەوە لە گۆڕەکەی هاتۆتە دەرێ و، هی واش هەبوە ئەگەر مەسەلەکەی لێ بەهێز و توند بوبێ لاشەکەی هەستاوەتەوە، بەڵام ئەوە لە ئاست هەمو مردوێك رونادا، هەروەك هەمو نوستویەکیش مەرج نیە لەگەڵ خەونەکانیدا هەستێ و بجوڵێ، بەڵکو ئەمە پەیوەستە بە توندی و هێزی مەسەلەکە).[2]

---

[1] مجموع الفتاوي: (٢٤/٣٧٦).

[2] مجموع الفتاوي: (٥/٥٢٥).

## خوازگەی دووەم

# وەسفی بەهرە و ئەشکەنجەی گۆڕ

**پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەی بەڕائی کوڕی عازیب باسی کردوە کە فریشتەکان لەگۆڕدا پرسیار لە بەندەی باوەڕدار دەکەن، ئەویش بە جوانی وەرام دەداتەوە، ئەوجا** ((ينادي مناد في السماء: أن صدق عبدي، فأفرشوه من الجنة وألبسوه من الجنة، وافتحوا له بابا إلى الجنة. قال: فيأتيه من روحها وطيبها ويفسح له في قبره مدّ بصره، قال: ويأتيه [وفي رواية: يمثل له] رجل حسن الوجه حسن الثياب طيب الريح، فيقول: أبشر بالذي يسرك، [ابشر برضوان من الله، وجنات فيها نعيم مقيم] هذا يومك الذي كنت توعد، فيقول له: [وأنت فبشرك بخير] من أنت؟ فوجهك الوجه يجيء بالخير، فيقول: أنا عملك الصالح، [فوالله ما علمتك الاّ كنت سريعاً في طاعة الله، بطيئا في معصية الله، فجزاك الله خيراً]. ثم يفتح له باب من الجنة و باب من النار، فيقال: هذا منزلك لو عصيت الله، أبدلك الله به هذا، فاذا رأى ما في الجنة، قال: رب عجّل قيام الساعة كيما أرجع إلى أهلي ومالي، [فيقال له اسكن]: **بانگوێژێك لە ئاسمانێدا بانگ دەکا: بەندەی من راستی کرد، جا لە بەهەشتێی بۆ ڕاخەن و، لەبەهەشتێی لەبەر کەن، دەرگایەکی بەرەو بەهەشتێی بۆ بکەنەوە، فەرموی: جا بۆن و بەرامەی بەهەشتی بۆ دێ، تا چاوانی بڕکا گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ، فەرموی: جا پیاوێك بە ڕوێکی جوان و، پۆشاکێکی جوان و، بۆنێکی خۆشەوە دێتە لای و پێی دەڵێ: موژدەی ئەو شتانەت لێبێ کە پێیان شادمانی، موژدەی ڕەزامەندی خوا و، بەهەشتێك کە بەهرەی نەبڕاوەی تێدایە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێدرابو. ئەویش پێی دەڵێ: ئەدی ئەتۆ، موژدەی خێرت لێبێ، تۆ کێی؟ ڕوت ئەو ڕوەیە کە خێر دەهێنێ. دەڵێ: من کردەوەی چاکی تۆم، سوێند بەخوا هەروام لێت زانیوە کە بۆ تاعەتی خودا خێرا بوی و، بۆ یاخیبون لەخودا هێدی بوی، خوا پاداشتت بەچاکە بداتەوە.. ئەوجا دەرگەیەکی لە بەهەشت و دەرگەیەکیش لە دۆزەخی بۆ دەکرێتەوە، دەڵێ: ئەمە نیشینگەت بو ئەگەر لە خودا یاخی بوای، بەڵام خودای مەزن بەمەی بۆت گۆڕیەوە. جا کە دەبینێ چ لە بە هەشتێ**

دایە، دەڵێ: پەروەردگارم، خێرا قیامەت بهێنە، بەڵکو دەگەڕێمەوە نێو ماڵ و منداڵم، جا پێی دەوترێت: داکەسێ)).

هەروەها پێغەمبەری پایەدار ﷺ باسی بەندەی بێبڕوا[1] یا گوناهکاریشی فەرموە، پاش ئەوەی وەرامی خراپ و نابەجێ دەداتەوە: ((ينادي منادي في السماء أن كذب، فافرشوا له من النار وافتحوا له بابا إلى النار، فيأتيه من حرها وسمومها، ويضيق عليه في قبره حتى تختلف فيه أضلاعه، ويأتيه [وفي رواية: ويمثل له] رجل قبيح الوجه قبيح الثياب منتن الريح، فيقول: أبشر بالذي يسوؤك، هذا يومك الذي كنت توعد، فيقول: [وأنت فبشرك الله بالشرّ]، من أنت؟ فوجهك الوجه الذي يجيء بالشرّ، فيقول: أنا عملك الخبيث [فوالله ما علمتك الاّ كنت بطيئا على طاعة الله، وسريعا الى معصية الله]، [فجزاك الله شراً. ثم يقيض الله له اعمى اصم ابكم في يده مرزبة، لو ضرب بها جبل كان ترابا، فيضربه حتى يصير بها ترابا، ثم يعيده كما كان، فيضربه ضربة اخرى، فيصيح صيحة يسمعه كل شيء الاّ الثقلين، ثم يفتح له باب من النار، ويمهد من فرش النار] فيقول: رب لا تقم الساعة: بانگوێژێك لە ئاسمانێدا بانگ دەكا: ئەوە درۆی كرد، جا لە ئاگرێی بۆڕاخەن و، دەرگەیەكی ڕو لە ئاگری بۆ بكەنەوە، جا گەرمایی و هوڕەی ئاگری بۆدێ، گۆڕی بەسەردا تەسك دەبێتەوە هەتا پەراسوەكانی تێك دەپەڕن. جا پیاوێكی ڕو و پۆشاك ناشرینی بۆگەنیی دێتە لا، پێی دەڵێ: موژدەی ئەو شتانەت لێبێ كە ناشادت دەكەن، ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە بەڵێنت پێدرابو. ئەویش دەڵێ: ئەدی ئەتۆ، موژدەی خراپت لێبێ، تۆ كێی؟ ڕوت ئەو ڕوەیە كە شەڕ دەهێنێ. دەڵێ: من كرداری بەد و پیسی تۆم، سوێند بە خوا هەروام لێت زانیوە هێدی بی لە ئاست تاعەتی خوا و، خێرا بی بۆ یاخیبون لەخوا، خوا بەخراپە پاداشتت بداتەوە. جا خودا كوێرێكی كەڕ و لاڵی بۆ دەڕەخسێنێ، كە گورزێكی لە دەستە، ئەگەر پێی لە چیا بدا دەیكاتە خۆڵ، جا لێی دەدا تا دەیكاتە خۆڵ، ئەوجا چۆن بو وای دەگێڕێتەوە و دیسان لێی دەداتەوە، جا بەشێوەیەك هاوار دەكا و دەقیژێنی، هەمو شتێك جگە لە مرۆڤ و جنۆكە دەیبیستێ. ئەوجا

---

[1] ئەم بێژەیە و زۆري دیكەش لە فەرمودان وەرامن بۆ ئیبنو عەبدولبەڕ و سیوطی و حەكیمی تیرمیذی و ئەوانی لەسەر ڕاڕەوي ئەمانەن كە دەڵێن ئەشكەنجەی گۆڕ بۆ بڕواداري یاخییە، نەك بۆ بێبڕوایان.

دەرگایەکی لە ئاگر بۆ دەکرێتەوە و، نوێنی ئاگرینی بۆ ڕادەخرێ، دەڵێ: پەروەردگارم، با قیامەت هەڵنەستێ و ڕانەبێ))[1].

لە فەرمودەی ئەنەسیشدا هاتوە، ئەگەر بەندەی بڕوادار لەگۆڕەکەیدا وەرامێکی ڕاست و دروستی دایەوە: ((يقال له: انظر الى مقعدك من النار، ابدلك الله به مقعــدا مــن الجنة: پێی دەگوترێ: تەماشای شوێنی خۆت بکە لەنێو ئاگردا، خودا بە شوێن و نشینگەیەکی بە هەشتێ بۆی گۆڕیەوە)). پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((فيراهما جميعــا: جا هەردوکیان دەبینێ)). قەتادە دەڵێ: باسی ئەوەشی بۆمان کرد کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێ. هەروەها لە فەرمودەی ئەنەس باسی ئەوەی فەرموە؛ پاش ئەوەی بێبڕوا و دوڕو وەرامی ناڕاست و درۆ دەدەنەوە، پێیان دەگوترێ: ((لا دريــت ولا تليت، ثم يضرب بمطرقة من حديد ضربة بين أذنيه، فيصيح صيحة يسمعها من يليه الا الثقلــين: نەزانیت و نە لاسای ئەوانەشت کردەوە کە دەیانزانی، پاشان گورزێکی ئاسنینی دەخێوێننە نێوان هەردو گوێی، لە تاوان وادەقیژێنێ لە مرۆڤ و جنۆکە بترازێ هەمو شتێك دەیبیسێ))[2].

لەلای موسلیمیش بەم شێوەیە هاتوە: ((ان العبــد اذا وضــع في قــبره: کە بەندە دەخرێتە نێو گۆڕەکەی))، ئەوجا شتێکی وەکو ئەوەی سەرەوەی باسکردوە و، ئەوجا دەفەرموێ: ((انه يفسح فيه سبعين ذراعا، ويملاء عليــه خضــرا الى يــوم تبعثــون: گۆڕەکەی هەفتا باڵ بۆ فراوان دەکرێ و، تا ڕۆژی ژیانەوە بۆی پڕ لە سەوزایی دەکرێ)). لە گێڕانەوەیەکی ئەبوداودیشدا هاتوە، بەندەی بڕوادار پاش ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێ و وەرام دەداتەوە؛ ((ينطلق به الى بيت كان له في النار، فيقال له هــذا كان لك، ولكن الله عصمك فأبدلك به بيتا في الجنة، فيراه فيقول: دعوني أذهب فأبشر اهلــي، فيقول له: اسكن: بەرەو ئەو ماڵەی دەبردرێ کە لەنێو ئاگردا بۆی ئامادە کرابو، جا پێ دەگوترێ: ئەمە بۆ تۆ بو، بەڵام خودا تۆی پاراست و بە ماڵێکی بەهەشتێ بۆی گۆڕیەوە، کە ماڵەکەی دەبینێ دەڵێ: لێم گەڕێن تا بچم مزگێنی بدەمە خانەوادەم،

---

[1] فەرمودەیەکی صەحیحە پێشتر لە لاپەرە ٢٨ تەخریج کراوە.
[2] اخرجه البخاري ومسلم ولفظ الحديث للبخاري.

**پێی دەگوترێ: داسەکنێ))**[1].

**ئەمەی کە فەرمودەکان ئاماژەی پێدەکەن، کە هەمو مرۆڤێك پاش پرسیاری گۆڕ نشینگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ، ئەمە بەدرێژایی ماوەی مانەوە لەنێو گۆڕدا بەردەوامە. پێغەمبەرﷺیش بەراشکاوی باسی ئەمەی فەرموە. لەو فەرمودەی کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنه دەیگێڕتەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((ان احدكم اذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي، ان كان من اهل الجنة فمن اهل الجنة وان كان من اهل النار فمن اهل النار، فيقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة: **یەکێکتان ئەگەر بمرێ، سبەینان و ئێواران نشینگەکەی پێ نیشان دەدرێ، ئەگەر لە بەهەشتیان بو، ئەوا لە بەهەشتێ و، ئەگەر لە دۆزەخیانیش بو، لە دۆزەخ. جا پێیدەگوترێ: ئەمە شوێن و نشینگەتە تا خودا زندوت دەکاتەوە لە رۆژی قیامەتدا))**[2].

**لەسونەنی تیرمیذیشدا لە ئەبوهویرە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە؛ بەندەی بڕوادار کە وەرامی ڕاست و ڕەوان دەداتەوە، هەردو فریشتەکە پێی دەڵێن:** ((قد كنا نعلم انك تقول ذلك، ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعا في سبعين، ثم ينور له فيه، ثم يقال له: نم، فيقول: ارجع الى اهلي فأخبرهم، فيقولان: نم كنومة العروس الذي لا يوقظه الا احب اهله اليه، حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك: **دەمانزانی تۆ وا دەڵێی. پاشان هەفتا باڵ بەهەفتا باڵ گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ، ئەوجا بۆی ڕوناك دەکرێتەوە، جا پێی دەڵێن: بنو، دەڵێ: بابگەڕێمەوە نێو خانەوادەکەم و پێیان بڵێم، پێی دەڵێن: بنو وەکو ئەو زاوایەی خۆشەویسترین کەسی خانەوادەی نەبێ وەئاگای ناهێنێ. تاخودا لەو شوێنەدا زندوی دەکاتەوە کە تێی ڕاکشاوە)).. هەروەها فریشتەکان بە دوڕوان دەڵێن:** ((قد كنا نعلم انك تقول ذلك، فيقال للأرض: التئمي عليه، فتلتئم عليه، فتختلف اضلاعه، فلا يزال معذباً حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك: **دەمانزانی تۆ وا دەڵێی.**

---

[1] سەیري گێرانەوەکانی ئەم فەرمودەیە لە (جامع الاصول): (١١/١٧٣).

[2] رواه البخاري، كتاب الجنائز، باب الميت يعرض عليه مقعده في الغداة والعشي، فتح الباري: (٣/٢٣٤)، ورواه مسلم في كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار، (٤/٢١٩٩) حديث رقم (٢٨٦٦).

جا بە زەوی دەگوترێ: بەسەریدا یەك بگرەوە، زەوی خۆی لێكدەدا، پەراسوەكانی تێك دەپەڕن. هەر ئەشكەنجە دەدرێ هەتا خودا لەو شوێنەدا زندوی دەكاتەوە كە تێیدا ڕاكشاوە))[1].

## خوازگەی سێیەم

## ئایا موسڵمانان لەنێو گۆڕەكانیاندا ئەشكە نجە دەدرێن

قورطوبی دەڵێ: (ئەبو موحەممەدی عەبدولحەق دەڵێ: بزانە كە ئەشكەنجەی گۆڕ بە بێبڕوایان تایبەت نیە، لەئاست دوڕوانیش كورت هەڵنەهاتوە، بەڵكو كۆمەڵێكی بڕوادارانیش هاوبەشیانن، جا هەریەكەو لەسەر حاڵ و باری كردەوەی خۆی و، بەقەدەر ئەوەی گوناه و تاوانەكانی بۆی دەرەخسێنن)[2] ، بەڵگەش بۆ ئەشكەنجەدانی بڕوادار لەنێو گۆڕەكەیدا بەهۆی تاوانە زۆرەكانی لە جێباسی داهاتودا باسی هێندێكیان دەكەین.

## خوازگەی چارەم

## هۆیەكانی ئەشكە نجەی گۆڕ

(ئەو هۆیانەی گۆڕنشینانی پێ ئەشكەنجە دەدرێن دو بەشە؛ تێكڕا و تاك تاك. بەتێكڕای بەهۆی بێ ئاگایی لە خودا و بەفێڕۆدانی فەرمانەكانی و یاخیبونێ ئەشكەنجە دەدرێن)[3].

هەرچی هۆیە تاك تاكەكانیشن لە دەقەكاندا زۆریان لێ باس كراوە، جا ئاماژە بۆ ئەوانە دەكەین كە لە فەرمودانداا باسیان بەرچاومان كەوتوە:

---

[1] حديث حسن رواه الترمذي في سننه؛ كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر: (٣٨٣/٣) حديث رقم:١٠٧١.

[2] تذكرة القرطبي: ١٤٦

[3] لوامع الأنوار البهية: (١٧/٢).

## ٢.١- خۆ پاك نەكردنەوە لە میز و دوزمانی كردن:

بوخاری و موسلیم لە صەحیحەكانیاندا لە ئیبنی عەبباسەوە ﵄ دەگێڕنەوە دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ بەلای دو گۆڕاندا چو، فەرموی: ((انهما ليعذبان وما يعذبان في كبير: ئەوانە ئەشكەنجە دەدرێن، لەبەر كردەوەی گەورەش نیە كە ئەشكەنجە دەدرێن))، پاشان فەرموی: ((بلى، اما احدهما فكان يسعى بالنميمة واما الآخر فكان لايستتر من بوله: بەڵێ، یەكێكیان دوزمانی دەكرد و ئەوی تریان خۆی لە میز پاك نەدەكردەوە)). ئەوجا دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ شولێكی تەڕی هێناو كردیە دو پارچە و، هەر پارچەیەكی لە گۆڕێكیان چەقاند، ئینجا فەرموی: ((لعله يخفف عنهما، مالم ييبسا: بەڵكو ئەشكەنجەیان سوك كا، هەتا وشك نەبون))[1].

هەروەها نەسائی لە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ((ژنە جولەكەیەك هاتە لام، گوتی: ئەشكەنجەی گۆڕ لە میزەوەیە، منیش پێم گوت: درۆ دەكەی، گوتی: بەڵێ، ئێمە پێستە و پۆشاكمان لێ دەقرتاند. لەو دەمەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژ هاتە دەرێ و، ئێمەش دەنگمان بەرز ببۆوە. فەرموی: ((ماهذا؟: ئەمە چیە؟)). منیش پێم گوت كە ژنە جولەكەكە چی گوتوە. فەرموی: ((صدقت: ڕاستی گوتوە)). عائیشە گوتی: لەدوای ئەو ڕۆژەوە، پێغەمبەر ﷺ لەپاش هەمو نوێژەكانی دەیفەرمو: ((رب جبرائيل وميكائيل واسرافيل اعذني من حر النار وعذاب القبر: پەروەردگاری جوبرائیل و میكائیل و ئیسرافیل پەنام بدە لە گەرمی ئاگر و لە ئەشكەنجەی گۆڕ))[2].

جا ئەوەی فەرمودەكە ئاماژەی پێكردوە كە بەنی ئیسرائیل پێستە و پۆشاكیان لەبەر میز دەقرتاند، بەشێكە لەو دینەی خودای بەرز بۆی بڕیاردابون، جا كە یەكێك بەرهەڵستی لێ دەكردن وامەكەن بەهۆی ئەو بەرهەڵستیەی لە گۆڕەكەیدا ئەشكەنجە دەدرا. لە فەرمودەی عەبدوڕەحمانی كوڕی حەسەندا هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ

---

[1] رواه البخاري واللفظ له؛ كتاب الجنائز، باب عذاب القبر من الغيبة والبول؛ فتح الباري: (٢٤٢/٣)، ورواه مسلم في كتاب الإيمان، باب الدليل على نجاسة البول؛ (٢٤٠/١)، حديث رقم (٢٩٢) ورواه النسائي: (١٠٦/٤).

[2] رواه النسائي في سننه، انظر جامع الاصول: (١٧٦/١١).

فەرموی: ((الم تعلموا ما لقي صاحب بني اسرائيل، كانوا اذا اصابهم البول قطعوا مـــا اصابـه البول منهم، فنهاهم عن ذلك، فعذب في قـــبره: نـەتانزانیوە هاوەڵەکەی بەنی ئیسرائیل چی بەسەرهات؟ پێشتر ئەگەر پریشکە میزێکیان پێ کەوتبا ئەو پارچەشمەکەیان دەبڕی کە پریشکەکەی پێکەوتبو، ئەویش بەرهەڵستی ئەو کردەوەی کردن، بۆیە توشی ئەشکەنجەی گۆڕ بو)).[1]

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ هـەواڵی پێداویـن کـە بـە گشـتی ئەشـکەنجەی گـۆڕ لـە میزەوەیە، ئەنەس ﵁ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕتەوە کە فەرموی: ((تنـــزهوا من البـــول، فان عامة عذاب القبر منه: خۆتـان لـە میز پاك بکەنـەوە، چونکە بەگشتی ئەشـکەنجەی گۆڕ لەمیزەوەیە)). ئیبنی عەبباسیش بەم بێژەیە دەیگێڕتەوە: ((عامة عذاب القبر مـــن البول فتنـــزهوا منـــــه: بەگشتی ئەشکەنجەی گۆڕ لـە میزەوەیە، جا خۆتـانی لێ پـاك بکەنەوە)). ئەبو هورەیرەش بەم بێژەیە دەیگێڕتەوە: ((اكثر عذاب القبر مـــن البـــول: زۆربەی ئەشکەنجەی گۆڕ لەمیزەوەیە)).[2]

٣- دزی لە غەنیمەت:

یەکێك لەو گوناهانەی خاوەنەکەی دوچاری ئەشکەنجەی نێو گۆڕ دەکات، دزی کردنە لە غەنیمەت. زیاتر لە فەرمودەیەکی صەحیحیش لەم بارەیە هاتوە، لـە ئەبو هورەیرەوە، دەڵێ: (پیاوێك، جەوانێك(غلام)ی بۆ پێغەمبەرﷺ کردە دیاری کە ناوی میدعەم بو، کاتێك میدعەم خەریك بو بارێکی پێغەمبـەرﷺی دادەبـەزاند، تـیرێکی لابـەلای پێکـەوت و کوشـتی، خـەڵکی گوتیـان: بەهەشـت نۆشـی گیـانی بـێ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((كلا، والذي نفسي بيده ان الشملة التي اخذها يوم خيبر من المغانم لم تصبها المقاسم، لتشتعل عليه نارا: نەخێر، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەو

---

[1] عزاه في صحيح الجامع (١/٤١٦) الى ابي داود والترمذي، وابن ماجة وابن حبان والحاكم.

[2] قد اخرجه الشيخ ناصر في (ارواء الغليل) وقال: صحيح، وعزا رواية أنس الى الدارقطني ورواية ابن عبـاس الى الدارقطني والحاكم والبزار والطبراني ورواية ابي هريرة الى ابن ابي شيبة وابن ماجة والآجـري والحـاكم واحمد، انظر الغليل: (١/٣١١) وحديث رقم (٢٨٠).

**شەملە[1] یەی لە رۆژی خەیبەر لەنێو غەنیمەتە دابەش نەکراوەکان بردبوی، ئێستا لەسەری گڕی ئاگری لێ هەڵدەستێ)). جا کە خەڵکی ئەمەیان بیست، پیاوێك قەیتانێك یا جوتە قەیتانێکی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((شراك من النار أو شراكين من النار: **قەیتانێك لە ئاگر یا جوتە قەیتانێکی ئاگرین)).**[2]

**لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە،** (دەڵێ: **پیاوێك لەسەر بارەکەی پێغەمبەر ﷺ بو بە کیرکیرە ناویان دەبرد، ئەو پیاوە مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((هو في النار: **ئەوە لە ئاگری دەکەوێ)). خەڵکی چون سەیریان کرد، عەبایەکیان دیتەوە لە غەنیمەتی دزی بو)**[3].

### ٤-٧ درۆ. واز لە قورئان هێنان. زینا. سوخۆری:

**خودای بەرز چەند جۆرە ئەشکەنجەیەکی بە پێغەمبەرەکەیﷺ پێشان دا کە هێندێك لە یاخیانی پێ ئازار دەدا. لە صەحیحی بوخاریدا لە سەمورەی کوڕی جوندوب هاتوە:** ((كان النبي ﷺ إذا صلى صلاة أقبل علينا بوجهه فقال: من رأى منكم الليلة رؤيا؟ قال: فإن رأى أحد قصها، فيقول ما شاء الله..

فسألنا يوماً فقال: هل رأى أحد منكم رؤيا؟ قلنا: لا، قال: لكني رأيت الليلة رجلين أتياني، فأخذا بيدي فأخرجاني إلى الأرض المقدسة، فإذا رجل جالس ورجل قائم بيده كلوب من حديد — قال بعض أصحابنا عن موسى: كلوب من حديد يدخله في شدقه— حتى يبلغ قفاه، ثم يفعل بشدقه الآخر مثل ذلك، ويلتئم شدقه هذا، فيعود فيصنع مثله.

قلت: ما هذا؟ قالا: انطلق، فانطلقنا حتى أتينا على رجل مضطجع على قفاه، ورجل قائم على رأسه بفهر أو صخرة فيشدخ به رأسه، فإذا ضربه تدهده الحجر، فانطلق إليه ليأخذه فلا يرجع إلى هذا حتى يلتئم رأسه وعاد رأسه كما هو، فعاد إليه فضربه.

---

[1] شەمەە (الشملة) پۆشاکێکی فراوانە، هەمو لەش دادەپۆشێ. -وەرگێڕ-

[2] متفق عليه؛ مشكاة المصابيح: (٢/٤٠١).

[3] رواه البخاري؛ مشكاة المصابيح: (٢/٤٠٢).

قلت: من هذا؟ قالا: انطلق، فانطلقنا إلى ثقب مثل التنور أعلاه ضيق وأسفله واسع يتوقد تحته ناراً، فإذا اقترب إرتفعوا حتى كادوا أن يخرجوا، فإذا خمدت رجعوا فيها، وفيها رجال ونساء عراة.

فقلت: من هذا؟ قالا: انطلق، فانطلقنا حتى أتينا على نهر من دم، فيه رجل قائم، على وسط النهر -قال يزيد و وهب بن جرير عن جرير بن حازم: وعلى شط النهر- رجل بين يديه حجارة، فأقبل الرجل الذي في النهر، فإذا أراد أن يخرج رمى الرجل بحجر في فيه فرده حيث كان، فجعل كلما جاء ليخرج رمى في فيه بحجر فيرجع كما كان.

فقلت: ما هذا؟ قالا: انطلق. فانطلقنا حتى انتهينا إلى روضة خضراء فيها شجرة عظيمة، وفي أصلها شيخ وصبيان، وإذا رجل قريب من الشجرة بين يديه نار يوقدها، فصعدا بي في الشجرة وأدخلاني دارا لم أر قط أحسن منها، فيها رجال شيوخ وشباب ونساء وصبيان، ثم أخرجاني منها فصعدا بي الشجرة فأدخلاني دارا هي أحسن وأفضل، فيها شيوخ وشباب.

قلت: طوفتماني الليلة فأخبراني عما رأيت. قالا: نعم، أما الذي رأيته يشق شدقه فكذاب يحدث بالكذبة فتحمل عنه حتى تبلغ الآفاق، فيصنع به ما رأيت إلى يوم القيامة. والذي رأيته يشدخ رأسه فرجل علمه الله القرآن، فنام عنه بالليل ولم يعمل فيه بالنهار، يفعل به إلى يوم القيامة. والذي رأيته في الثقب فهم الزناة. والذي رأيته في النهر آكلوا الربا. والشيخ في أصل الشجرة إبراهيم ﷺ والصبيان حوله أولاد الناس. والذي يوقد النار مالك خازن النار. والدار الأولى التي دخلت دار عامة المؤمنين وأما هذه الدار فدار الشهداء. وأنا جبريل وهذا ميكائيل. فارفع رأسك. فرفعت رأسي فإذا فوقي مثل السحاب، قالا: ذاك منزلك، قلت: دعاني أدخل منزلي، قالا: إنه بقي لك عمر لم تستكمله، فلو استكملت أتيت منزلك:

**کاتێك پێغەمبەرﷺ نوێژێکی دەکرد، ڕوی لە ئێمە دەکرد و دەیفەرمو: کێ لەئێوە ئەمشەو خەونێکی دیتیە؟ دەڵێ: جا ئەگەر یەکێك دیتبای دەیگێڕاوە، ئەویش ئەوەی خوا ویستی لەسەربا دەیفەرمو.**

**ڕۆژێکیان لێمانی پرسی: کەستان خەونتان دیوە؟ گوتمان: نەخێر، فەرموی: بەڵام من ئەمشەو دو پیاوم دیتن هاتنە لام دەستیان گرتم و بۆ زەوی پیرۆزیان بردم،**

دیتم پیاوێك دانیشتوه و پیاوێك به پێوەیە مامزە(قولاب)ێکی ئاسنینی لە دەستی دایە، لە لێواری لێوی گیردەکا تا پشتە ملی هەڵیدەزڕێنێ، پاشان لا شەویلاگەکەی تریش والێدەکات و، ئەم لاشەویلاگەی یەکەمی یەك دەگرتەوە، دیسان وای لێدەکاتەوە.

گوتم: ئەمە چیە؟ گوتیان: بەڕێکەوە. بەڕێکەوتین تا گەیشتینە پیاوێك لەسەر پشت ڕاکشابو، پیاوێکیش لەسەر سەری ڕاوەستابو، دەسکە جۆنیەك یا بەردێکی لە دەستە، پێی لەسەری دەدا و دەیشکێنێ، جا کە لێی دەدا بەردەکە گلۆر دەبتەوە، دەچێ و دەیهێنێتەوە، هێشتا نەگەڕاوەتەوە، ئەمەیان سەری یەکدی گرتوەتەوە و هاتۆتەوە دۆخی جارانی، ئەویش دێتەوە سەر لێدانی.

گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: بەڕێکەوە. بەڕێکەوتین تا گەیشتینە کونێکی وەك تەندور کە سەروەکەی تەسك بو ژێرەوەشی فراوان، ئاگری لەبن هەڵکرابو، پیاو و ژنی ڕوتی تێدابون، کە ئاگرەکەیان لێ وەنزیك دەکەوت، هەڵدەکشان تا هێندەی نەدەما بێنە دەرێ، کە داشدەمرکا دەچونەوە ناوی.

گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: بەڕێکەوە. جا بەڕێکەوتین تا گەیشتینە ڕوبارێکی خوێن، پیاوێکی تێدا ڕاوەستابو، پیاوێکیش لە لێواری ڕوبارەکە بو، کۆمەڵە بەردێکی لەبەردەستان بو، کە پیاوەکەی ناو ڕوبارەکە دەهاتە پێش و دەیویست بێتە دەرێ، ئەوی سەر لێوار بەردێکی لە دەمی دەهاوێشت و دەیگێڕایەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتبو، جا هەرجارێکی بیویستبا بێتە دەرێ بەردێکی لەدەمی دەهاویشت و دەیگێڕایەوە باری جاران.

گوتم: ئەمە چیە؟ گوتیان: بەڕێکەوە. جا بەڕێکەوتین تا گەیشتینە مێرگێکی سەوز کە دارێکی مەزنی تێدابو، پیرێك و کۆمەڵە پارچەڵەیەك(صبیان) لەبن دارەکە بون، پیاوێکیش نزیکی دارەکە بو خەریکی ئاگر کردنەوە بو، جا بەسەر دارەکەیان خستم و، لە خانوێك بردمیانە ژور، هەرگیز شوێنی وا خۆشم نەدیوە، پیرەمێرد و لاو و ژن و پارچەڵەی تێدابون، پاشان لەوێ هێنامیانە دەرێ و لە دارەکە سەریان خستم تا لە خانوێکی خۆشتر و چاکتر بردمیانە ژور، پیرو لاوی تێدابون.

گوتم: ئەمشەو منتان گێڕا، جا باسی ئەو شتانەم بۆ بکەن کە دیتم. گوتیان: بەڵێ. هەرچی ئەوەبو کە دیتت شەویلاگی هەڵدەزڕێنرا، ئەوە درۆزنێکە، درۆیان دەکا و لێی دەگێڕنەوە تا لەنێو خەڵکیدا بڵاودەبتەوە، چۆنت دیت وای لێ دەکرێ هەتا رۆژی قیامەت.

ئەوی سەریشی دەشکێنرا، پیاوێك بو خوا قورئانی فێرکردبو، ئەویش بەشەوێ لێی نوستبو و بەرۆژیش کردەوەی پێ نەکردبو، تارۆژی قیامەت وای لێ دەکرێ.

ئەوانی لە کونەکەش دیتنت، زیناکاران بون. ئەوەی لە روبارەکە دیتت سو(ریبا)خۆران بو. ئەو پیرەی لە بن دارەکەش بو، ئیبراهیم ﷺ بو، پارچەڵەکانیش منداڵی خەڵکی بون. ئەوی ئاگری هەڵدەکرد مالیکی ئاگرەوان بو، ئەو خانەیەی یەکەم جار چویە ناوی، خانوی رەشۆکی بڕوادارانە و، ئەم خانەیەش خانەی شەهیدانە و، منیش جیبرائیلم و، ئەمەش میکائیلە. جا سەرت بەرزکەوە. سەرم بەرزکردەوە وەکو هەورێك لەژور سەرم بو، گوتیان: ئەوە نشینگەی تۆیە. گوتم: لێم گەڕێن بچمە ماڵی خۆم، گوتیان: بڕێك تەمەنت ماوە تەواوی کەی، کە تەواوت کرد دێیتە مەنزلگای خۆت.))[1]

## بەند کردنی قەرزار لە گۆڕدا بەهۆی قەرزەکەی

ئەو قەرزەی لەسەر مردوە، لە گۆڕەکەیدا زیانی پێدەگەیەنێ. لە سەعدی کوڕی ئەطوەل رضي الله عنه هاتوە کە برایەکی مردوە و سێصەد درهەم و منداڵەکانی جێهێشتبو، دەڵێ: جا ویستم ماڵەکە لە منداڵەکانی خەرج بکەم، دەڵێ: بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: ((ان اخاك محبوس بدينه، [فأذهب] فاقض عنه: برایەکەت بە قەردەکەی بەندکراوە. جا بڕۆ قەرزەکەی بدەوە))، چوم و قەرزەکەم داوە و هاتمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، قەردەکەیم داوە تەنیا دو دینار نەبێ کە ژنێك داوای دەکاتەوە و

[1] اخرجه البخاري في كتاب الجنائز. فتح الباري: (٣/٢٥١)

هیچ بەڵگەشی نیە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اعطـها فانهـا محقـة: بیدەوە، خاوەن حەقە)).[1]

جا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە ئەم هاوەڵە بە هۆی قەرزەکەی بەندکراوە. دەکرێ ڕاڤەی ئەم بەندکردنە بکەین بەم فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: ((انه مأسور بدینه عن الجنة: ئەوە بەهۆی قەرزەکەی دیل کراوە و ڕێی بەهەشتی لێ گیراوە)). هەروەك لەو فەرمودەیە هاتوە کە سەمورەی کوڕی جوندوب دەیگێڕێتەوە: (پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر تەرمێك کرد [لە گێڕانەوەیەکی‌تر: نوێژی بەیانی کرد]، کە تەواو بو فەرموی: ((اههنا من آل فلان احـد؟: ئایا لە خانەوادەی فلانی کەس لێرە هەیە؟)). خەڵکەکە بێدەنگ بون، -چونکە ئەگەر قسەیەکی فەرمویا بێدەنگ دەبون-. سێ جاران ئەمەی دوبارە کردەوە کەس وەڵامی نەداوە، پیاوێك گوتی: ئەوە هەوە. جا پیاوێك لە پشت خەڵکەوە هەستا دامێنی کراسەکەی لە دو خۆی ڕادەکێشا. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (([مامنعك في المرتين الاولیین ان تكون أجبتني؟] اما إني لم انوّه باسمك الا لخـیر، ان فلانا -لرجل منهم- مأسور بدینه [عن الجنة، فان شئتم فأفدوه، وان شئتم فأسلموه الى عـذاب الله]، فلو رأیت اهله ومن یتحرّون امره قاموا فقضوا عنه، [حتى ما أحد یطلبه بشـيء]: ئەدی چی ڕێی لێ گرتی لە دو جارەکەی پێشو وەرامم بدەیەوە؟ بۆیە ئامـاژەم بە ناوت نەکرد چونکە خێری تێدابو، فلانەکەس -پیاوێك بوە لەوان- بە قەرزەکەی دیل کراوە و، ڕێی بەهەشتی لێگیراوە. ئەگەر دەتانەوێ قەرزەکەی بدەنەوە، ئەگەر حەزیش دەکەن بیدەنە دەست ئەشکەنجەی خودا، جا ئەگەر یەکێکت دیت لە خانەوادەی وی و لەوانی بەدوای کاری ویدا دەگەڕێن با قەرزەکەی بدەنەوە، تا کەس هیچی لەسەر نامینێ)).[2]

---

[1] قال شیخ ناصر في احكام الجنائز (ص:١٥): اخرجه ابـن ماجـة (٨٢/٢)، و احمـد (١٣٦/٤، ٧/٥) والبیهقي (١٤٢/١٠)، واحد اسانیده صحیح، والآخر مثل اسناده عند ابن ماجة، و صححه البوصـیري في (الزوائد)، و سیاق الحدیث والروایة الثانیة للبیهقي، وهي والزیادات لأحمد في روایة.

[2] قال شیخ ناصر في احكام الجنائز (ص ١٥): اخرجه ابوداود (٨٤/٢)، والنسـائي (٢٣٣/٢) والحـاكم (٢٦،٢٥/٢)، والبیـهقي (٧٦/٤/٦) والطیالسـي في مسـنده (رقـم ٨٩١، ٨٩٢) وكـذا احمـد (١١/٥، ١٣، ٢٠) بعضهم عن الشعبي عن سمرة، وبعضهم ادخل بینهما سمعان بن مشنج، وهو على وجـه

## ئەشکەنجەی مردو بەگریانی زندوان

**کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پێکرا، صوهەیب بەگریانەوە هاتە لای و دەیگوت: وەی برا ڕۆ، هاوەڵی شیرینم ڕۆ. عومەر ﷺ فەرموی: تۆ لەسەرە من دەگری، سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((ان الميت يُعذّب ببعض بكاء اهله عليه: **بەڕاستی مردو بە هەندێك گریانی خانەوادەکەی لەسەری ئەشکەنجە دەدرێ**))[1].

**بەڵام عائیشە** (ڕەزای خوای لێبێ) **ڕەتی کردەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرمودەی فەرموبێ، لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە ئیبنی عەبباس، پاش کۆچی دوایی عومەر ﷺ ئەم گۆتەیەی وی بۆ عائیشە گێڕاوە. عائیشە گوتی: عومەر بەر میهری خودا بێ، سوێند بەخوا پێغەمبەری خواﷺ نەیفەرموە کە بڕوادار بەگریانی خانەوادەکەی لەسەری ئەشکەنجە دەدرێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((ان الله ليزيد الكافر عذاباً ببكاء اهله عليه، حسبكم القرآن ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾: **بەڕاستی خودا ئەشکەنجەی بێبڕوا بە گریانی خانەوادەکەی لەسەری زیاد دەکات، هێندەشتان بەسە کە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ**:﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ: **هیچ کەس باری تاوانی کەسی دیکە هەڵناگرێ**﴾[2]))[3] **جا عائیشە**(ڕەزای خوای لێبێ) **بە زیاتر لە ڕویەك ئەم فەرمودەی لێك داوەتەوە و، لە کتێبەکانی فەرمودەدا لێی دەگێڕنەوە.**[4]

---

→ الأول صحيح على شرط الشيخين، كما قال الحاكم و وافقه الذهبي، وعلى الوجه الثاني صحيح فقط، وقد ذكر الشيخ هناك من اخرج الروايات والزيادات.

[1] رواه البخاري، كتاب الجنائز، باب قول النبي : (يعذب الميت ببعض بكاء اهله عليه)؛ فتح الباري (١٥١/٣)، ورواه مسلم ايضا، انظر جامع الأصول (٩٢/١١).

[2] سورة الفاطر ١٨.

[3] صحيحح البخاري، كتاب الجنائز، انظر فتح الباري: (١٥١\٣)

[4] ئەگەر دەتەوێ سەیری ئەو لێکدانەوانە بکەی، سەیری (فتح الباري): (١٥١\٣)بکە.

**لێرەدا دو مەسەلە هەیە: یەکەمیان ئەوەیە، ئایا پێغەمبەرﷺ ئەوەی فەرموە؟ قورطوبی دەڵێ: کە عائیشە ئەوەی ڕەت کردۆتەوە و، بڕیاری داوە کە بگێڕەوەکە هەڵەی کردوە، یا لە بیری کردوە، یا بڕێکی بیستوە و هێندێکی نەبیستوە، ئەمانە دورن، چونکە بگێڕەوانی فەرمودەی بەم مانایە لەنێو هاوەڵاندا زۆرن و دڵنیاشن، جا ڕوی نەرێ کردنی نیە و، لەگەڵ ئەوەی ئەگەری بە صەحیح دانانیشی دروستە)**[1].

**دوەمیان: چۆن بەهۆی گریانی کەسوکاری ئەشکەنجە دەدرێ کە بەشێك نیە لە کردەوەی خۆی. خودای بەرزیش دەفەرمێ:**

﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى: **هیچ کەس باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ**﴾.[2]

**زانایان گەلێك وەرامیان لەم بابەتەوە هەیە، چاکترینیان ئەوەیە کە بوخاری لەژێر سەرناوی ئەو دەروازەیەدا کە ئەم فەرمودەیەی لەژێر داناوە دەڵێ: (دەروازەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەشکەنجەدانی مردو بە ناورانەوە(سەردولکە)ی کەسوکاری لەسەری، ئەگەر بەخۆی خوی بە ناورانەوە(سەردولکە) گرتبێ) لەبەر ئەو ئایەتە پیرۆزەی دەفەرموێ:** ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَــاراً: **خۆتان و کەسوکارتان لە ئاگر بپارێزن.**﴾[3]. **پێغەمبەریش دەفەرموێ:** ((كلكم راع و مسؤول عن رعيته: **هەریەکەتان شوان و لە ڕەعیەتەکەی بەرپرسە**)). **ئەگەر مردو پێشتر خوی بە سەردولکە و لاواندنەوە نەگرتبێ، ئەوا عائیشە** (ڕەزای خوای لێبێ) **چۆنی گوتوە وایە،** ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[4].

**هەروەها تیرمیذیش هەمان ڕاو بۆچونی هەبوە و فەرمودەکەی عومەر دەگێڕێتەوە بە بێژەی** ((الميت يعذب ببكاء اهله عليه: **مردو ئەشکەنجەی دەدرێ بەهۆی گریانی خانەوادەکەی لەسەری**)). **پاشان دەڵێ: فەرمودەکەی عومەر جوان و صەحیحە و، کۆمەڵێك لە زانایان حەزیان بەگریانی سەر مردوان نەکردوە، دەڵێن: مردو**

---

[1] فتح الباري: (١٣\١٥٤)

[2] سورة فاطر: ١٨

[3] سورة التحريم: ٦.

[4] انظر فتح الباري (١٥٠/٣)

ئەشکەنجە دەدریّ بە گریانی کەسوکارەکەی لەسەری و، ئەم فەرمودەیان وەرگرتوە. ئیبنی موبارەك دەڵێ: بەهیوام ئەگەر مردو لە ماوەی ژیاندا بەرهەڵستی گریان و سەردولکەی لە خانەوادەکەی کردبێ، دوای مردنی چ ئەشکەنجەی نێتە سەر)[1]

ئەم شێوە لێکدانەوەی فەرمودەکە هەمان ڕاوبۆچونی قورطوبیشە، کە دەڵێ: (زۆربەی زانایان دەڵێن: مردو کاتێك بەهۆی گریانی زندو ئەشکەنجە دەدریّ ئەگەر دابی خۆی گریان و لاواندنەوە بوبیّ و ئەوەی هەڵبژاردبێ، هەروەك دەڵێ:

إذا انا مت فأنعيني بما أنا أهله وشقي عليّ الجيب يا ابنة معبد

واتە: ئەگەر ئەمن مردم چی لەمن دەوەشێتەوە وا بملاوێنەوە و، یەخەی خۆتم بۆ دادڕە هۆ کچی معبد.

هەروەها ئەگەر وەسیەت بکا پاش مردن لەسەری بگرین.[2]

سەردولکە و لەڕودان و خۆڕنینەوەو بەرۆك دڕاندن لە سیفەتی نەفامان بو، ئیبنی ئەثیر دەڵێ: (وەسیەتیان بۆ کەسوکار و خانەوادەی خۆیان دەکرد کە لە سەریان بگرین و سەردولکەی بۆ بڵێن و، تازیەباری لە گەڕەکاندا بڵاوبکەنەوە. ئەم کارەش لەناویاندا زۆر باوبو، لە هۆنراوەکانیشیاندا زۆر ڕەنگی داوەتەوە، مردو بەهۆی هەندێ ئەشکەنجە دەدریّ چونکە لە ژیاندا داوای کردبو)[3].

لێرەشدا دەبێ ئاگامان لە بێژەکەی بوخاری بێ؛ ((يعذب ببعض بكاء اهله عليه: بەهەندێك گریانی کەسوکارەکەی ئەشکەنجە دەدریّ)). نەك بە هەمو گریانێك. ئەو گریانەی کە هەر ئەشك و فرمێسك ڕێژی چاوانە و، لە خۆدان و خۆڕنینەوەی لەگەڵ نیە، چ زیان بەخاوەنەکەی ناگەیەنێ، گەلێك دەقیش لەم بابەتە هاتون.

ئیبنی تەیمیەش باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە و بۆچونی بوخاری و قورطوبی و ئیبنیعەبدلبەڕ و هاوڕاکانی ئەوانەی بەلاواز داناوە لەتێگەیشتنی ئەو فەرمودانەی باسی ئەوەیان کردوە کە مردی بە گریانی زندوان ئەشکەنجە دەدریّ. جا پاش

---

[1] سنن الترمذي: (٣\٣٢٦)

[2] التذكرة للقرطبي: (١٠٢)

[3] جامع الاصول لابن كثير:(١٠٢)

ئەوەی ئەو دەقانەی هاوردوە کە لەم روەوە هاتون، دەڵێ: (کۆمەڵانێك لە پێشین و پاشینان ئەمەیان ڕەتکردۆتەوە و، بیروباوەڕیان وابوە کە ئەمە وەبەر ئەشکەنجەدانی مرۆڤ بەهۆی گوناهی غەیری خۆی دەکەوێ، ئەمەش پێچەوانەی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، ئینجا رێگەی جۆراوجۆریان گرتەبەر لە ئاست ئەو فەرمودە صەحیحانە.

هەندێکیان بگێڕەوەکانیان بەهەڵە داناوە، وەکو عومەری کوڕی خەتتاب و بێجگە لەویش، ئەمەش ڕێچکەی عائیشە و شافیعی و کەسانی دیکەیە. هەندێکیش دەڵێن: مانای وایە ئەگەر کەسوکاری راسپارد لەسەری بگرین، بەهۆی وسیەتەکەی ئەشکەنجە دەدرێ، ئەمەش گۆتەی موزنی و کەسانێکی ترە.

هەندێکی دیکە دەڵێن ئەگەر داب و نەریتیان وابو ئەشکەنجە دەدرێ، چونکە لەکاتی ژیانیدا بەرهەڵستی ئەو خراپەیەی نەکردوە، ئەمەش بۆچونی هەندێکە لەوانەش ئەبولبەکارەتی باپیرم. هەمو ئەم گۆتانەش زۆر لاوازن.)[1]

هەروەها ئەوانەشی ڕەت کردۆتەوە کە بە جۆرە تەئویلێك ئەم فەرمودانە ڕەت دەکەنەوە و دەڵێ: (ئەو فەرمودە ڕاست و دروست و ڕاشکاوانەی یەکێکی وەك عومەری کوڕی خەتتاب دەیانگێڕتەوە، لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی و، ئەبو موسای ئەشعەری و هی دیکەش، بەم شێوەیە ڕەت ناکرێنەوە. عائیشەی دایکی بڕوادارانیش (رەزای خوای لێبێ) کاری بەم شێوەیەی هەن. فەرمودان بەجۆرێك تەئویل و کۆشین ڕەت دەکاتەوە، چونکە وای بۆ دەچی مانایان تەواو نیە، مەسەلەکەش وا نابێ، ئەوی لەم دەروازەیەش ورد بێتەوە، دەزانێ ئەم فەرمودە صەحیح و ڕاشکاوە کە بگێڕەوەیەکی خاوەن متمانە دەیگێڕێتەوە هەرگیز کەسێك گەر بەهەڵەدا نەچێ بەم جۆرە تەئویلانە ڕەتی ناکاتەوە).[2]

پاشان شێخ (بەرمیهری خواکەوێ)، ئەوەی ڕون کردۆتەوە کە عائیشە لەهەمان ئەو رایەی کەوتوە کە پێشتر ڕەتی کردۆتەوە، دەڵێ: (عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دو

---

[1] مجموع الفتاوي: (٢٥/٣٧٠)

[2] هەمان سەرچاوە: (٢٤/٣٧٠)

**بێــژەی لــە پێغەمبــەر ﷺ گێڕاوەتــەوە؛ بێگومــان لەهــەمو گێڕانەوەکانیشــیدا ڕاستگۆیە– لە یەکێکیان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان الله يزيد الكافر عذاباً ببكاء اهلـه عليه: خودا ئەشکەنجەی کافر زیاد دەکا بە گریانی کەسوکاری لەسەری)). ئەمەش دەگەڵ فەرمودەی عومەر کۆکە، جا ئەگەر بە گریانی کەسوکاری ئەشکەنجەی زیاد ببێ، دەگونجێ کە بێجگە لەو هەر لەسەرەتاوە بەهۆی گریانی کەسوکاری ئەشکەنجە بدرێ. بۆیە شافیعی لە (مختلـف الحديــث)دا لەبەر ماناکەی ئەو فەرمودەی ڕەت کردۆتەوەو، دەڵێ گێڕانەوەکەی تر پتر وێدەچێ: ((انهم يبكون عليه، وانه يعذب في قبره: ئەوان لەسەری دەگرین و، ئەویش لە گۆڕەکەیدا ئەشکەنجە دەدرێ)).)[1]**

**هەروەها قسەی ئەوانەشی ڕەت کردۆتەوە کە دەڵێن ئەم فەرمودەیە وادەگەیەنێ مرۆڤ بەگوناهی غەیری خۆی سزا دەدرێ، دەڵێ: (هێندێك لەوانەی فەرمودەکەیان وەرگرتوە، وا گومان دەبەن مانای وایە مرۆڤ بە گوناهی کەسانی دیکە سزا دەدرێ، خوداش ویستی چۆن بێ وادەکا و، چی بیەوێ وا بڕیار دەدا. جا بیروباوەڕی وان وایە کە مرۆڤ بەگوناهی غەیری خۆی سزا دەدرێ، بۆیەش پێیان وایە منداڵی بێباوەڕان بەگوناهی دایك و باوکیان دەچنە دۆزەخ)[2]. ئەوجا زۆر بە درێژی لەم بابەتە دواوە، ڕونی کردۆتەوە ئەو بۆچونە ڕاست نیە کە دەڵێ منداڵی کافر بە گوناهی داك وبابیان دەسوتێن. بەڵکو ڕەوا وایە کە خودا کەس ئەشکەنجە نادا بێجگە لەوانی لێی یاخی دەبن. ئەوانی لەدنیاش تاقی‌نەکراونەتەوە، لە مەیدانی قیامەتێدا تاقی دەکرێنەوە، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموە؛ مردو بە گریانی کەسوکاری سزا دەدرێ، بەڵکو فەرمویەتی (يعــــــذب: ئازار دەدرێ)، ئازار و ئەشکەنجەش لە سزا فراوان و گشتگرترە، ئەشکەنجە بریتیە لە ئێش و ژان، مەرج نیە هەر کەسێك بەهۆیەك توشی ژان بێ، ئەوە سزا بێ لە پای ئەو هۆکارە، پێغەمبەرﷺیش دەفەرموێ: ((السفر قطعة من العذاب، يمنع احدكــم طعامــه و شــرابه: سەفەر پارچە ئازارێکە، هەر یەکێکتان لە خواردن و خواردنەوە دەگرێتەوە)). جا سەفەری بە ئەشکەنجە و ئازار داناوە، دیارە کە سزاش نیە.**

---

[1] مجموع الفتاوى: (٢٤/٣٧١).

[2] هەمان سەرچاوە.

مرۆڤ له كاری نەخوازراو حەزپێنەكردو ئازار دەبینێ، بۆ نمونه بە بۆنی گەنی و بیستنی دەنگی گەورە و دیتنی وێنەی ناشیرین ئازار دەبینێ، دیارە ئەمەش لە پاش كردەیەكی نیە كە لەسەری سزا درابێ، جا چۆن ئازار و ئەشكەنجەی مردو بە سەردولكان بۆ وی دەبێتە سزا، لەكاتێكدا بەخۆی سەردولكە و لاواندنەوەی نەخواستبێ.

مرۆڤیش لە گۆڕەكەیدا بەهۆی قسەی هەندێ خەڵك ئازار دەبینێ و بە بیستن و دیتنی هەندێكی دیكە ئازار دەچێژێ، بۆیەش ئەبو یەعلای قازی فەتوای داوە بەوەی كە مردو ئێش و ژان دەچێژن ئەگەر گوناهیان لەلا ئەنجام بدرێ، هەروەك لە شوێنەواراندا(آثار) هاتوە، بۆیە بەگوناهكاری لەلای گۆڕەكانیان ئازار دەچێژن، هەروەكو بەگریان و سەردولكەی خانەوادەكەی ئازار دەچێژێ و، پاشان سەردولكەو گریانەكەش مایەی ئەشكەنجەكەیە)[1].

جا ئەم تێگەیشتنەی ئیبنی‌تەیمیەی زانا، لە هەندێك فەرمودەی پیرۆزیشدا هاتوە، لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە، دەڵێ: (عەبدوڵلای كوڕی رەواحە ﷺ لەخۆچو، (عەمرە)ی خوشكی دەستی بەگریان كرد و دەیگوت: كێوەكەم ڕۆ، فلانم ڕۆ، فلانم ڕۆ، دەیلاواندەوە و سەردولكەی بۆ دەگوت، ئەویش كە بەخۆ هاتەوە گوتی: هەر شتێكت دەگوت، پێم گوترا: ئەتۆ ئاوای؟! پاشان كە مرد، خوشكەكەی بۆی نەگریا)[2]. هەروەك ئەم واتایە بەڕاشكاوی لە فەرمودەیەكدا هاتوە كە ئەبو موسای ئەشعەری دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ما من ميت يموت، فيقوم باكية، فيقول: وا جبلاه! وا سيّداه! أو نحو ذلك، الاّ وكل به ملكان يلهزانه: أهكذا كنت؟: هەر مردویەك بمرێ، یەكێك لەسەری بگری و بڵێ: هۆ كێوەكەم ڕۆ! گەورە و سەروەرم ڕۆ، شتی دیكەی لەم شێوەیە، ئەسپاردەی دو فریشتان دەكرێ پێی دەڵێن: ئەتۆ وابوی))[3].

---

[1] مجموع الفتاوي: (٣٧٤/٢٤).

[2] رواه البخاري، كتاب المغازي، باب غزوة مؤتة.

[3] رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب: سنن الترمذي، كتاب الجنائز، باب ما جاء في كراهية البكاء على الميت، (٣٢٦/٣) حديث رقم (١٠٠٣). وقال الحافظ ابن حجر في التلخيص (١٤٠/٢)، حديث رقم (٨٠٦) بعد سياقه لهذا الحديث: (ورواه الحاكم وصححه، وشاهده في الصحيح عن النعمان بن بشير).

دەبێ لەوەش ئاگاداربین کە مەرج نیە هەر مردوێك سەرزولکەی بۆ بگوترێ پێی ئەشکەنجە بدرێ، چونکە هەروەك ئیبنی تەیمیە دەڵێ: ڕەنگە بەهۆکاری دیکە ئەو ئەشکەنجە و ئازارە لابدرێ، هەروەکو هەندێ کەس توانایان هەیە زیانی دەنگی گەورەو بۆنی گەنیو و وێنەی ناشیرین بگێڕنەوە. ئەوجا باسی ئەوە دەکات کە فەرمودەکانی گەڤوگوڕیان تێدایە، هۆکارەکانیشیان تێدا باس کراوە و، لەوانەیە لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت گەف و ئەشکەنجەکان لابدرێن، وەك؛ تۆبەیەکی قبوڵ کراو، یا چاکەی وا کە گوناهان بسڕێتەوە، یا بەڵاو بەسەرهاتی گوناه لابەر، یا بە شەفاعەتی شەفاعەتکارێك. یا بە بەزەیی و میهر و لێبوردنی خودا.

لە کۆتاییشدا ئەوەی ڕونکردۆتەوە، کەهەر ئازار و ئەشکەنجەیەك بەهۆی گریان و لاواندنەوە توشی بڕوادار بێ لە نێو گۆڕەکەیدا، دەبێتە مایەی لابردنی بڕێك لە گوناهەکانی.[1]

## خوازگەی پێنجەم

## ئەو شتانەی مایەی ڕزگار بونن لە ئاشوب و ئەشکە نجەی گۆڕ

مرۆڤ بەوە لە ئەشکەنجەی گۆڕ ڕزگار دەبێ کە خۆی بۆ ئامادە کردبێ و قوڵ و باسکی بۆ هەڵکردبێ، تاکو ئەگەر مردن لە هیکڕا هات پەنجەی پەشیمانی نەگەزێ. خۆسازدانیش بۆ مردن خێرا تۆبە کردن و دانەوەی مافەکان و زۆر چاکەکاریە، چونکە بڕواهێنان و نوێژ و ڕۆژی و زەکات و حەج و جیهاد و چاکەکاری لەتەك دایك و باب و پێوەندی خزماتی و یادی خودای بەرز و کردەوە چاکەکانی دیکە بەندەی بڕوادار دەپارێزن و، بەهۆی ئەمانەوە خودا لەهەمو تەنگانەیەك دەربازی دەکا و لەهەمو خەمێك دەریدێنێ.

پێغەمبەرﷺیش فەرمویەتی کە کردارە چاکەکان پاسی مرۆڤ دەکەن لە گۆڕەکەیدا. ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (لە فەرمودە بەناوبانگەکان، فەرمودەی

---

[1] مجموع الفتاوى: (٣٥٧\٤)

**موحەممەدی کوڕی عەمر، لە ئەبو سەلەمە، لە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەبو حاتەم لە صەحیحەکەی و پێشەواکانیش دەیگێڕنەوە، دەفەرموێ:**

((ان الميت ليسمع خفق نعالهم حين يولون عنه، فان كان مؤمناً كانت الصلاة عند رأسه، وكان الصيام عن يمينه، وكانت الزكاة عن يساره، وكان فعل الخيرات من الصدق والصلة والمعروف والإحسان الى الناس عند رجليه، فيؤتى من عند رأسه، فتقول الصلاة: ما قبلي مدخل، ثم يؤتى عن يمينه، فيقول الصيام: ما قبلي مدخل، ثم يؤتى عن يساره، فتقول الزكاة: ما قبلي مدخل، ثم يؤتى من قبل رجليه، فيقول فعل الخيرات من الصدقة والصلة والمعروف والإحسان الى الناس: ما قبلي مدخل، فيقال له: اجلس، فيجلس، قد مثلت له الشمس وقد دنت للغروب، فيقال له: ما هذا الرجل الذي كان فيكم؟ وما تقول فيه؟ فيقول: دعوني، حتى اصلي، فيقولون: انك ستفعل، اخبرنا عما نسألك عنه، فقال: عمَّ تسألوني؟ فيقولون: ما تقول في هذا الرجل الذي كان فيكم، ما تشهد به؟ فيقول: اشهد أنه رسول الله وأنه جاء بالحق من عند الله، فيقال: على ذلك حييت، وعلى ذلك مت، وعلى ذلك تبعث ان شاء الله تعالى، ثم يفتح له باب من ابواب الجنة، فيقال له: ذلك مقعدك منها وما اعد الله لك فيها، فيزداد غبطة وسرورا، ثم يفتح له باب من ابواب النار فيقال: ذلك مقعدك منها وما اعد الله لك فيها، [لو عصيت الله]، فيزداد غبطة وسروراً؛ ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعاً، وينور له فيه، ويعاد جسده كما بدىء، وتجعل نسمته في نسم الطيب، وهي طير تعلق في شجر الجنة:

**مردو گوێی لەترپەی پێڵاوی خەڵکەکە دەبێ کە جێی دێڵن، جا ئەگەر بڕوادار بێ، نوێژ دێتە لای سەری و، ڕۆژی لەلای ڕاستی و، زەکات لەلای چەپی و، چاکەکاریەکانیشی لە ڕاستگۆیی و پێوەندی و کردەی چاکەکاری وباش لەلای پێیەکانی دەبن. لەلای سەریەوە دێنە لای، نوێژ دەڵێ: لەلای منەوە ڕێ نیە، لەلای ڕاستی دێن، ڕۆژی دەڵێ: لەلای منەوە ڕێ نیە، لەلای چەپی دێن، زەکات دەڵێ: لەلای منەوە ڕێ نیە، لەلای پێیەکانیەوە دێن، چاکەکاریەکانی دەڵێن: لەلای ئێمەوە ڕێ نیە، جاپێی دەڵێن: دانیشە، دادەنیشێ، خۆری دێتە بەرچاوان لەسەر ئاوابونە، پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێیە لەناو ئێوەدا بو، چی لەبارەوە دەڵێی؟ دەڵێ: لێمگەڕێن،**

تا نوێژ بکەم. دەڵێن: نوێژ دەکەی، بەڵام چیت لێدەپرسین وەرامەمان بدەوە، دەڵێ: لەبارەی چیم لێ دەپرسن؟ دەڵێن: چ دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوەی لەنێو ئێوەدا بو، چۆن شایەدی دەدەی؟ دەڵێ: شایەدی دەدەم کە پێغەمبەر و نێردراوی خودایە، و هەقی لەلای خوداوە هێناوە، دەڵێن: لەسەر ئەوە ژیای و، لەسەریشی مردی، بەویستی خودا هەر لەسەر ئەوەش زندو دەکرێیتەوە. ئەوجا یەکێك لە دەرگەکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و، پێی دەڵێن: ئائەمە نشینگەتە لە بەهەشتدا، لەگەڵ ئەوشتانەی خودا بۆی ئامادە کردوی، جا زیاتر دڵخۆش دەبێ، پاشان یەکێك لە دەرگەکانی ئاگری بۆ دەکرێتەوە و، دەڵێن: ئائەمە نشینگەت بو لە نێو ئاگردا، لەگەڵ ئەو شتانەی خودا بۆی ئامادە کردبوی، ئەگەر لێی یاخی بای، زێتر شاد و دڵخوش دەبێ. پاشان هەفتا باڵ گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ و، بۆی ڕوناك دەبتەوە و، جەستەکەی چۆن بو وای لێدێتەوە و، ڕۆحی دەخرێتە سروەی گولاوی، کە بریتیە لە باڵندەیەك لەسەر دارەکانی بەهەشتێ دەنیشێ)).

ئەبو هورەیرە دەڵێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ: خوا ئەو کەسانی بڕوایان هێناوە لەبەر گوتە و باوەڕی پتەویان، لە دونیا و دواییندا پتەو ڕایان دەگرێت.﴾[1].

لە بێژەیەکیشدا هاتوە: ((ثم يعاد الجسد الى ما بدئ منه: پاشان جەستە دەگەڕێندرێتەوە بۆ باری سەرەتای خۆی)).

[1] سورة ابراهيم: ٢٧

## پەناگرتن بەخودا لە ئاشوب و ئەشکە نجەی گۆڕ

لەبەر ئەوەی ئاشوب و ئەشکەنجەی گۆڕ لە پەرژەنگ و ترسە هەرە گەورەکانن، پێغەمبەرﷺ لە نوێژ و کاتەکانی تریشدا پەنای لەم دوانە بەخودا دەبرد و فەرمانیشی دەدا هاوەڵانی وابکەن.

لە فەرمودەکەی عائیشەدا هاتوە کە ژنە جولەکەکە پێی دەڵێ: خودا لە ئەشکەنجەی گۆڕ پەنات بدا، دەڵێ: لەبارەی ئەشکەنجەی گۆڕەوە، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرموی ((نعم، عذاب القـــبر: بەڵێ، ئەشکەنجەی گۆڕ))، دەڵێ: لەپاش ئەم ڕوداوە دیتم پێغەمبەر ﷺ هەر نوێژیکی بکردبا خۆی بەخودا پەنا دەدا لە ئەشکەنجە و ئازاری گۆڕ[1].

لە ئەنەسەوە، پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرمو:

((اللهم إني أعوذ بك من العجز والكسل والجبن والبخل والهرم، وأعوذ بك مـــن عـــذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات: خودایە پەنا بەتۆ دەگرم لە کەنەفتی و تەمبەڵی و، ترسنۆکی و ڕژدی و پیری، هەروەها خۆ بە تۆ پەنا دەگرم لە ئەشکەنجەی گۆڕ، خۆ بەتۆ پەنادەگرم لە ئاشوبی ژین و مردن))[2].

لە عائیشەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((اللهم إني أعوذ بك مـــن الكســـل والهرم والمأثم والمغرم، ومن فتنة القبر وعـــذاب القـــبر..: خودایە؛ پەنابە بە تۆ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و لە گوناه و لەقەرزاری، هەروەها لە ئاشوبی گـــۆڕ و، لە ئەشکەنجەی گۆڕ))[3]

هەروا پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرمو: ((تعوذوا بالله من عـــذاب القـــبر: خۆ بە خودا پەنابگرن لە ئەشکەنجەی گۆڕ)). ئەوانیش دەیانگۆ: (نعوذ بالله من عذاب القـــبر: خۆمان بەخودا پەنادەگرین لە ئەشکەنجەی گۆڕ)[4].

---

[1] رواه البخاري في كتاب الجنائز، والسياق له، باب عذاب القبر، فتحي الباري: (٢٣٢/١٣) ورواه مسلم، كتاب المساجد، باب استحباب التعوذ من عذاب القبر: (٤١٠/١).

[2] قال الشيخ ناصر في صحيح الجامع (٤٠٦/١): رواه احمد والبخاري ومسلم.

[3] عزاه في صحيح الجامع (٤٠٧/١) الى البخاري ومسلم والترمذي والنسائي ابن ماجة.

[4] رواه مسلم، كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت من الجنة والنار عليه: (٢١٩٩/٤).

**هەروەها پێی دەفەرمون:** ((أستجيروا بالله من عذاب القبر، فإن عذاب القبر حـــق: **خۆ بدەنە پاڵ خودا لە ئەشکەنجەی گۆڕ، چونکە ئەشکەنجەی گۆڕ هەقە**))[1].

**هەروەها فەرمانی دەدانێ خۆ لە چوار شتان پەنابگرن، دەیفەرمو:**

((استعيذوا بالله من عذاب القبر، إستعيذوا بالله من جهنم، استعيذوا بالله من فتنـــة المســـيح الدجال، استعيذوا بالله من فتنة المحيا والممات: **خۆ بە خودا پەنابگرن لە ئەشکەنجەی گۆڕ، خۆ بە خودا پەنابگرن لە دۆزەخ، خۆ بەخودا پەنابگرن لە ئاشوبی مەسیحی دەجال، خۆ بەخودا پەنابگرن لە ئاشوبی ژیان و مردن**))[2].

**هەروەها فەرمانی وابو، لەپاش شادەهێنان لە نوێژدا خۆپەنادەن لە ئەشکەنجەی گۆڕ، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إذا تشهد أحدكم فليستعذ بالله من أربع؛ يقول: اللهم إني أعوذ بك من عـــذاب جـــهنم، ومن عذاب القبر، ومن فتنة المحيا والممات، ومن شرِّ فتنة المسيح الدجـال: **ئەگەر یەکێکتان لە نوێژێدا شادەی هێنا با خۆی لە چوار شتان پەنادا؛ بڵێ:** (اللهم إني أعـــوذ بـــك مـــن عذاب جهنم، ومن عذاب القبر، ومن فتنة المحيا والممات، ومن شـــرِّ فتنـــة المســـيح الدجـــال: **خودایا! من خۆم بەتۆ پەنا دەگرم لە ئەشکەنجە و ئازاری دۆزەخ و، لە ئەشکەنجەی گۆڕ و، لە ئاشوبی ژین و مردن، لە خراپی ئەزمون و ئاشوبی مەسیحی دەجال**))[3].

**لە ئیبنی عەبباسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەم نزایەی فێرکردن، وەکو فێرکردنی یەکێك لە سورەتەکانی قورئان:** ((اللهم إنا نعوذ بك من عذاب جهنم، وأعـــوذ بك من عذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المسيح الدجال، وأعوذ بك من فتنة المحيـــا والممـــات: **خودایە ئێمە پەنا بەتۆ دەگرین لە ئەشکەنجەی دۆزەخ و، خۆ بەتۆ پەنادەگرم لە ئەشکەنجەی گۆڕ و، خۆ بەتۆ پەنادەگرم لە ئاشوبی مەسیحی دەجال و، پەنا بەتۆ دەگرم لە ئاشوبی ژیان و مردنێ**))[4].

---

[1] رواه الطبراني بإسناد صحيح، أنظر صحيح الجامع: (١/٣١٧).
[2] عزاه في صحيح الجامع (١/٣٢٠) الى الترمذي والنسائي.
[3] رواه مسلم في صحيحه، كتاب المساجد، باب ما يستعاذ منه في الصلاة، (١/٤١٢) حديث رقم (٥٨٨).
[4] رواه مسلم، كتاب المساجد، باب ما يستعاذ منه في الصلاة، (١/٤١٢) حديث رقم (٥٩٠).

## خوازگەی شەشەم

# ئەوانەی لە فیتنە و ئەشکەنجەی گۆڕ پارێزراو دەبن

هەندێك لەو بڕوادارانەی كردەوەی شكۆمەندیان ئەنجام داوە، یان توشی كارەساتی گەورە هاتون، لە فیتنە و ئەشكەنجەی گۆڕ دڵنیاو پارێزراو دەبن؛ لەوانە:

**(١) شەهید**: میقدامی كوڕی مەعدی كروب گێڕاویەتیەوە، گوتویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في أول دفعة، ويرى مقعده من الجنة، ويجار من عذاب القبر، ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار؛ الياقوتة منها خير من الدنيا وما فيها، ويزوج ثنتين وسبعين زوجة من الحور العين، ويشفع في سبعين من أقربائه: شەهید لەلای خودا شەش خەسڵەتی هەیە؛ لەگەڵ یەكەم دڵۆپەخوێنی خوا لێی خۆش دەبێ و، شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ و، لە ئەشكەنجەی گۆڕ پارێزراو دەبێ و، لە راچەنینی هەرە گەورەی رۆژی دوایی بێنیاز دەبێ و، تاجی رێز و پایەداریی لەسەر دەنرێ؛ كە هەر دوڕێكی لە دونیا و ئەو شتانەی تێیدایە بەهادار و چاكترە، هەروەها هەفتا و دو پەری چاو بەڵەكی دەكرێتە هاوسەر و، بۆ هەفتا كەس لە خزم و نێزیكانی شەفاعەت دەكا)).[١]

نەسائی لە سونەنەكەیدا دەگێڕتەوە لە راشیدی كوڕی سەعید، لە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، كە پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی هەمو بڕواداران لە گۆڕەكانیاندا توشی فیتنە دەبن تەنها شەهید نەبێ؟! فەرموی: ((كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة: بریقەی شمشێران لەسەرسەری، وەكو فیتنە بۆوی بەسە)).[٢]

**(٢) ئەوی بە سەنگەرنشینی دەمرێ**: فوضالەی كوڕی عوبەید، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕتەوە كە فەرموی: ((كل ميت يختم على عمله إلاّ الذي مات مرابطاً في سبيل الله! فإنه

---

[١] رواه الترمذي وابن ماجة، مشكاة المصابيح: (٣٥٨/٢)، وأسناده صحيح كما قال محقق المشكاة الشيخ ناصر.

[٢] وسنده صحيح، أنظر أحكام الجنائز للألباني: (٣٦) وصحيح الجامع: (١٦٤/٤).

ينمي له عمله يوم القيامة، ويأمن فتنة القــــبر: هەمو مردوێك كردەوەكانی مۆر دەكرێن، تەنیا ئەوی لەپێناو خودا سەنگەری گرتوە و، لەسەنگەرنشینی مردوە، ئەمە تا رۆژی دوایی كردەوەكانی لەگەشەدان و، لە فیتنەی گۆڕیش دەپارێزرێ))[1].

(٣) **ئەوی لە رۆژی هەینیدا دەمرێ:** هەروەك لە فەرمودەی عەبدوڵڵای كوڕی عەمر لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، فەرموی: ((ما من مسلم يموت يوم الجمعة إلاّ وقاه الله فتنة القــبر: هەر موسڵمانێكی لە رۆژی هەینیدا بمرێ، خودا لە فیتنەی گۆڕ دەیپارێزێ))[2].

(٤) **ئەوی بە ژانەزگ دەمرێ:** ئەمەش لەو فەرمودەیە هاتوە كە عەبدوڵڵای كوڕی یەسار دەیگێڕتەوە و دەڵێ: (من و سلێمانی كوڕی صەدر و خالیدی كوڕی عورفوطە دانیشتبوین، گوتیان كەوا پیاوێك بە ژانەزگ مردوە، ئەو دو كەسە حەزیان دەكرد لە ناشتنی ئامادەبان. یەكێكیان بە ئەوی دیكەی گوت: ئەدی پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموە: ((من يقتله بطنـــه فلـــن يعـــذب في قـــبره: ئەو كەسەی ژانەزگ بیكوژێ، لە گۆڕەكەی ئەشكەنجە نادرێ)). ئەوی دیكە گوتی: بەڵێ، ڕاست دەكەی.[3]

---

[1] رواه الترمذي وأبو داود، مشكاة المصابيح: (٣٥٥/٢)، وإسناده صحيح كما قال محقق المشكاة.

[2] رواه أحمد والترمذي، والحديث بمجموع طرقه صحيح أو حسن، أحكام الجنائز (٣٥).

[3] قال الشيخ ناصر في أحكام الجنائز: أخرجه النسائي، والترمذي وحسنه، وابن حبان في صحيحه، والطيالسي، وأحمد، وسنده صحيح. (أحكام الجنائز ص٣٨).

# جێباسی پێنجەم

## پەندی مردن

### خوازگەی یەکەم

### مردن مەزنترین ئامۆژگارە

هەندێکمان لەوان فەرمودان هێناوە کە لە بارەی مردن و ژانەکانی و، گۆڕ و ناخۆشیەکانی دەدوێن، ژیریش ئەو کەسەیە پەند وەربگرێ، چونکە مردن گەورەترین پەندیار و ئامۆژگارە. لە زاهیدێکیان پرسی: کاریگەرترین پەند چیە ؟ گوتی: تەماشاکردنی مردوان.[1]

قورطوبیش چاك وەسفی مردنی کردوە کە دەڵێ: (مردن کاریگەرترین و ناخۆشترین بەسەرهاتە و، پێکێکی هەرە ناخۆش و تاڵە و، ڕوخێنەری چێژ و خۆشیانە و، پچڕێنەری هەسانەوانە و، هێنەری ناخۆشیانە، چونکە ئەو کارەی ناخت پارچە پارچە بکا و ئەندامەکانت لێك جودا بکاتەوە و دایانڕزێنێ، بەڕاستی کارێکی ترسناك و گەورەیە و، ڕۆژی هاتنیشی ڕۆژێکی مەزنە).[2]

---

[1] التذكرة للقرطبي: ٩٩.

[2] التذكرة للقرطبي: ٢٤.

## حوازگەی دووەم

# بیرکردنەوە لە مردن

هەروەکو ژیان یەکێکە لە نیشانەکانی خودا، مردنیش هەروا ئایەتێکی دیکەیە و پێچەوانەی ژینە و، لەمیش کەمتر سەرسوڕهێنەر نیە، ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ: چۆن کوفر بەخوا دەکەن، کەچی ئێوە لەشێکی بێگیان بون و خوا گیانی بە بەردا کردن، پاشانیش دەتانمرێنێ و جارێکی دی زیندوتان دەکاتەوە. ئەوسا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە﴾.[1]

بۆیە بیرکردنەوە و رامان لەم نیشانەیە وردبونەوەیە لە یەکێك لە بەدیهێنراوە سەیرەکانی خودا کە بەڵگەیە بۆ مەزنێتی توانای خودا و سەیری و سەرسوڕهێنەری کاروباری. دەگێڕنەوە گوایە دەشتەکیەك لەسەر پشتی حوشترەکەی ڕێی دەکرد، حوشترەکەی بەربۆوە و مرداربو، دەشتەیەکە دابەزی و بە دەوری حوشترەکەیدا دەسوڕایەوە و تێیدەفکری و، دەیگوت: بۆچی هەڵناستیتەوە؟ بۆچی ناژێیەوە؟ هەمو ئەندامەکانت ساغ و تەواون، چیت بەسەرهاتوە؟ چیبو بە پێوەی ڕاگرتبوی؟ چیبو دەیژیاندی؟ چ شتێك لە عەردی دای؟ چ شتێك جوڵەی لێ بڕیوی؟

پاشان بەجێی هێشت و هەرتێی دەفکری و، لەو کارە سەری سوڕما بو.[2]

لەبارەی هەندێ پیاوی ئازا کە لەناو جێگەدا دەمرێ، گوتویانە:[3]

| | |
|---|---|
| جاءته من قبـل المنـون إشـارة | فهوى صريعـا لليديـن وللفـم |
| ورمى بمحكـم درعـه وبرمحـه | وأمتد ملقى كـالفتيق الأعظـم |
| لا يستجيب لصـارخ إن يدعـه | أبدا ولا يرجى لخطـب معظـم |

---

[1] سورة البقرة: ٢٨.

[2] التذكرة للقرطبي: ص٤.

[3] التذكرة للقرطبي: ص٥

| | |
|---|---|
| ذهبت بسالته ومرَّ مراره | لما رأى حبل المنية يرتقي |
| يا ويحه من فارس ما باله | ذهبت مرارته ولما يُكْلَم |
| هذي يداه وهذه أعضاؤه | ما منه عضو إذا بمثلم |
| هيهات ما حبل الردى محتاجه | للمشرفي ولا اللسان اللهذم |
| هي ويحكم أمر الإله وحكمه | والله يقضي بالقضاء المحكم |

واته: لەلای مەرگەوە ئامارژەیەکی بۆ هات، جا لەدەست و لە گۆ کەوت، قەڵغان و رمەکەی فڕێداو بە مردویی راکشا، هەرچەندە یەکێك بەهاوار بانگی بکا وەڵامی نیەو هەرگیز چاوەڕوانی لێ ناکرێ، ئازایەتی فەرمان و قسەڕۆیشتنەکەی بەسەرچو کاتێك پەتی مردنی بۆ هەڵخرا، خاکی بەسەر چ سوارچاکێك بو کەچی ئێستا بەبێ برینداربون فەرمانەکانی لەدەست داو ڕۆیی، ئەمە هەردو دەستیو ئەمانەش ئەندامەکانی، هەروەك خۆیانن و چ کەموکورییان تێنەکەوتوە، ئەفسوس ئەمڕۆ پەتی مەرگ پێویستی بە شمشێرو زمانی بڕەری ئەو نیە. هەشتان بەسەر ئەمە فەرمان و حوکمی خودایەو فەرمانەکانی خوداش زۆر بەجێو ڕەواو پتەون.

### خوازگەی سێیەم

## هەندێك نمونەی پەندی ئامۆژگاران

خودای مەزن پێغەمبەرەکەی ﷺ بە مردن ئامۆژگاری کردوە و فەرمویەتی: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ: بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.﴾[1]، لە فەرمودەیەکیشدا هاتوە لە عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((أتاني جبريل، فقال: يا محمد، عش ما شئت، فإنك ميت، وأحبب من شئت فإنك مفارقه، وأعمل ما شئت فإنك مجزي به، واعلم أن شرف المؤمن قيامه بالليل، وعزه استغناؤه عن الناس: جبریل هاتە لام و، گوتی: ئەی موحەممەد! چەندی دەتەوێ بژی، لە کۆتاییدا هەر دەمری، هەر کەسێکیشت دەوێ

---

[1] سورة الزمر: ٣٠.

**خۆشت بوێ، هەر لێی جودا دەبیەوە، چیشت دەوێ بیکە، هەر پاداشتەکەی وەردەگری، بشزانە پایەی بڕوادار لە خواپەرستیو نوێژی شەویەتی، سەربەرزیشی لەوەدایە لە خەڵکی بێپێویست و بێنیاز بێ)).[1]**

**ئێمە گەلێك دەقمان هێناوەتەوە، کە خودا و پێغەمبەرەکەی بە مردن ئامۆژگاری کردوین. ئەمەش داب و نەریتی چاکەکاران بوە و هەر بە مردن ئامۆژگاری خۆیان کردوە و، ئامۆژگاری خەڵکیشیان پێکردوە. عەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ دەڵێ: (دونیا پشتی لێکردوین و دەڕوا، دواییینیش وا بەرەو ڕومان دێ، هەریەکەشیان کوڕی خۆی هەیە، جا ئێوە لە کوڕانی دوایین بن و، لە کوڕانی دنیا مەبن، چونکە ئەمڕۆ کردەوەیە و لێپرسینەوە نیە و، سبەیش لێپرسینەوەیە و کردەوە نیە).[2]**

**یەکێك لە پەندی زانایانیش ئەوەیە کە لە (التذکرة)ی قورطوبیدا هاتوە: (هۆ مرۆڤی لەخۆبایی: لە مردن و ژانەکانی تێبفکرە، بیر لە تاڵی و سەختی پێکەکە بکەوە، ئای بەڵێنی مردنێ چەند ڕاستە و، چەند حاکمێکی دادوەرە، مردن بەسە بۆ وەی دڵان ڕاچڵەکێنی و، چاوان بگریێنێ و، کۆمەڵان لێك بکا و، خۆشی چێژان دارمێنی و، ئاواتان بپچڕێنێ.**

**هۆ ئادەمیزاد هەرگیز بیرت لە ڕۆژی مردنت و گواستنەوەت لە شوێنی خۆت کردۆتەوە؟ کە لە فراوانیەوە بەرەو تەنگی دەچی و هاوەڵ و هاوڕێیان پشتت تێدەکەن و، براو برادەر بەجێت دێڵن و، لەناو جێ و بالینگانت بەرەو ناو بەردانت دەبەن و، لەپاش لێفە نەرمەکانت خاك و خۆڵت پێدا دەدەن. هۆ ئەو کەسەی بەماڵ کۆکردنەوە خەریکی و، قوللە و قۆنگران بنیات دەنێی، بەخوا لە دو گەز جاوان بترازێ نابیە خاوەن هیچ لە ماڵت، هەموی هەر بە فیڕۆ دەچێ، لاشەشت لە خاك ڕۆدەچێ.**

---

[1] رواه الطبراني في الاوسط، و ابونعيم في الحلية، و الحاكم في مستدركه و غيرهم . سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٥٠٥)، رقم الحديث (٨٣١).

[2] رواه البخاري في ترجمة باب: الأمل وطوله، مشكاة المصابيح: (٢/٦٥٩)، رقم الحديث (٥٢١٥).

کوا لە کوێیە ئەو ماڵەی کۆت کردبۆوە؟ ئایە بەکەڵکت دێن لە ناخۆشیەکان؟ نەخێر، بەڵکو بۆ کەسانێك جێت هێشتوە تەنانەت ستایشت ناکەن! بەباری گوناهیشت هاتیە بەردەم ئەو خودایەی چ بیانویەکی پێ نەهێشتوی).[1]

هەروەها قورطوبی لە یەزیدی ڕەقاشیی ڕاگواستوە کە بەخۆی دەگوت: (خاکت بەسەر یەزید، کێ پاش مردنت نوێژت لەباتی دەکا؟ کێ پاش مردنت ڕۆژیت لەجیاتی دەگرێ؟ کێ لە پاش مردنت خودای پەروەردگارت لێ ڕازی دەکا؟)

پاشان دەیگوت: (هۆ خەڵکینە، ئەدی ئێوە ئەوەندەی لە ژینتان ماوە بۆ خۆتان ناگرین و شین ناکەن؟ کێیە مردن بانگی دەکا و، گۆڕ دەبێتە ماڵ و حاڵی و، خاك و خۆڵ دەبتە پێخەف و، کرم دەبنە هاودەمی و، لە پاڵ هەندێش چاوەڕوانی ڕاچەنینی گەورەیە؟ دەبێ حاڵ و باری چۆن بێ؟)[2]

هەروەها قورطوبی (بەر میهری خودا کەوێ) لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (هۆ ئەو کەسەی لەخۆبایی! بێنە بەرچاو، ژانی مردنێت گەیشتێ و توشی ناڵە و هاوار هاتی، هەیە دەڵێ: فلانی وەسیەتی کردو، ماڵ و سامانی ئامار کرد، هەیە دەڵێ: فلان زمانی گران بوە، نەدراوسێیان دەناسێ، نە براکانی دەدوێنێ.. وەك بڵێی وا سەیرت دەکەم، تۆ گوێت لەگشت قسەکانە و، لەبۆ وەرام دانەوەشیان زمانت دەسەوسانە... دەڕامێنە و خەیاڵ کە، ئادەمیزاد! ئەگەر لەناوپێخەوەکەت بەرەو تاتەشۆریان بردی، مردوشۆرەکە شۆریتی و، کفنەکەی لەبەر کردی، کەس و خزم و دەرودراوسێ، هەمویان پشتیان تێکردی، هەڤاڵ و دۆست و برایان، چین چین لەسەرت دەگریان، مردوشۆرەکەش بانگی کرد: خێزانی فلان لەکوێیە؟ بابێ گەردنی ئازاد کا، بێباوکەکانیشی لەکوێن؟ ئەوا بابتان جێتان دێڵی و لەمڕۆ بەدواوە نایبینن، جا پێت دەڵێن:[3]

---

[1] التذكرة: ص٩

[2] التذكرة: ص٩

[3] التذكرة: ص٢١

ألا أيها المغرور ما لـــك تلعـــب　　　تؤمـــل آمـــالاً وموتـــك أقـــرب

وتعلم أن الحـــرص بحـــر مبعـــد　　　ســـفينته الدنيـــا فإيـــاك تعطـــب

وتعلم أن الموت ينقض مســـرعاً　　　عليك يقيناً طعمه ليـــس يعـــذب

كأنك توصي واليتـــامى تراهـــم　　　وأمهم الثكلـــى تنـــوح وتنـــدب

تغص بحـــزن ثم تلطـــم وجهـــها　　　يراها رجال بعدما هـــي تحجـــب

وأقبل بالأكفان نحـــوك قـــاصد　　　ويحثى عليك الترب والعين تســـكب

واتە: ئەرێ ئەی لەخۆبایی! چیتە خەریکی گەمانیو، هیواو ئاواتان دەخوازی و مردنت نێزیکترە! دەزانی هەتەریو مکوڕی دەریایەکی دورخەرەوەیەو دنیا کەشتیەکەیەتیو بۆ تۆش تێکدەچێ. چاك دەزانی مردن بەخێرایی دێو دەتگاتێ، وەك بڵێی وەسیەتان دەکەیو هەتیوەکانت دەبینی لەگەڵ دایکە کۆسکەوتوەکەیان ناڵەو رۆڕۆیەتی، کە دڵی پڕ خەم بوەو لەڕوی خۆی دەدا، پیاوان دەیبینن پاش ئەوەی خۆی دادەپۆشت. کۆچپۆشت بۆ ئامادە دەکرێو بەرەو ڕووت دەهێنرێو پاشان خۆڵت بەسەردا دەکرێو چاوان ئەشك دەبارێنن.

لە پەندە هەرە کاریگەرەکانی ئەبودەردائی هاوەڵی پایەداریش، ئەوەبو دەیگوت: (سێ شت وەپێکەنینیان خستم، سێش وەگریان. خستمیانە پێکەنین؛ ئەوەی بەئاواتی دونیایە و مردنیش وا داوای دەکا، ئەوەی بەخۆی خافڵاوە و بەڵام لێی نەخافڵاون، ئەوی پڕ بەدەم پێدەکەنێ و، ناشزانی ئایا خودای رازی کردوە یا تورە.

ئەوانی وەگریانیان خستم؛ دابڕان بو لە موحەممەدﷺ و کۆمەڵەکەی؛ لەگەڵ پەرژەنگ و ژانی سەروبەندی مردنێ و، ڕاوەستان لەبەردەستانی خودا، لەو رۆژەی رازەکان ئاشکرا دەبن و، پاشان نازانی بۆ بەهەشت دەچی یا دۆزەخ).[١]

هەورەها ئەبو دەرداء، یا ئەبوذەر دەڵێ: (بۆ مردنێ لە دایك دەبن و، بۆ کاول بون بنیات دەنێن و، بۆ شتێکی نەماوە پێدادەگرن و سور دەبن لەسەری و، ئەوی دەشمێنێتەوە وازی لێدێنن و جێیدێڵن).[١]

---

[١] التذكرة: ص٨٧.

قورطوبیش وەکو ئامۆژگارێك دەڵێ: (کوا ئەو ماڵ و سامانەی تۆ کۆت کردبۆوە، بۆ رۆژی سەخت و پەرژەنگان کەڵەکەت کردبون، لەکاتی مردنێدا دەستانت وا لێی خاڵی بون و، دەوڵەمەندی و دەسەڵاتت بە زەبونی و هەژاری ئاڵوگۆڕ کراوە، چیت بەسەر هاتوە، هۆ دیلی گوناهەکانت، ئەی ئەو کەسەی کەس و ماڵ و حاڵی لێ ئەستێنراوە؟

ڕاستەڕێت چەند لێ بزربو، چەن بێخەم بوی لە دانانی تێشوی ئەو گەشتە دورەت و، ئەو هەڵوەستە پڕ سەختیە بێ سنورەت، نەتدەزانی، ئەی لە خۆبایی! هەر دەبێ هەنگاو هەڵێنی بۆ رۆژێکی پڕ ژان و پەرژەنگ، ئەوجا لەو کاتەدا قسەو قسەڵۆکت بەکار نایەن، بەڵکو لەبەر دەستانی پادشای پاداش و سزایان، هەموت لەسەر ئەژمار دەکرێ، لە کردەی دەستان و گەڕانی پێیان و، گۆتنی زمان و کرداری ئەندامان، جا ئەگەر بەر میهری خودا کەوتی ئەوا بۆ بە هەشتە و، ئەگەر نا بۆ ناو بڵێسە ئاگران.

هۆ خافڵاو لەو حاڵ و بارانە، ئەو بێئاگەییەت تا کوێ؟ وادەزانی مەسەلەکە بچوکە و کارەساتەکە سانایە؟ گومان دەبەی حاڵ و بارت کاتی کۆچت دێنە هانات، یا سامانەکەت رزگارت دەکا لەو کاتەی کردەوەکانت ڕو زەرد و شەرمەزارت دەکەن، یان پەشیمانی دادت دەدا کاتێك پێت هەڵدەزەلێ، یاخود کاتێك حەشرگە لە خۆیت دەگرێ کەسوکارت دێنە هانات؟ نەخێر، سوێند بێ بە خودا خەیاڵە. رۆژێکیش دادێ بیزانی. نە بەکەمی رازی دەبی، نە بەحەرامیش تێر دەبی، نە گوێ لە پەندان ڕادەگری و، نە گەف و گوڕ دەتگێڕنەوە، داب و نەریتت وایە لەگەڵ ئارەزوان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەبی، خۆت بەم لاو بەولا دادەی، بە زۆربونی موڵك و ماڵت سەرسام دەبی، ئەرك و خەمی بەردەستانت لەبیر دەکەی. هۆ بابای نوستوی بێئاگا! تا کەی ئاوا بێهۆش دەبی؟! وادەزانی ئاوا بەجێ دەهێڵرێی، سبەی موحاسەبە ناکرێی، یان وادەزانی مردن بەرتیل وەردەگرێ، یان مردن جیاوازی دەکا لەنێوان درندەو لاوازان؟[1]

---

[1] کتاب الزهد و الرقائق، لابن المبارك: ص٨٨

نەخێر، بەخودای، نەماڵت ونە منداڵت مردنت لێ وەلا نانێن، ئەوەی قبوڵ بکرێ تەنها هەر چاکەیە، جا مزگێنی بۆ کەسێ کە گوێبیست دەبێ و تێدەگا، کە بانگەشەی دینیش دەکا، فەرمانی جێبەجێ دەکا، نەفس لە ئارەزو دەپارێزێ و، بزانێ کە بە پارێز و وازهێنان لە خراپەکاری دەرباز دەبێ، مرۆڤیش هەر ئەوە دەدورێتەوە کە چاندویەتی، کۆششەکەی تەماشا دەکرێ، جا هەستە لەو پاڵکەوتنەت، چاکەکاری بکە داب و نەریتت، بەتەمای پایەی چاکەکاران مەبە لەکاتێکدا لەسەر خراپە بەردەوامیت و کرداری خراپەکاران دەکەیت، کە بەتەنیای چاوت لە خوا بێ، هیوا و ئاوات فریوت نەدا، لە ئاست کردەوان پارسا(زاهد) بە.... ئەمەش بڵێنەوە:[1]

| | |
|---|---|
| تــزود مــن معاشــك للمعــاد | وقــم لله وأعمــل خــــير زاد |
| ولا تجمع مــــن الدنيـــا كثـــيرا | فــإن المــال يجمــع للنفــــاد |
| أترضى أن تكــون رفيــق قــوم | لهــم زاد وأنــت بغــــير زاد |

واتە: لە ژینتدا زەخیرەی ژینەوەت دانێ، بۆ خودا هەستە و چاکترین زەخیرە ئەنجام بدە. گەلێکیش لە کاڵای دنیایی گردمەکەوە، چونکە ماڵ هەر بۆ تەواوبونێ کۆ دەکرێتەوە. حەزت لێیە ببیە هاوەڵی قەومێك، ئەوان خاوەن زەخیرە و تۆش دەست بەتاڵ بی.

یەکێکی تریش دەڵێ:

| | |
|---|---|
| إذا أنت لم ترحل بزاد من التقـــى | ولاقيت بعد الموت من قد تــزودا |
| ندمت على أن لا تكــون مثلــه | وأنك لم ترصد كما كان أرصــدا |

واتە: ئەگەر تۆ بە تێشوی تەقوا کۆچ و گوزەرت نەکرد و، پاش مردنێش کەسانێکت دیت خاوەن تێشو و زەخیرەن، ئەوکاتە پەژیوان دەبیەوە کە وەکو ئەو نی و، تۆش وەکو ئەو هیچت گل نەداوەتەوە.

---

[1] التذكرة القرطبي: ٩١.

## خوازگەی چوارەم

## هەندێك لە نمونەی پەندی شاعیران

زۆر شاعیر باسی مردن و پەندیان کردوە، وەك ئەو شاعیرەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لاشيء مما ترى تبقى بشاشته | يبقى الإله ويفنى المال والولد |
| لم تغن عن هرمز يوما خزائنه | والخلد قد حاولت عاد فما خلدوا |
| ولا سليمان اذ تجري الرياح له | والإنس والجن فيما بينها ترد |
| أين الملوك التي كانت لعزتها | من كل أوب اليها وافد يفد |
| حوض هنالك مورود بلا كذب | لابد من ورده يوما كما وردوا |

واتە: هیچ یەکێك لەو شتانەی دەیبنی گەشاوەیی نامێنێ، هەر خواوەند دەمێنێ و ماڵ و منداڵ لەناو دەچن. گەنجینەگەلی هورمز رۆژێك بەکەڵکی نەهاتن. عادیش هەوڵی نەمریان دا بەڵام تێچون. هەروەها سلێمانیش نەما کە بایەکان بۆوی هەڵیان دەکرد و مرۆڤ و جنۆکە بەر ئەمری بون. لە کوێن ئەو پاشایانەی لەبەر دەسەڵاتیان، لە هەر هەمو لاوە خەڵکیان دەهاتە لا. گۆمێك لەوێ هەیە و درۆ نیە، چون ئەوان تۆش رۆژێك دەچیە سەری.

یەکێکی دیکەش دەڵێ:

| | |
|---|---|
| مشيناها خطا كتبت علينا | ومن كتبت عليه خطا مشاها |
| وأرزاق لنا متفرقات | فمن لم تأته منا أتاها |
| ومن كتبت منيته بأرض | فليس يموت في أرض سواها |

واتە: هەنگاوێکمان هەڵێنا کە بۆمان نوسرابو، هەر کەس هەنگاوێکی بۆ نوسرابێ دەبێ بیهاوێ. رۆزی و بژێویشمان پەرت و بڵاون، هەر یەکێك بەدوایدا نەچێ ئەو بەداویدا دێ. هەر کەسێکیش مەرگی لە خاکێك نوسرا، لەو خاکە بترازێ لە چ جێی دی نامرێ.

یەکێکی دی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وإذا وليـــــت قومـــــا ليلـــــــة | فـــأعلم بـــأنك بعدهـــا مســـــئول |
| وإذا حملـــت الى القبـــور جنـــــازة | فـــأعلم بـــأنك بعدهـــا محمـــــول |

واتە: ئەگەر بۆ شەوێکیش کاروباری قەومێکت درا دەست، بزانە تۆش پاشان بەرپرس دەبی. ئەگەر تەرمێکت بۆ قەبران هەڵگرت، بزانە خۆشت پاشان هەڵدەگیرێی.

شاعیرێکی دیکە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تـــزود مـــن الدنيـــا فـــإنك لا تـــدري | إذا جن ليـــل هـــل تعيـــش الى الفجـــر |
| فكم مـــــن عـــروس زينوهـــا لزوجـــها | وقد أخـــذت أرواحـــهم ليلـــة القـــدر |
| وكم من صغار يرجـــى طـــول عمرهـــم | وقد أدخلت أرواحـــــهم ظلمـــة القـــبر |
| وكم من سليم مـــات مـــن غـــير علـــة | وكم من سقيم عاش حينا مـــن الدهـــر |
| وكم من فـــتى يمســـي ويصبـــح لاهيـــا | وقد نسجت أكفانـــــه وهـــو لا يـــدري |
| وكم من ساكن عند الصبـــــاح بقصـــره | وعند المسا قد كان مـــن ســـاكن القـــبر |
| فكـــن مخلصـــا وأعمـــل الخـــير دائمـــا | لعلـــك تحظـــى بالمثوبـــــة والأجـــــر |
| وداوم علـــى تقـــوى الإلـــــه فإنهـــــا | أمان من الأهـــوال في موقـــف الحشـــر |

واتە: لە دنیادا بارگە و تێشوی خۆت سازدە، چونکە تۆ نازانی ئەگەر شەو داهات ئایا تا سبەینێ دەژی. چەندین بوك بۆ زاوایان ڕازێنرانەوە، کەچی گیانی ئەوان لەشەوی قەدردا ستێنرا، چەندین بچوك تەمای تەمەن درێژییان بۆ دەکرا، کەچی گیانی ڕەوانی تاریکی گۆڕ کرا، چەندەها کەس بەبێ دەرد و نەخۆشی مردن و چەندەها دەردەداریشی بۆ ماوەیەکی درێژ ژیان، چەندین جحێڵ بە رابواردن شەو و ڕۆژ دەکەنەوە، کەچی کفنیان چنراوە و بەخۆیان نازانن. چەندین کەس سەر لەبەیانی لە کۆشك و تەلاری خۆیان بون و بۆ هێواریێ بونە گۆڕنیشین. جا هەر دڵڕاست بە و هەمیشە چاکە بکە، بەڵکو ڕێزانە و پاداش وەردەگری، لەسەر پارێز لە خودا کردنیش بەردەوام بە، چونکە ئەمە مایەی ئارامیە لە ناخۆشیەکانی هەڵوەستەی نێو مەیدانی مەحشەر.

یەکێکی تریش دەڵێ:

هب الدنیا تساق الیك عفوا — ألیس مصیر ذاك الی انتقال
وما دنیاك الاّ مثل فيء — أظلك ثم آذن بالزوال

واتە: وا دانێ دونیا لەخۆڕا بۆ لای تۆ داژورێ، ئەدی سەرەنجامی ئەوەش هەر گوزەر کردن نیە؟! دنیای تۆ تەنیا وەك نسێیەکە، بڕێك سێبەرت لێ بکا و پاشان دابکشێ.

شاعیرێکی دی دەڵێ:

یا مقیما قد حان منه رحیل — بعد ذاك الرحیل یوم عصیب
إن للموت سکرة فارتقبها — لا یداویك إن أتتك طبیب
کم توانی حتی تصیر رهینا — ثم تأتیك دعوة فتجیب
وتذکر یوما تحاسب فیه — إن من یذکر الممات ینیب
لیس من ساعة من الدهر الا — للمنایا علیك رقیب
کل یوم ترمیك بسهم — إن تخطی یوما فسوف تصیب

واتە: هۆ ئەو نیشتەجێیەی کاتی گوزەری هاتوە، پاش ئەو گەشتە ڕۆژێکی سەخت دێ. مردن ژان و ژواری هەن، چاوەڕێی بە، گەر توشت بو بە نوژداران چارە ناکرێی. چەند خەم ساردی دەکەی تا دەبیە رەهینێك، پاشان بانگ دەکرێی و وەرام دەدەیەوە، یادی ئەوی ڕۆژێ بکە کە توشی لێپرسینەوە دێی، ئەوی یادی مردنێ بکاتەوە دەگەڕێتەوە. هیچ ساتێکی ژین نیە چاوەدێریی مەرگت لەسەر نەبێ، هەمو ڕۆژێك تیرێکت تێ دەگرێ، خۆ ئەگەر سەریش بکا ڕۆژێك دێ دەتپێکێ.

یەکێکی دیکە دەڵێ:

الموت في کل یوم ینشر الکفنا — ونحن في غفلة عما یراد بنا
لا تطمئن الی الدنیا وبهجتها — وإن توشحت من أثوابها الحسنا
أین الأحبة والجیران ما فعلوا — أین الّذین هم کانوا لنا سکنا
سقاهم الموت کأسا غیر صافیة — فصیرهم لأطباق الثری رهنا

واتە: مردن هەمو ڕۆژێ کۆچیوش(کفن) ڕادەخا، ئێمەش بێ ئاگاین چمان لێ داواکراوە. دلآرام مەبە و ئۆقرە مەگرە بە دنیا و شادیەکانی ئەگەر جلی ئالو والآشی پۆشی. لە کوێن خۆشەویستان و هاوسێیان، چیان کرد؟ کوان ئەوانەی بۆ ئێمە دلنەوایی بون. مردن پێکێکی تەلخی دانێ و کردنی بەمایە خاك و خۆل.

شاعیرێکی تریش دەلێ:

قــدم لنفســـــك توبــــة مرجـــــوة قبل الممـــات وقبـــل حبـــس الألســـن

بـــادر بهـــا غلـــق النفـــــوس فإنهـــا ذخـــر وغنـــم للمنيـــــب المحســـــن

واتە: پەشیمانیەکی پڕ تکا پێشکەش بە نەفسی خۆت کە، بەر لە مەرگ و زمان گرێدرانێ، نەفس بەو تۆبەیە داخە چونکە مایە و داهاتە بۆ چاکەکار و ژیوانێ.

## خوازگەی پێنجەم

## کاریگەری یادکردنەوەی مردن لە چاکسازی دەرونەکاندا

یادکردنەوەی مردن کاریگەری و شوێنێکی گەورەی لە چاکسازی و مشتومال کردنی دەرونانددا هەیە، چونکە دونیا و چێژەکانی کار لە دەرونان دەکەن و، تەمای مانەوەی درێژی لەم ژیانە پێدەبەخشن، جا ڕەنگە بۆ گوناح و تاوانان بخلیسکێ و، لە تاعەتان کەمتەرخەمی بکا. خۆ ئەگەر بەندە هەمیشە مردنی لە خەیالدا بو، دونیای لە چاوان بچوك دەبێتەوە و، بە چاکردنی دەرون و ڕاستال کردنی کاروباری خەریکی دەکا. ئەنەسی کوڕی مالیك دەلێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((أكثروا ذكر هاذم اللذات؛ الموت، فإنه لم يذكره في ضيق من العيش الاّ وسعه عليه، ولا ذكره في سعة الاّ ضيقـــها: زۆر یادی تێکشکێنەری چێژان بکەنەوە؛ کە مردنە، چونکە لە هەر تەنگیەکی ژیندا یادی مردن بکەیەوە فراوانی دەکا و، لە هەر فراوانیەکدا یادی بکەیەوە تەنگی دەکا)).[1]

[1] رواه البيهقي في شعب الإيمان، وابن حبان في صحيحه والبزار في مسنده بأسناد حسن؛ صحيح جامع الصغير: (٣٨٨/١) ورقم الحديث (١٢٢٢).

**ئیبنی‌موبارەك دەڵێ: صاڵحی موری دەیگوت: (ئەگەر بۆ یەك سات یادی مردنم لێ دابڕێ، دڵم گەندەڵ دەبێ).[1]**

**ئەلدەقاق دەڵێ: ( هەر کەسێك زۆر یادی مردن بکاتەوە، سێ بەهرەی پێدەدرێ؛ خێراکردن لە تەوبەکردن و، قەناعەتی دڵ و، چالاکی پەرستش، هەرکەسێکیش مردن لە بیر بکا خێرا سێ شتی دەگاتێ؛ دواخستنی ژیوانی(تەوبە) و، نارازای بون بەکەمی و، تەمبەڵی لە پەرستش).[2]**

**قورطوبی دەڵێ: (یادی مردن دەبێتە مایەی هەست بە بێزاری کردن لەم دونیا فانیە و، هەمو کاتێك ڕو کردنە خانەی دوایین).[3]**

**دەشگێڕنەوە کە ئافرەتێك گازاندەی دڵڕەقی خۆی لەلای عائیشە** (ڕەزای خــوای لێبێ) **کرد. ئەمیش پێیگوت: (زۆر یادی مردن بکەوە دڵت ناسك دەبێ)، ئەویش وای کرد و دڵی نەرم بو.[4]**

**قورطوبی دەڵێ: زانایان دەڵێن: یادکردنەوەی مردن مرۆ لە گوناهان دەگێڕتەوە و، دڵی ڕەق نەرم دەکا و، بە دونیا شادبون ناهێڵی و، بەسەرهاتان سانا دەکا.[5]**

**هەروەها قورطوبی دەڵێ: زانایان** (بەرمیهری خودا کــەون) **دەڵێن: (هیچ شتێك هێندەی سەردانی گۆڕ بۆ دڵ بە سود نیە، بەتایبەتی ئەگەر دڵانێکی ڕەق بون. جا دەبێ خاوەنی ئەو دڵانە بە سێ شتان چارەسەریان بکەن:**

**یەکەم: وازهێنان لەو بارەی تێیدان، بە ئامادەبون لە کۆڕی زانست و پەند و یاداوەری و ترساندن و خوازیاری و باسوخواسی پیاوچاکان، چونکە ئەمانە دڵان نەرم دەکەن.**

---

[1] الزهد والرقائق: لأبن مبارك: ص(٨٨).

[2] تذكرة القرطبي: ص٩.

[3] تذكرة القرطبي: ص٨.

[4] تذكرة القرطبي: ص١٢.

[5] تذكرة القرطبي: ص١٢.

دووەم: یادی مردن، با گەلێك یادی تێشكێنەری چێژ و خۆشیان بكاتەوە، كە كۆمەڵان لێك پەرتەوازە دەكات و كیژو كوڕان هەتیو دەخات.

سێیەم: تەماشاكردنی ئەوان كەسانی لە ئاوزینگ و سەرەمەرگ دان، چونكە سەیر كردنی مردی و دیتنی ژان و ژوار و ناخۆشیەكانی و، تێڕامان و چاودانە شێوەی پاش مردنی، چێژ و لەزەتی دەرون دەبڕێ و، شادی لە دڵان وەدەر دەنێ و، چاوی بەخەو هەڵدەپشێوێ و، هەسانەوە لەلاشان دادەماڵێ و، هاندەرە بۆ كردەی چاك و، كۆشین و ماندیبون زێدە دەكات).[1]

حەسەنی بەصری باس دەكات كە جارێك چوە سەردانی نەخۆشێك، دیتی وا لەنێو ژوارەكانی مردنێیە، سەیری ئەو سەختیو ناخۆشیەی كرد كە تێی كەوتوە، كە گەڕاوە ماڵێ رەنگ و روی تەواو گۆڕابو، چۆن دەرچوبو ئاوا نەبو، پێیان گوت: بەر میهری خوا كەوی، نان بخۆ، گوتی: هۆ كەسوكارەكەم، خواردن و خواردنەوەی خۆتان بخۆن، سوێند بەخوا مردنێكم دیوە، تا دەیگەمێ كاری بۆ دەكەم.

ئەبو دەرداء، دەڵێ: (ئەوی زۆر یادی مردنێ بكاتەوە شادی كەم دەبێ و، حەسودی كەم دەبێتەوە).[2]

---

[1] تذكرة القرطبي: ص١٢.

[2] كتاب الزهد لأبن المبارك: أنظر آخر الكتاب؛ زوائد كتاب الزهد، رواية نعيم بن حماد: ص٣٧.

## بەندی پێنجەم

# گیان و دەرون

## جیباسی یەکەم

### پێناس و ڕونکردنەوە

هەر کەسێك لە باری دوای مردنی مرۆڤ بتۆژێتەوە، دەبێ بیرۆکەیەك بداتە دەست لەبارەی ئەو گیانەی کە لە پاش مردنێ دەکەوێتە خۆشی یا ئەشکەنجە دەدرێ، چیە؟ ئایا چۆنیەتیەکی دیاریکراوی هەیە؟ ئایا گیان بەشێکە لە جەستە؟ یا شتێکی ترە بێ لە جەستە؟ جا ئەگەر شتێکی ترە، لەکوێی جەستەدا نیشتەجێیە؟ ئایا گیان بەدیهێنراوە؟ لە مرۆڤدا هەر یەکێکە یان پترە؟ ئایا گیانەکان دەمرن، و چۆن دەمرن؟ لە بەرزەخدا ئارامگەیان لە کوێیە؟ ئایا گیانەکان لە بەرزەخڕا شتێك دەربارەی ڕوداوەکانی جیهان دەزانن؟

ئیبنی تەیمیە دەڵێ: ( گیانی مشورگێڕی جەستە کە بە مردن لێی جودا دەبنەوە، ئەو گیانەیە کە فوی پێداکراوە و ئەو نەفسەیە کە بە مردن لێی جیا دەبتەوە).[1] ئەوان کەسانیش بەهەڵەدا چون کە گیان و نەفسیان لێك جیاکردۆتەوە و بیروڕایان وابوە کە دو شتی جیاوازن، هەر کەسێکیش بە وردی لەو دەقانە ڕامێنی کە لە تۆژینەوەکەماندا هێنامانەوە دەزانێ نەفس هەر ئەوەیە کە فریشتەکان دەیکێشن و، بەرەو ئاسمان بەرزی دەکەنەوەو، دەیگێڕنەوە ناو جەستە و، پرسیاری لێدەکرێ و، دەکەوێتە خۆشی یا بەر ئەشکەنجە دەکەوێ، هەمان ئەو گیانەشە ئەگەر لە جەستە دەرچو چاو شوێنی دەکەوێ، هەروەك لە فەرمودااندا هاتوە.

---

[1] رسالة العقل والروح، مجموعة الرسائل المنيرية: ٢/٣٦، أنظر شرح العقيدة الطحاوية: ٤٤٥.

جا ئەو بەدیهێنراوەی ژیان بە بونی وی دەبێ و، بەبێ وی ژیان نامێنێ؛ گیان و نەفسی پێدەگوترێ. هیچیشی تێدا نیە کە گیان و نەفس بۆ شتی دیکە بەکاربێن. ئیبنی تەیمیە دەڵێ: ((بێژەی گیان و ڕەوان بە گەلێك مانا دەردەبڕدرێن؛ بەو هەناسەی لە لاشە دێتە دەرێ و لێی دەچتە ژورێ دەگوترێ گیان. هەروەها مەبەست بە گیان ئەو هەڵمەیە لە بۆشایی دڵ دەردەچێ و بەدەماران دادەگەڕێ، نوژداران ئەمەشیان ناوناوە گیان و، بەگیانی گیانەوەر نێوزەد دەکرێ. جا ئەم دو واتایە جودایە لەو گیانەی لە جەستە جودا دەبتەوەو بریتیە لە ڕەوان (نفس). کە دەگوترێ نەفس مانای شتەکە خۆشی دەگەیەنێ، ڕەنگە مەبەستیش بە (نەفس) ئەو خوێنە بێ کە لەجەستەی گیانداران دایە، هەروەك شەرع ناسان دەڵێن: (ئەوی کە نەفسێکی شلی نیە و، ئەوی کە نەفسێکی شلی هەیە) دیارە ئەم دو واتایەش مانای گیان ناگەیەنن)).[1]

بە جبریلیش دەگوترێ (روح) ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ: روحولئەمین دایبەزاندوە﴾[2].

هەروەها بە قورئانیش دەگوترێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا: هەروەها روحمان بە فەرمانی خۆمان بو تۆش نیگا کرد﴾[3].

ڕاڤەکاری طەحاوی وای تێبینی کردوە، ئەگەرچی گیان و نەفس بەم شتە نەرم و ناسکە خواییە دەگوترێن. بەڵام (ئەگەر گیان بەلاشە پەیوەست بو، زۆربەی جار پێی دەگوترێ نەفس، بەڵام ئەگەر بە ڕەهایی باسکرا، زیاتر گیانی پێدەگوترێ).[4]

ئیبنی تەیمیەش لەم بارەیە دەڵێ: (لەبەر مشورگێڕی لاشە بە ڕەوان (نەفس) ناودەبرێ. لەبەر سوکی و نەرمیش پێی دەڵێن گیان (روح)، بۆیەشە بە با دەڵێن

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢/٣٩).

تێبینی: دیارە هەموو ئەو لێکدانەوانە بەپێی زمانی عارەبی و زانستی ئەوکاتەن. وەرگێڕ–

[2] سورة الشعراء: ١٩٣.

[3] سورة الشورى: ٥٢.

[4] شرح العقيدة الطحاوية: ص٤٤٤.

روح. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الريح من روح الله: با لە رۆحی خودایە))[1]. واتە لەو رۆحەیە کە خودا دروستی کردوە.[2]

## جێباسی دووەم

## ئایا گیان چۆنیەتیەکی زانراوی هەیە؟

لەبەر ئەوەی گیان لە رەگەزێك بەدیهێنراوە کە لە جیهانی بەرهەستدا هاوشێوەی نیە، ئێمە ناتوانین سیفەتەکانی بزانین. خودا پێی راگەیاندوین کە گیان هەڵدەکشێ و دادەکشێ و، دەبیستێ و دەبینێ و دەدوێ و شتی دیکەش، بەڵام ئەم سیفەتانە جیاوازن لە سیفەتە بەرچاوەکانی تەنە ناسراوەکان، بەرزبونەوە و دابەزین و بیستن و دیتن و هەستان و دانیشتن بەو شێوەیە نیە کە ئێمە دەیزانین و پێی ئاشناین. پێغەمبەر ﷺ پێی راگەیاندوین کە گیان لە ساتە وەختێك بەرەو بەرزایی ئاسمانان هەڵدەکشێ و، پاشان بۆ گۆڕ دەگێردرێتەوە، هەواڵی ئەوەشی پێداوین کە گیان لە گۆڕدا دەکەوێتە نێو بەهرە و خۆشیان یان توشی ئەشکەنجان دێ. گومانیش لەوەدا نیە کە ئەو بەهرە و خۆشیە جیایە لەوەی کە ئێمە پێی ئاشناین.

---

[1] رواه البخاري في الأدب المفرد، وأبو داود والحاكم.

[2] رسالة العقل والروح، مجموعة رسائل المنيرية: (٢/٣٧).

# جێباسی سێیەم

## سەربەخۆیی گیان لە جەستە [*]

(هەندێك لە ئەهلی کەلامی بیدعەچی و ئاشوبگێڕ لە جوهمیەو موعتەزیلە رایان وایە کە گیان بەشێکە لە جەستە، یا یەکێکە لە سیفەتەکانی، وەك بڕێکیان دەڵێن: گیان نەفسە یا ئەو بایەیە کە لە جەستەدا دێو دەچێ. هەندێکی دیکەشیان دەڵێن: گیان ژیانە یا میزاجە یا خودی لاشەیە.)[1]

پیتۆڵەکانی سەر بە قوتابخانەی ئەرستۆش[2] دان بەوەی دادەنێن کە گیان دەمێنێ پاش ئەوەی لە جەستە جودا دەبێتەوە. بەڵام سیفاتی پوچ دەدەنە پاڵ گیان و دەڵێن: ئەگەر لە لاشە دابڕا دەبێتە عەقڵ، عەقڵیش لەلای وان لە ماددە داماڵراوە و پەیوەندی پێوە نیە، ماددەش لەلای وان جەستەیە، عەقڵیش لەلای وان شتێکی سەربەخۆیە و بەجوڵە و بەجێگیر بون وەسف ناکرێ و هیچ بارێکی نوێی بە سەر نایێ.)[3]

بەڵام هەردو کۆمەڵ لەبارەی گیان تێکەوتون، ئەوانەی کە ئەهلی کەلام و بیدعەچین و دەڵێن: گیان بریتیە لە ژیان یا میزاج یان خودی جەستە، زۆربەیان ئەشکەنجەی گۆڕ ڕەت دەکەنەوە و باوەڕیان پێ نیە، بەڕای وان هیچ گیانێك نیە دوای مردن لەبەرزەخدا لە خۆشی یا ئەشکەنجەدا بێ، هەمو ئەو دەقانەش ڕەت دەکەنەوە کە ئەمە دەسەلمێنن.

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الإسلام ابن تيمية: (٣١/٣)، رسالة العقل والروح لأبن تيمية، انظر مجموعة الرسائل المنيرية: (٢١/٢).

[2] ئەم پیتۆڵانە ئەوانە دەگریتەوە کە سەر بە فەلسەفەی ئەرستۆن و بە (المشاؤون) ناسراون. هەروەك لەدەقە عەرەبیەکەدا هاتوە-، بۆیەش وا ناونراون چونکە مامۆستاکەیان لەکاتی ڕاڤەکردنی ڕێبیرەکانی، هاتوچۆی دەکرد. وەرگێر-

[3] مجموعة الرسائل المنيرية، رسالة العقل والروح: (٢١/٢).

ئەو پیتۆڵانەش کە دەڵێن گوایە گیان لە جەستە جودا ببتەوە دەبتە عەقڵ، دەڵێن: (ئەگەر لەلاشە دابڕا هیچ بارێکی نوێی بەسەر نایێ نە زانست و نە بۆچون و، نە بیستن و نە دیتن و، نە ویست و، نە شادی و نە ئاسودەیی و، نەهیچی دیکە لەوانەی کە رەنگە روبدا، بەڵکو بەبۆچونی وان تا هەتایێ بەیەك بارو شێوە دەمێنێتەوە، هەروەك بۆ عەقڵ و دەرون گریمانیان کردوە.)[1]

هەندێکیش لە پیتۆڵان گیان بە سیفاتی وا وەسف دەکەن کە هەربو(واجب الوجود)ی پێ وەسف دەکەن، لەکاتێکدا وەسفن بۆ شتی هەرنەبو(ممتنع الوجود)، جا دەڵێن: گیان نە لەناو جەستەدایە نە لەدەرەوەی، نە لە جەستە جودایە، نەتێکەڵی بوە، نەدەجوڵێ و نەناجوڵێ، نە هەڵدەکشێ و نەدادەکشێ، نە جەستەیە نە جەستە نیە.[2]

ئەو هۆکارەی هەردو کۆمەڵی توشی ئەم هەڵەیە کردون، ئەوەیە کە پشتیان بە عەقڵ وئاوەزی خۆ بەستوە و پێوەریان بۆ تۆژینەوەی مەسەلەیەکی پەنهان دارشتوە؛ کۆمەڵی یەکەمیان باوەڕی بە گیانێکی سەربەخۆ لە جەستە نیە، ئەمەش باوەڕ نەکردنە بە دەقە موتەواتیرەکان و، ڕەتکردنەوەی بەڵگەنەویستێکی ئاینە. پیتۆڵەکان و هاوڕێبازەکانیان، بونی گیانی لە جەستە دابڕاو و سەربەخۆیان سەلماندوە، بەلأم لەبەر ئەوەی گیان (لەهەمان ڕەگەزی لاشە نیە، لە ڕەگەزی توخمەکانی تر و پەیدابوەکانیان نیە، بەڵکو ڕەگەزێکی جودایە لەو ڕەگەزانە)،[3] پێناسە و تێڕوانینیان لەلا گران بوە و، واژە و دەربڕین و پێوەرەکانیان لە ئاست تێفکرین و سنوردار کردنی تەسك بۆتەوە، خوداش ڕێنمایی ئەوانی کردوە کە وەرامی خودا و پێغەمبەرەکەیان دایەوە، بڕوایان بە هەواڵەکانیان هێناوە، جا زانیان کە (چۆنیەتی گیان جودایە لەم جەستە بەرهەستەو بریتیە لە تەنێکی نورانی بەرزو بالأی ناسکی زیندوی جولأو، بە گەوهەری ئەندامانداا ڕۆدەچێ و، چۆن ئاو لەناو

---

[1] مجموعة الرسائل المنيرية، رسالة العقل والروح: (٢/٢٢).

[2] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٣/٣١).

[3] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٣/٣٢).

**گوڵدا دێ و دەچێ و، چەوری لەناو ڕۆنـدا دەجوڵـێ و ئـاگر لـەنێو خـەڵوزدا، ئـاوا گیانیش لەنێو جەستە و ئەندامان دایە. جا تاکو ئەم ئەندامانە ساز و گونجاو بن بۆ شوێنەوارەکانی ئەو تەنە ناسکە، ئەوا تەنە ناسکەکە هەر پێیوە پەیوەست دەبێ و لێی گیردەبێ و، ئەو شوێنەوارانەش بەکەڵکی دێن لە هەست و جوڵـە و ویسـتدا، بەڵام ئەگەر ئەم ئەندامانە بەهۆی زاڵی تێکەڵە قورس و ئەستورەکان گەند بون و، لە قبوڵکردنـی شـوێنەوار و کاریگەریـەکانی گیـان دەرچـون، گیـان لـە جەسـتە جـودا دەبێتەوە، بۆ جیهانی گیانان دادەبڕێ).[1]**

**لە دوتوێی تۆژینەوەکەشماندا گەلێك بەڵگەمان هێناوەتەوە کە دەسەلمێنن گیان سەربەخۆیە لە لاشە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَـــى عَلَيْهَا الْمَــوْتَ: **خودا لـە کـاتی مرنـدا گیانگەلێك دەستێنێ و کەسێك کە لە خەوی خۆیدا نەمردوە، جا گیانگەلێ کە فەرمانی مەرگیان بۆ هاتوە ڕادەگرێ**﴾[2].

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلاَئِكَةُ يَضْرِبُــــونَ وُجُوهَــهُمْ وَأَدْبَــارَهُمْ: **ئەگەر لەسەرەمەرگدا چاوت بە کافران بکەوێ کە فریشتەکان دەیانمرێنن و لـە دەم و چاو و پشتیان هەڵدەدەن.**﴾.[3]

﴿وَالْمَلاَئِكَةُ بَاسِطُوا أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمْ: **فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن**

---

[1] ئەمە پێناسەي ئیبنوقەییمە بۆ گیان لە کتێبی (الروح)دا، هەروەها سەفاریتی لە کتێبی (لوامع الأنـــوار البهيـــة ٢٩/٢)دا هێناویەتەوەو دەیداتە پاڵ ئیبنوقەییم، ڕاڤەکاری طەحاویش بەهەمان دەق هێنایتیەوە بێئەوەی بیداتە پاڵ کەسێك. سەیری ڕاڤەی طەحاوی بکە لاپەڕە(٤٣٣).

ئیبنوقەییم پاش هێنانی ئەو پێناسەیە دەڵێ: (ئەمە ڕاستترین گۆتەیەو لەوەش بترازێ هیچی کە ڕاسـت نین و، هەر گۆتەیەکی دیکە پوچ و بەتاڵن، ئەمەش بەڵگەی هەیە لە قورئان و فەرمودەو کۆڕایی هاوەڵان و، بەڵگەی عـەقڵ و فیترەت، پاشان سەد و پانزە بەڵگەی هێناوەتەوەو، چاکی کردوەو سودێکی زۆری گەیاندوەو قسەی ئیبنو سیناو ئیبنوحەزم و هاووێنەی ئەوانی پوك کردوە.

[2] سورة الزمر: ٤٢.

[3] سورة الأنفال: ٥١.

و پێیان دەڵێن: دەخۆتان لە گیان کێشان رزگار بکەن.﴾[1]

﴿كَلاَّ إِذَا بَلَغَتْ التَّرَاقِي، وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ، وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ، وَالْتَفَّتْ السَّاقُ بِالسَّاقِ، إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ: کاتێك گیان گەیشتە قورقوڕاگە و، گوترا کێ چارەسازە، زانی ئەوەی توشی بوە مردن و جیابونەوەیە، قاچ لە قاچ ئالاَ، لەوێ رۆژێ راپێچکران و ئاژوان بۆ لای پەروەردگارتە﴾[2].

﴿فَلَوْلاَ إِذَا بَلَغَتْ الْحُلْقُومَ، وَأَنْتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ: کاتێ گیان دەگاتە گەرو و، لەو دەمەدا ئێوە تەماشا دەکەن.﴾[3]

جا ئەو شتەی رادەگیرێ و، فریشتە دەیمرێنن و، دەگاتە گەرو و دەگاتە قورقوڕاگە و، ئەوەی راپێچ دەکرێ، دەبێ شتێکی ڕاستەقینەی لە لاشە جیاواز و جودا بێ.

ئەو فەرمودانەشمان هێناوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین، فریشتەی مەرگەوان گیان دەکێشێ و، فریشتەکان ئەو گیانە دەخەنە کفنێکی بەهەشت یا دۆزەخ و ئەمەش بەپێی باشی و خراپی، ئەوجا گەشتێکی ئاسمانی پێدەکرێ و، ئەگەر چاك بو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ ئاوەڵا دەکرێ، ئەگەر خراپیش بو لێی دادەخرێ و، پاشان بۆ جەستە دەگێڕدرێتەوە و، پرسیاری لێ دەکرێ و، ئەشکەنجە دەدرێ یا بەهرەمەند دەکرێ و، گیانی شەهیدانیش لە چیکڵدانەی باڵندەی سەوزن و، گیانی بڕوادارانیش باڵندەن لەسەر درەختی بەهەشت و، ئەگەر گیان کێشرا چاو بە دویدا وێڵ دەبێ، لەگەڵ چەندانیدیکە لە دەقیوا کە بەتێکڕایی بەڵگەی بڕەڕن کە گیانەکان شتی دیکەن و جودان لە لاشە جودان و، پاش جودابونەوەشیان لە جەستە هەر دەمێنن.

---

[1] سورة الأنعام: ٩٣.
[2] سورة القيامة: ٢٦-٣٠.
[3] سورة الواقعة: ٨٣-٨٤.

## جێباسی چوارەم

# نشینگەی گیان لە جەستەدا

گیان لە هەمو لاشەی مرۆڤدایە، ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (گیان بەهیچ شوێنێکی جەستە تایبەتمەند نیە، بەڵکو بەهەمو جەستەدا بڵاوە و وەکو ژیان هەمو جەستەی داگرتوە، گیان مەرجە بۆ ژیان، کە گیان لە جەستەدا بو ژیانیشی تێدا دەبێ، بەڵام کە گیان لەلەش دابڕا و جودا بۆوە، ژیانیش نامێنی و جیا دەبێتەوە).[1]

[1] رسالة العقل و الروح، مجموعة الرسائل المنيرية: (٢/٤٧).

## جێباسی پێنجەم

# گیان بەدیهێنراوە

**کۆمەڵێك لە پیتۆلان وای بۆچون کە گیان بەدیهێنراو نیە، کۆنینەیەو هەر لەسەرەتاوە هەبوە، بەڵام لە خودی پەروەردگاریش نیە، ڕایان لە بارەی گیان هەمان ڕایە لە بارەی عەقڵ و نەفسی فریشتەیی و، هەندێکیش دەڵێن هەر فریشتەن.**

**هەندێك گومڕاو لە دین دەرچوانی ئەم ئوممەتەش، لە ئەهلی کەلام و سۆفی و بیدعەچییان، دەڵێن: گیان لە خودی خوداوەیە. جا ئەوانە هەروەك ئیبنی تەیمیە دەڵێ: زۆر بەدگۆترن لەوانی دی، چونکە مرۆڤیان کردۆتە دو بەش؛ نیوەی لاهوت کە گیانیەتی و، نیوەی ناسوت کە جەستەیەتی، نیوەی پەروەردگارە و نیوەی بەندەیە.[1]**

**ئەو ڕاستی و ڕەوایەی کە گومانی تێدا نیە و نابێ لە ئاستی جیاڕایی هەبێ ئەوەیە کە گیان بەدیهێنراوەو داهێنراوە، کۆمەڵێك بەڵگەش بۆ ئەوە هەن:**

**١- کۆڕابون(الاجماع): ئیبنی تەیمیەی شێخیئیسلام دەڵێ: (گیانی ئادەمیزاد داهێنراوە، بە یەکدەنگی پێشینەی ئوممەت و تێکڕای ئەهلی سونەت و، زیاتر لە پێشەوایەکی موسڵمانیش، کۆڕایی زانایانی باسکردوە لەوەی کە گیان بەدیهێنراوە، وەکو پێشەوای ناودار موحەممەدی کوڕی نەصری مەروزی، کە زاناترین کەسی سەردەمی خۆی بوە لە کۆڕایی و جیاوازیەکاندا، یا یەکێك بوە لە زاناترینیان.**

**هەروەها موحەممەدی کوڕی قوتەیبە لە (کتاب اللقط)دا دەربارەی بەدیهێنراوی گیان ئاخاوتوە، دەڵێ: تێکڕای خەڵکیش لەسەر ئەوەن کە خودا جەستەی**

---

[1] فتاوي شيخ الاسلام: (٤/٢٢٢).

بەدیهێناوە و گیانیشی وەدیهێناوە.

ئەبو ئیسحاقی کوڕی شاقلا لە وەڵامی پرسیارێکی لەم بابەتە دەڵێ: بەرمیهری خودا کەوی، پرسیارت کردوە ئایا گیان بەدیهێنراوە یان نا؟ دەڵێ: هیچ کەسێکی ڕێنماکراو گومان لەو مەسەلەیە ناکات، هەتا دەڵێ: گیانیش لەشتە بەدیهێنراوەکانە، گەلێك تایەفە لە گەورە زانایان و ماموٚستایان لەم بابەتە دواون و، وەرامی ئەوانەیان داوەتەوە کە دەڵێن گیان بەدیهێنراو نیە.

هەروەها ئەبو عەبدوڵلای کوڕی مەندەی حافیز کتێبێکی گەورەی لەم بابەتە نوسیوە بە نێوی (الروح و النفس) و گەلێك فەرمودە و شوێنەواری لەم بارەوە تێدا هێناوەتەوە. لە پێش ئەویشدا، موحەممەدی کوڕی نەصری مەروزی و غەیری وی، لەگەڵ شێخ ئەبو یەعقوبی خەڕاز و، ئەبو یەعقوبی نەهرجوری و، ئەبو یەعلای قازی و غەیری وان، پێشەوا گەورەکانیش هەمان ڕایان هەیە و، زۆر توندیشن لە ئاست ئەوانەی لەبارەی عیسای کوڕی مەریەم وا دەڵێن، هەروەك ئەحمەدی پێشەوا لەکتێبی (الرد علی الزنادقة و الجهمية)دا باسی کردوە.[1]

٢- قورئان و فەرمودە: بەڵگە گەلێکن لە قورئان و فەرمودەدا لەسەر بەدیهێنراوی گیان، وەك خوای بەرز دەفەرمویٚ: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ: خودا بەدیهێنەری هەمو شتێکە﴾[2]، جا ڕاڤەکاری طەحاوی پاش بەڵگە هێنانەوەی بەم ئایەتە دەڵێ: (ئەمە گشتگرە و هیچ ڕوی تایبەتمەند کردنی تێدا نیە.).[3]

هەروەها خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً: بێگومان ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیدا هات، کە شتێکی وا نەبو ناو ببردرێت.﴾[4]

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٤/٢١٦).
[2] سورة الرعد١٦، وسورة الزمر٦٢.
[3] شرح الطحاوية: ص٤٤٢.
[4] سورة الانسان: ١.

هەروەها بە زەکەریای فەرمو: ﴿وَقَـدْ خَلَقْتُـكَ مِـنْ قَبْـلُ وَلَـمْ تَكُـنْ شَـيْئًا: من لە پێشدا تۆم بەدیهێنا و هیچ شتێك نەبوی﴾.[1]

مرۆڤیش ناوە بۆ گیان و جەستەی مرۆڤ، وتاری خوداش بۆ زەکەریا ئاڕاستەی گیان و جەستەی بو، ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (مرۆڤ بریتیە لە گیان و جەستە پێکەوە، بەڵکو زێتر تایبەتە بە گیان، چونکە جەستە چاوەڕێی گیانە، هەروەك ئەبو دەرداء دەڵێ: لاشەکەم چاوەڕێمە، ئەگەر چاوم لێی بێ دەمگەیەنێتە جێ، ئەگەر نا نامگەیەنێ. ئەمەش ئیبنی مەندە و کەسانی دی لە ئیبنی عەبباس دەیگێڕنەوە، دەڵێ: لە رۆژی دوایی کێشە لەنێوان بەدیهێنراوەکاندا بەرپا دەبێ، تا دەگاتە کێشەی گیان و جەستە، جا گیان بە جەستە دەڵێ: تۆ کاری خراپت کرد، جەستەش بە گیان دەڵێ: تۆ فەرمانت پێدام بیانکەم. جا خودا فریشتەیەك دەنێرێ تا ناوبژیان بکا، پێیان دەڵێ: ئێوە وەکو ئیفلیج و کوێرێك وان کە دەچنە نێو بێستانەکی. ئیفلیجەکە بەرێکی دی بەدارێوە، بە کوێرەکەی گوت: بەری داران دەبینم و ناتوانم بۆیان هەستم، کوێرەکە گوتی: بەڵام من دەتوانم هەستم، کەچی نایبینم. ئیفلیجەکە گوتی: دەوەرە هەڵمگرە تابیرنم، کوێرەکە هەڵی گرت و ئەویش رێی نیشاندا تا گەیشتە جێی مەبەست و بەروبومەکەی رنی، فریشتەکە گوتی: جا سزا لەسەر کامیانە؟ گوتیان: لەسەر هەردوکیان. گوتی: ئێوەش ئاوان).[2]

٣- لەگەڵێك شوێنی ئەم تۆژینەوەماندا دەقگەلێکمان لە پێغەمبەرﷺەوە هێناوە کە گیانەکان دەستێنرێن و دەخرێنە نێو کفن و بۆنێك کە فریشتەکان هێناویانن و، بەرز دەکرێنەوە و، بەهرەمەند یا ئازاربار دەبن و، لە نوستنیشدا دەگیرێن و، بەرەڵا دەکرێن و ئەمانەش هەمو باری دروست کراوێکی وەدیهاتون.

٤- ئەگەر بەدیهێنراو و خاوەن پەروەردگار نەبوایە دانی بە پەروەردگاردا نەدەنا، چونکە کاتێك خودا پەیمانی لە بەندان وەرگرت بە گیانانی گوت: ئایا من

---

[1] سورة مريم: ٩.
[2] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٢٢٢/٤).

**پەروەردگاری ئێوە نیم؟ گوتیان: بەڵێ. هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ:**

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى...: **زەمانێك كە پەروەردگارت لە پشتی وەچەی ئادەم، ڕۆڵەكانی ئەوانی دەرهێنا و كردنیە شایەد لەسەر خۆیان و فەرموی: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ، شایەدی دەدەین.**﴾[1]

**جا كە خوا پەروەردگاریان بێ كەواتە ئەوانیش بەدیهێنراون و دروست كراون.**

**٥- ئەگەر گیانەكان بەدیهێنراو نەبن، گاورەكان سەركۆنەیان نایەتە سەر كە عیسا دەپەرستن، یا كە دەڵێن كوڕی خوایە، یا كە دەڵێن خودایە.**

**٦- ئەگەر گیان بەدیهێنراو نەبوایە، نەدەچوە دۆزەخ و ئەشكەنجە نەدەدرا و، لە ئاست خوداش پەردەپۆش نەدەبو و لە جەستەشدا پەنهان نەدەبو و، فریشتەی مەرگیش نەیدەكێشاو، وەسف نەدەكرا و، لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەدەكرا و، ئەشكەنجە نەدەدرا و، بەندایەتی نەدەكرد و نەدەترسا و، تكای نەدەكرد، لەبەر ئەوەش كە گیانی بڕواداران پڕشنگ دەدا و، گیانی بێبڕوایانیش وەك ڕەژو ڕەشن.**[2]

---

[1] سورة الأعراف ١٧٢.

[2] ئەم سێ بەڵگەیەی دوایی ئەبو سەعیدی خەراز دەیانهێنێتەوە، كە لە گەورە شێخەكانی ئوممەت و نـ هاودەمانی جونەید بوە. ئیبنو تەیمیەش لەویەوە رایدەگوێزێ. سەیری (مجموع الفتاوي ٤/٢٢٠) بكە.

## جێباسی شەشەم

## گومانگەل(شبهات)ی ئەوانەی دەڵێن گیان بەدیهێنراو نیە

ئەوانەی دەڵێن گیان بەدیهێنراو نیە، هاوشێوەی ئەو ئایەتە پیرۆزەیان کردۆتە بیانو کە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي: لەبارەی روحەوە لێت دەپرسن، بڵێ روح لە فەرمانی پەروەردگارمە﴾[١].

وەڵامی ئەمەش لە چەند روێکەوەیە:

یەکەم: روح لێرەدا گیانی ئادەمی نیە، بەڵکو ناوی فریشتەیەکە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا: لە رۆژێکدا کە جبریل و فریشتەکان بەرێز دەوستن.﴾[٢]، هەروا دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ: فریشتەکان و جبریل بۆ لای خودا سەردەکەون.﴾[٣] دیسان دەفەرموێ: ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ: لەو شەوەدا فریشتەکان و جبریلیش بە فەرمانی پەروەردگاریان دابەزین.﴾[٤] دیارە ئەمەش بۆچونێکی ناوداری زانایانی پێشینە لە راڤەی ئەو ئایەتەدا.

دوەم: ئەگەر بشڵێن لێرەدا مەبەست گیانی ئادەمیزادە -هەروەك کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف وادەڵێن- هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە کە گیان دروست کراو نیە و، بەشێکە لە خودی خودای بەرز. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە گیان دراوەتە پاڵ خودا چونکە بەفەرمانی وی پێکهاتوە، یان بە وشەی خودا هاتۆتە بون. وشەی (امر)یش

---

[١] سورة الأسراء: ٨٥.
[٢] سورة النباء: ٣٨
[٣] سورة المعارج: ٤
[٤] سورة القدر: ٤

لـه قورئـانـدا هـەندێك جـار بـە مانـای چـاوگ دێ و هـەندێ جـاریش بـەمانای بـەرکار(مفعـول) بـەکار دێ و فـەرمان پێکـراوە. هـەروەك خـودا دەفـەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوهُ: فەرمانی خـوا هـاتوە جا لێی بەپەلە مەبن.﴾[1] لێرەدا مەبەست فەرمان پێکراوە. هەروەها دەکرێ بڵێین بێژەی (مِنْ) لەئایەتەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ بۆ دەسپێکی مەبەستە، هەروەك ئاشکرایە (مِنْ) بۆ دیـاریکردنی رەگـەز دێ، وەك دەڵێـن: (بـاب مـن حدیـد: دەرگەیـەکی لـە ئاسـن). بەدەسپێکی مەبەستیش دێ، وەك دەڵێن: (خرجت من مكة: لە مەککە هاتمە دەر). جا کە دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ ئەو مانایە ناگەیەنێ کە گیان بەشێك بێ لە فەرمانەکە یا لە توخمی وی بێ. بەڵکو بۆ دەسپێکی مەبەستە، چونکە بە فەرمانەکە وەدی هـاتوە و، لـەوێوە سـەرچاوەی گرتـوە، ئەمـەش واتـای وەڵامەکـەی پێشـەوا ئەحمەدە کە دەڵێ: (و روح منه: گیان لە فەرمانی ئەوەوەیە)، هـەروەك خـودای بـەرز دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: ئـەوەی لـە ئاسمانـەکان و لـە زەویدایـە، خـودا هـەموی لەلایـەن خۆیـەوە بـۆ ئێـوە رام کردوە﴾[2]، هـەروەها کـە فـەرمودەی: ﴿وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ: هەر بەهرەو نیعمەتێکی ئێوەی تێدان، لە خواوەیە﴾.[3]

جا ئەگەر رەخسێنراوەکان ونیعمەتەکان لەخوداوە بن و، بەشێك نەبن لە خودی وی، بەڵکو لە خوداوە هاتبن، کەواتە ئەگەر لەبارەی مەسیح فەرموی: ﴿رُوحٌ مِنْهُ﴾ مانای وانیە بەشێکە لە خودی وی.[4]

گومانی دوەم: کە خودای بەرز لەبارەی ئادەم دەفەرموێ: ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي: لـە رۆحـی خـۆم فـوم پێداکـرد﴾[5]، هـەروەها لـەبارەی عیسـا دەفـەرموێ:

---

[1] النحل: ١

[2] الجاثية: ١٣

[3] النحل: ٥٣

[4] بۆ زیاتر لەم تۆژینەوەیە بگەرێوە بۆ: مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٤ /٢٢٦ ٢٣٥).

[5] الحجر: ٢٩

﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا: له رۆحی خۆمان فومان پێداكرد﴾[1]. دەڵێن: خودا روحی داوەتە پاڵ خۆی.

جا ڕاڤەكاری طەحاوی وەڵامی ئەم گومانەی داوەتەوە و، دەڵێ: (دەبێ بزانرێ ئەوانەی دەدرێنە پاڵ خودا دو جۆرن؛ هەندێك سیفەت كە لەخۆڕا پەیدا نابن، وەكو زانست و توانا و، ئاخاوتن و بیستن و دیتن، جا ئەمانە سیفەتن دراوەنەتە پاڵ وەسفكراو، چونكە زانست و ئاخاوتن و توانا و ژیانی خودا، سیفاتی وین هەروەك ڕو و دەستی پیرۆزی.

دوەم: دانە پاڵی هێندێك خودی جودا لە خودا، وەكوماڵی خوا و، حوشترەكە و، بەندە و، پێغەمبەر ﷺ و، روح، وەك دەفەرموێ:

﴿نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا: وشترە مێینەكەی خودا و ئاو خواردنەوەكەی﴾[2].

﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ: گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی قورئانی بۆ بەندەی خۆی نازل كردوە﴾[3].

﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ: ماڵەكەم بۆ تەوافكاران پاك بكەوە﴾[4].

ئەمەش دانە پاڵی بەدیهێنراوە بۆ بەدیهێنەرەكەی، بەڵام دانەپاڵێك كە تایبەتمەندی و پیرۆزی دەخوازێ كە پاڵدراوەكەی پێ دەناسرێتەوە.[5]

---

[1] الانبياء: ٩١

[2] الشمس: ١٣

[3] الفرقان: ١

[4] الحج: ٢٦

[5] شرح الطحاوية: ص٤٤٢، وراجع رسالة الروح، مجموعة رسائل المنيرية: (٣٨/٢).

# جێباسی هەفتەم

## جۆرەکانی نەفس

**خودای بەرز هەواڵی پێداوین کە سێ جۆرە ڕەوان (نەفس) هەیە:**

**نەفسی خراپەخواز:** ﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّي: **بەڕاستی نەفس فەرمان بە خراپەکاری دەدا. مەگەر ئەوەی پەروەردگارم ڕوحم بکا﴾.**[1]

**نەفسی سەرزەنشتکار:** ﴿وَلاَ أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ: **سوێند بە نەفسی سەرزەنشتکار﴾.**[2]

**نەفسی ئارام:** ﴿يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ، ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً، فَادْخُلِي فِي عِبَادِي، وَادْخُلِي جَنَّتِي: **ئەی نەفسی ئارخەیان بگەڕێوە لای پەروەردگاری خۆت بەخۆشنودی و پەسندکراوی، ئەوجا بچۆ نێو ڕیزی بەندە نێزیکەکانی من و، بڕۆ ناو بەهەشتی من.﴾**[3]

**لێرە مراز ئەوە نیە کە هەر مرۆڤێك سێ نەفسی هەن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەمانە سیفەت و حاڵی یەك خودن، جا ئەگەر ئارەزو بەسەر دەروندا زاڵ بو بەهۆی ئەنجامدانی گوناح و تاوان، ئەوە دەبێتە نەفسێکی خراپەخواز؛ نەفسی لۆمەکاریش ئەوەیە کە گوناهان دەکا و لێیان پەشیمان دەبتەوە و، ناونراوە سەرزەنشتکار**

---

[1] سورة يوسف: ٥٣.

[2] سورة القيامة: ٢.

[3] سورة الفجر: ٢٧-٣٠.

چونکـه لۆمـه و سـەرکۆنەی خاوەنەکـەی دەکـا لەسـەر گوناهـان، هـەروەها وشـەی (اللوامة) بە مانای ئەوەش دێت کە لەنێوان چاکەکاری و خراپەکاریدا دێودەچێ. نەفسی ئارخەیانیش(مطمئنة) بریتیە لەوەی کە خێر و چاکەکاری خۆشدەوێ و دەیانخوازێ و، رقی لە شەڕو خراپەیە و دەیانبوغزێنێ و، ئەمەش بۆتە رەوشت و داب و نەریتی.[1]

راڤەکاری طەحاویش پاش باسکردنی جۆرەکانی نەفس، دەڵێ: (ڕاستی وایە: کە یەك نەفسە، سیفەتان وەردەگرێ، بۆ خۆی خراپەخوازە، کە بڕوا پێشی لێگرت دەبێتە سەرزەنشتکار، گوناهان دەکا و پاشان سەرکۆنەی خاوەنەکەی دەکا و، لەناو گوناح و خێردا دێ و دەچێ، ئەگەر بڕواش بەهێز و پتەو بو دەبێتە دەرونێکی ئاسودە(مطمئن)).[2]

---

[1] بگەڕێوە بۆ رسالة العقل والروح لإبن تيمية، مجموعة الرسائل المنيرية: (٢/٤١).

[2] شرح الطحاوية: ص٤٤٥.

## جێباسی هەشتەم

# ئایا نەفسەکان دەمرن ؟

ئیبنی تەیمیە دەڵێ: ( گومان لەوەدا نیە کە گیانانیش بەدیهێنراون، هەرگیز تونا نابن و لەناو ناچن، بەڵام مردنیان بە دابڕانە لە لاشە و، لەگەڵ دوەم فوی کەڕەنادا گیان بۆ لاشە دەگێڕدرێتەوە).[1]

ڕاڤەکاری طەحاوی باسی ئەم مەسەلەی کردوە و، دەڵێ: (خەڵکی جیاڕان لەوەی ئایا گیان دەمرێ یان نا؟ هەندێك گوتیان: دەمرێ چونکە نەفسە؟ هەمو نەفسێکیش مردن دەچێژێ، جا ئەگەر فریشتەکان بمرن، ئەوا نەفسی مرۆڤ بۆ مردن شایستەترە. هەندێکی تر دەڵێن: گیانان نامرن، چونکە بۆ مانەوە بەدیهێنراون، بەڵام لاشەکان دەمرن، دەڵێن: ئەو فەرمودانەش بۆ ئەمە بەڵگەن کە باس لە بەهرە و ئەشکەنجەی گیانان دەکەن، پاش جودابونەوەیان، هەتا خودا بۆ جەستەکانیان دەگێڕێتەوە.. ڕاستیش وایە بگوترێ: مردنی گیانان بریتیە لە جودابونەوە و دەرچونی لە جەستەکان، ئەگەر مەبەست لە مردنی هێندە بێ، ئەوا گیانیش مردن دەچێژێ، بەڵام ئەگەر مەبەست تونابون و بەتەواوی لەناوچونە، بەم مەبەستە بێ گیان نامرێ، بەڵکو هەر دەمێنێ، جا لە خۆشیدا بێ یا لە ئازار، خودای بەرزیش هەواڵی پێداوین کە بەهەشتیەکان ﴿لاَ يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلاَّ الْمَوْتَةَ الأُولَى: بێجگە لە مردنی یەکەم مردنی دیکە ناچێژن.﴾[2] ئەو مردنی یەکەمەش بریتیە لە جودابونەوەی گیان لە جەستە).[3]

---

[1] مجموع الفتاوي: (٤/٢٧٩).

[2] سورة الدخان: ٥٦

[3] شرح الطحاوية: ص٤٤٦.

## جێباسی نۆیەم

# ئارامگەی گیانەکان لەبەرزەخدا

**گیانی بەندان لە بەرزەخدا پلە و پایەیان جودایە، جا بە تێڕامانی ئەو دەقانەی لەم بارەیەوە هاتون، توانیمان ئەم دابەشەی خوارەوە بکەین:**

**یەکەم/ گیانی پێغەمبەران: ئەمانە لە چاکترین نشینگە و بەرز و بالاترین پایەدا دەبن. عائیشە خانم گوێی لێبو پێغەمبەر ﷺ لەدوا چرکەکانی ژینیدا دەیفەرمو: ((اللهم الرفيق الاعلى: خودایە! هاوەڵی هەرەبەرز و بالا)).[1]**

**دوەم/ گیانی شەهیدان: ئەوانەش زیندون و لەلای پەروەردگاریان رۆزی دەدرێن. خودای بەرز دەفەرمێ** ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ: **هەرگیز گومان مەبەن ئەوانی لە رێگەی خودا کوژراون مردون، بەڵکو زیندون و لای پەروەردگاری خۆیان بژێو و رۆزی دەدرێن.﴾.[2] جا مەسروق لە بارەی ئەم ئایەتە پرسیاری لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کرد، ئەویش گوتی: ئێمەش هەمان پرسیارمان کرد، فەرموی:** ((أرواحهم في أجواف طير خضر، لها قناديل معلقة بالعرش، تسرح من الجنة حيث شاءت، ثم تأوي الى تلك القناديل: **گیانەکانیان لە هەناوی باڵندەی سەوزدان، چرای بەعەرش هەڵواسراویان هەیە، کوێیان حەزلێبێ لە بەهەشتدا بۆ وێ دەچن، پاشان لەو چرایانەدا ئارام دەگرن و دەحەوێنەوە))[3].**
**ئەوانەش گیانی هێندێك شەهیدان نەهەمویان، چونکە هی وایان تێدایە گیانیان رێی چونە بەهەشتی پێنادرێ چونکە قەرزیان لەسەرە، هەروەك لە موسنەددا لە عەبدوڵلای کوڕی جەحش هاتوە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئەی**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب من أحب لقاء الله، فتح الباري: (٣٥٧/١١).

[2] سورة آل عمران: ١٦٩.

[3] رواه مسلم في صحيحه؛ مشكاة المصابيح: (٣٥١/٢).. فەرمودەکە درێژەی هەیە.

**پێغەمبەری خوا، چیم بۆ دەبێ ئەگەر لە پێناو خودا بکوژرێم. فەرموی** ((الجنـــة: **بەهەشت))، کاتێك کابرا رۆیی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((إلاّ الدين، سارني بــه جــبريل آنفاً: **تەنها قەرز نەبێ، دواتر جیبریل پێی راگەیاندم))**.[1]

**سێیەم/ گیانی بڕوادارانی چاکەکار: دەبنە باڵندە و لە درەختی بەهەشتێ دەخۆن. لە فەرمودەیەکدا هاتوە کە عەبدورەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك** رضي الله عنه **دەیگێڕتەوە، لە پێغەمبەرﷺەوە فەرموی:** ((إنما نسمة المسلم طير يعلق في شــجر الجنـــة، حتى يرجعها الله الى جسده الى يوم القيامـــة: **گیانی موسڵمان باڵندەیەکە و لە درەختی بەهەشت دەخوا، هەتاکو لە رۆژیی دواییدا خودا بۆ جەستەکەی دەیگێڕێتەوە))**.[2]

**جیاوازیش لەنێوان گیانی بڕواداران و گیانی شەهیدان ئەوەیە کە گیانی شەهیدان لە چیکڵدانەی باڵندەی سەوزدان و بەکەیفی خۆیان بە مێرگەکانی بەهەشتێدا دەگەڕێن و، لە چرای هەڵواسراو بەعەرشیشدا دەحەوێنەوە، بەڵام گیانی بڕواداران لەهەناوی باڵندەگەلێکی وان کە بەروبومی بەهەشت دەخۆن و بە چ لایاندا ناگەڕێن.**

**جا کە گیانی بڕواداران باڵندەبن و لە درەختی بەهەشتێ بخۆن، لەگەڵ ئەو فەرمودەدا تێك ناگیرێن کە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕتەوە و، تیایدا هاتوە کە فریشتەکان گیانی بەندەی بڕوادار دەکێشن و، بەرەو ئاسمانی بەرز دەکەنەوە، جا فریشتەکان دەڵێن:** ((ما أطيب هذه الريح التي جاءتكم من الأرض، فيأتون به أرواح المؤمنين، فلهم أشدُّ فرحاً به من أحدكم بغائبه يقدم عليه، فيسألونه: ماذا فعل فلان؟ مـاذا فعل فلان؟ فيقولون: دعوه، فإنه كان في غم الدنيا، فيقول: قد مات، أما أتاكم؟ قالوا: ذهب بـه إلى أمه الهاويـة: **چەند خۆشە ئەو بۆن و بەرامەی لەلای زەویەوە بۆتان هات، ئەوجا دەیبەنە نێو گیانگەلی بڕواداران و، پێی شادتر دەبن لەشادی یەکێکتان کەسێکی**

---

[1] قال الشيخ ناصر في تعليقه على شرح الطحاوية: ص٤٤٥ (صحيح)، پێشتریش زیاد لە فەرمودەیەکمان بەو مانایە هێنایەوە.

[2] رواه أحمد، أورده الشيخ ناصر في سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٧٣٠)، حديث رقم (٩٩٥)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ورواه ابن ماجة في سننه، ومالك في مؤطه، والنسائي بلفظ: ((إن أرواح المؤمنين في أجواف طير خضر، تعلق بشجر الجنة)).

دێته لا که ماوەیەك لێی بزربوە. جا لێی دەپرسن: فلان چی کرد؟ فیسار چی کرد؟ دەڵێن: لێی گەڕێن، ئەوە لەدینادا هەر لە خەمێ دابو، ئەویش دەڵێ: فلان مرد، ئەی نەهاتە لای ئێوە؟ دەڵێن: بردیانە لای دۆزەخی دایکی)).[1] جا گیانی بڕوادار لە بەهەشتێدا بەگیانی بڕواداران شاد دەبێ.

چارەم/ گیانی یاخییان: پێشتر ئەو دەقانەم هێناوە کە ئەوە ڕون دەکەنەوە، یاخی و تاوانباران چ ئەشکەنجەیەك دەچێژن، لەوانەش ئەو کەسی درۆیەك دەکا و بڵاوی دەکاتەوە بەگازێکی ئاسنین ئازار دەدرێ کە لە شەویلاگی هەڵدەکێشرێ و تا پشت سەری هەڵدەزرێنێ و، ئەوی لە نوێژێکی فەرز نوست و نەیکرد بەگاشە بەردێك سەری دەهەڕشێ و، ژن و پیاوی زیناکار و داوێن پیسیش لەتونێکی وەکو تەندورێکی تەسکدا ئەشکەنجە دەدرێن کە لای دەرکی تەسك و لای خواری بەرینە و، ئاگری لەژێر دەکرێتەوە، مرۆڤی سوخۆریش لە دەریایەکی خوێندا مەلە دەکات و، پیاوێك لەسەر ڕۆخی دەریاکەدا هەیە کە بەردی تێدەگرێ.[2]

هەروەها ئەو فەرمودانەمان هێنا کە باسی ئەشکەنجەی ئەوانە دەکا کە خۆیان لەمیز پاك نەدەکردەوە و، ئەوانەی دوزمانیان بڵاودەکرد و قسەیان دێنا و دەبرد و، ئەوی دزی لە غەنیمەت کرد و، شتی دیکەش.

پێنجەم/ گیانی بێبڕوایان: لە فەرمودەیەکی ئەبو هورەیرە لەلای نەسائیدا، پاش باسی باری بڕوادار تا دەگاتە ئارامگەی خۆی لە بەهەشت، باسی باری بێبڕوایان دەکا؛ لەکاتی گیانکێشان چ ئازارێك دەچێژن، پاش ئەوەی گیانیشیان دەکێشرێ: ((تخرج منه كأنتن ريح، حتى يأتون به باب الأرض، فيقولون: ما أنتن هذه الريح، حتى يأتون بـــه أرواح الكفـــار: بۆگەنیترین بۆنی لێوە دەدرەچێ، تا دەیگەیەننەوە دەرگەی زەوی، دەڵێن: ئەمە بۆنێکی چەند گەنیوە، هەتا دەیبەنە ناو گیانی بێبڕوایان)).[3]

---

[1] رواه النسائي، كتاب الجنائز، باب ما يلقى المؤمن من الكرامة عند خروج نفسه: (٤/٨).

[2] بەدرێژی ئەم فەرمودەمان هێناوەتەوەو لە ریوایەتی بوخاریە.

[3] رواه النسائي، كتاب الجنائز، باب ما يلقى المؤمن من الكرامة عند خروج نفسه: (٤/٨).

جێباسی دەیەم

## پرسیارێك و وەڵامەكەی

رەنگــە هــەبێ بڵــێ: دەقــی وات هێناوەتــەوە بەڵگەنــە كــە گیانــان بــۆ لاشــان دەگەڕێندرێنەوە، پاشان پرسیاریان لێدەكرێ، ئەوجا بڕوادار دەكەوێتە خۆشی و، بێبڕواش ئەشكەنجە دەدرێ. ئەدی چـۆن لـەپاش ئەو هـەموەی دەڵێـی: گیـانی بڕواداران لە بەهەشتە و هی بێبڕوایانیش لە دۆزەخ؟

ئیبنـی حـەزم هـەوڵی دا ئەو فەرمودانـە بەلاواز دانـێ كە باسی گێڕانـەوەی گیـان دەكەن بۆ جەستە لەناو گۆڕدا، بەڵام مەسەلەكە وا نیە، ئەو فـەرمودەی ئیبنـی حـەزم لاوازی كـردوە، زادان لـە بـەراو دەیگێڕتـەوە و فەرمودەیــەكی صەحیحــە. هــەروەك ئیبنی تەیمیە دەڵێ: فەرمودەی صەحیح و موتەواتریش گـەلێك زۆرن كـە بەڵگـەن بـۆ گەڕانەوەی گیان بۆ جەستە.[1]

بۆ كۆك كـردن(توافق)ی دەقـەكانیش، ئیبنـی تـەیمیـە دەڵـێ: (گیـانی بـڕواداران لـە بەهەشتە، لەگەڵ ئەمەشدا رەنگە بۆ لاشە بگێڕدرێتـەوە، هـەروەك دەبـێ كـە لەلاشـەدا بێ و، لـەكاتی نوستندا بـۆ ئاسمـان بـەرز بكرێتــەوە، جـا گـەلێك فـەرمودەی گشـتی لەبارەی ئەوە هاتون كـە لـە بەهەشتـە، ئەحمـەد و زانـای دیكـەش وا دەڵێن، فـەرمودە گشتیەكان و ئەوانی تایبەت بە نوستن وهی دیكەیان كردۆتە بەڵگە).[2]

پاشان هەندێ لەو فەرمودانەی هێناوەتەوە كە ئێمە لە پێشدا باسمان كـردون و، ئەو فەرمودەشی هێناوەتـەوە كە ئیبنـی حیبـان و هـی دیكـەش لـە ئـەبو هورەیـرەوە

---

[1] مجموع الفتاوى: (٥/٤٤٦).

[2] مجموع الفتاوي: (٥/٤٤٧)

دەیگێڕنەوە، کە لەوەی دەدوێ: بڕوادار پاش لێپرسین جێگەکەی لە بەهەشتدا دەبینێ لەگەڵ جێگەکەی لە دۆزەخدا ئەگەر بێبڕوا بوایە. دەفەرموێ: ((ثم یفسح لە في قبرە سبعون ذراعاً، وینور لە فیه، ویعاد جسده کما بدئ، وتجعل نسمته في نسم طیب، وهي طیر تعلق في شجر الجنة: ئەوجا هەفتا باڵ گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ و، بۆی ڕوناك دەکرێتەوە و، جەستەکەی دێتە سەر شێوەی سەرەتای و، گیانی لە سروەیەکی بونخۆشدا دەبێ؛ کە باڵندەیەکە لە درەختی بەهەشتێ دەخوا)). لە بێژەیەکی دیکەشدا هاتوە: ((ثم یعاد جسده الی ما بديء منه: پاشان جەستەکەی دەکرێتەوە ئەوشتەی لەسەرەتا لێی وەدیهاتوە)).[1]

بەپێی ئەم فەرمودەیە، پاش گەشتی ئاسمان گیان بۆ جەستە دەگەڕێتەوە، ئەوجا پرسیاری لێدەکرێ، پاشان دەبێتە باڵندەیەك تا ڕۆژی ژیانەوەی بەندان لەدرەختی بەهەشت دەخوات. لەگەڵ ئەوەی کە لە بەهەشتیش دایە، بەڵام پەیوەندیەکی بە جەستەوە هەر دەمێنێ، وەك حاڵەتی مرۆڤ لەکاتی نوستندا، کە گیان لە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەویدا دەگەڕێ، لە هەمان کاتدا هەر بە جەستەوە پەیوەستە، ئەمەش وا دەگەیەنێ کە گیان لە جەستە جودایە و وەك شتەکانی دونیا نیە. ئیبنی تەیمیە، پاش ئەوەی باسی کردوە کە ئارامگەی گیانی بڕواداران بەهەشتە، دەڵێ: (لەگەڵ هەندێشدا هەرکاتێکی خودای بەرز بیەوێ، گیان پەیوەندی بە جەستەوە دەکاو، لەو ساتەیدا دەکەوێتە شوێنپایەی دابەزینی فریشتە و دەرکەوتنی تیشك لە زەوی و واگاهاتنی نوستو).[2]

---

[1] تەماشای مجموع الفتاوي: (٤٤٨/٥) بکە.

[2] مجموع الفتاوى: (٣٦٥/٢٤).

*جیَباسی یازدەم*

## ئایا لە بەرزەخدا ئەشکە نجە لەسەر گیانە
## یا لەسەر جەستەیە
## یا لەسەر هەردوکیان

کۆمەڵە ئیسلامییەکان چەند وتەیەکیان لەم بابەتە هەیە:

یەکەم: ڕاڕەوی ئەهلی سونەت و جەماعەت وایە، کە ئەشکەنجە بۆ گیانە بە دابڕانی لە جەستە یان پێوە پەیوەست بونی. ئیبنی تەیمیەی شێخی‌ئیسلام دەڵێ: (ئەشکەنجە و خۆشی بە یەکدەنگی ئەهلی سونەت و جەماعەت بۆ گیان و لاشەیە، گیان بەجودا لە لاشە دەکەوێتە خۆشی و ئەشکەنجە دەدرێ، هەروەك کاتی پەیوەست بونیش بەجەستە ئەشکەنجە دەدرێ و جەستەکەشی پێوە پەیوەستە. جا لەم بارەدا خۆشی و ئازار پێکەوە بۆ هەردوکانە، وەك چۆن بەتەنیاش توشی گیان دێ).

دوەم: گۆتەی گەلێك لە ئەهلی کەلام، لەموعتەزیلە و غەیری وان، کە بەیەکجاری بونی خۆشی و ئەشکەنجە لەبەرزەخدا ڕەت دەکەنەوە، نهێنی ئەمەش لەوەدایە کە ئەوان باوەڕ بە بونی گیانێکی ئازاد لە جەستە ناکەن، گیان لەلای وان ژیانە، بەدیدەی وان پاش مردن گیانیش نامێنێ.[1] جا نە خۆشی هەیە نە ئەشکەنجە، هەتا خوا بەندان دەژیێنتەوە، ئەمەش ڕای موعتەزیلەکان و هەندێك ئەشعەری وەکو ئەبوبەکری قازییە. جا چ گومانێکی تێدا نیە کە ئەمە قسەیەکی بەتاڵە و، ئەبولمەعالی جوەینی پێچەوانەی ئەو ڕایەیە، زیاتر لە یەکێکیش لە ئەهلی سونەت، ئەو کۆڕاییەی گواستۆتەوە، کە گیان پاش دابڕانیشی لە جەستە، لە خۆشی یا لە

[1] ئەگەر چی ئەوانە باوەڕیان بە ئەشکەنجەی گۆڕ نیە. بەڵام باوەڕیان هەیە کە جەستە زیندو دەکرێتەوە.

ناخۆشی و ئەشکەنجەدا دەمێنتەوە.

سێیەم: گۆتەی ئەو پیتۆڵانەی وای بۆ دەچن خۆشی و ئەشکەنجە تەنیا بۆ گیانە و، جەستەش نە خۆشی دەبینێ نە ئازار.[1] لە ئەهلی سونەتیش ئیبنی مەیسەرە و ئیبنی حەزم وا دەڵێن.

چارەم: گۆتەی زانایانی کەلام، کە دەڵێن ئەوی لە گۆڕدا دەکەوتە خۆشی یا ئەشکەنجە دەدرێ تەنیا جەستەیە، جا هەندێك لە فەرمودەناسانی وەکو (ابن الزاعونی) هەمان ئەم ڕایەیان هەیە.[2]

---

[1] ئەم پیتۆڵانە ئەگەرچی دان بە ئەشکەنجە و خۆشی گیاندا دەنێن پاش دابڕانی لە جەستە، بەڵام باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە.

[2] بگەڕێوە بۆ: مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٤\٢٦٢، ٢٨٢).

## جێباسی دوازدەم

# ئایا مرۆڤ پاش مردنی هیچ لەبارەی حاڵی دنیایێ دەزانێ

**لە فەرمودە صەحیحەکاندا سەلماوە کە مردو پاش ئەوەی لە گۆڕ دەنرێ، گوێی لە تەپەی پێی هاوەڵانی دەبێ. لە ئەنەسی کوڕی مالیك هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویی:** ((إن العبد اذا وضع في قبره، وتولى عنه اصحابه، انه ليسمع قـرع نعـالهم: **کاتێك بەندە دەخرێتە ناو گۆڕەکەی و، هاوەڵانی جێی دێڵن، گوێی لە تەپەی پێڵاوەکانیان دەبێ**)).[1] **هەروەها پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژان پاش جەنگی بەدر چوە سەر کوژراوەکانی موشریکان و هەندێك پیاوی لێ بانگ کردن و فەرمویی:** ((يا أبا جهل بن هشام، يا أمية بن خلف، يا عتبة بن ربيعة، يا شيبة بن ربيعة، أليس قد وجدتم ما وعد ربكم حقا؟ فإني قد وجدت ما وعدني ربي حقا: **هۆ ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، هۆ ئومەییەی کوڕی خەلەف، هۆ عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، هۆ شەیبەی کوڕی ڕەبیعە ئەدی بەڕاستی و ڕەوا بەڵێنی پەروەردگارتان نەدیت؟! بەڕاستی من بەهەق بەڵێنی پەروەردگارم دیت**)). **جا عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن گوێیان لێدەبێ و وەڵام دەدەنەوە، لەکاتێکدا کە رزیون و بۆگەنی بون؟! فەرمویی:** ((والذي نفسي بيده، ما أنتم بأسمع لما أقول منهم، ولكنهم لا يقـدرون أن يجيبـوا: **سوێند بەو زاتەی گیانی منی لە دەستە! ئێوە لەوان زێتر گوێتان لە قسەی من نیە، بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە**)). **ئەوجا فەرمانی کردو ڕاکێشران و هەڵدڕانە ناو بیری قولەیبی بەدر.**[2]

---

[1] رواه مسلم، كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه (٤/٢٢٠٣) حديث رقم (٢٨٧٤).

[2] رواه البخاري، كتاب الجنائز، باب ما جاء في عذاب القبر، ورواه مسلم في كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه (٤/٢٢٠٠). حديث رقم (٢٨٧٠) ورواه ابو داود والنسائي أيضا. أنظر جامع الأصول:(١١/١٨٠).

ئیبنـی تەیمیـەش کۆمەڵـە فەرمودەیـەکی هێناوەتـەوە کـە بەڵگـەن بـۆ ئـەوەی مردوەکـان دەبیسـتن، پاشـان دەڵـیٚ: (جـا ئـەم دەقانـە و هاوشـێوەیان ئـەوە ئاشـکرا دەکەن کە مردو تێکڕا قسەی زیندوان دەبیستن و، مەرجیش نیە هەمو دەمـێ گوێـی لێبێ، بەڵکو رەنگـە لـە هـەندێك بـاردا ببیسـتێ و لەهـەندێکیش نەبیسـتێ، هـەروەك بەسـەر زندوانیـش دێ، جـار هەیـە قسـەی ئـەو کەسـە دەبیسـتێ کـە دەیدوێـنێ و، هەندێك جاریش هەندێك شتی بەرگوێ ناکەوێ).[1]

هـەروەها شێخی‌ئیسـلام وەڵامـی کێشـەی ئەوانـەی داوەتـەوە کـە دەڵێـن: خـودا نەرێی(نفي) لە بیستنی مردوان کردوە کە دەفەرموێ ﴿إِنَّكَ لاَ تُسْـمِعُ الْمَوْتَـى: تـۆ ناتوانی قسەی خۆت بە مردوەکان بگەیەنی﴾[2]. جا ئێوە چۆن دەڵێن مردو دەبیستن؟ دەڵێ: (ئەمە بیستنی پەی پێ بردنە و، چ سزا و پاداشتێکی لەسەر بنیات نانرێ. ئەو بیستنەش نیە کە خودا نەرێی لێکردوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لاَ تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾، لێرەدا مراز گوێ لێبونە بۆ گوێڕایەڵی و وەرگرتن و بەرئەمر بون، جا خودای بەرز بێبڕوای بە مردو چواندوە کە وەرامی کەسێکی ناداتەوە بانگی بکا و بە ئاژەڵانی چواندون کە دەنگ دەبیستن بەڵام لەواتا ناگەن. هەر چەندە مردو گوێی لە قسە بێ و لە واتاشی بگات، ناتوانێ وەڵام بداتەوە و، بەرئەمری فەرمانەکانی بێ، بۆیە سود لە ئامۆژگاریان وەرناگرێت. بێبڕواش هەروایە سـود لـە فـەرمان و نـەهی وەرنـاگرێت، هەرچەندە گوێشی لە وتاران بێ و واتایان تێبگا. هـەروەك خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لأَسْمَعَهُمْ: ئەگەر خودا خێرێکی لێ بەدی بکردنایـە وای لێ دەکردن حەق ببیستن.﴾[3] [4]

دەقی دیکەش هەن ئـەوە دەسـەلمێنن کـە مـردو سـەرەڕای گـوێ لێبـون، قسـانیش دەکا، مونکەر و نەکیر پرسیاری لێدەکەن، جا بڕوادار بۆ وەڵامـی راسـت و دروسـت

---

[1] مجموع الفتاوى: (٥/٣٦٤).

[2] سورة النمل: ٨٠

[3] سورة الأنفال: ٢٣.

[4] مجموع الفتاوى: (٥\٣٦٤)

ڕێنما دەبێ و. بێبڕوا و دوڕوش وەڵامیان لەبەر بزر دەبێ. بێجگە لە پرسیارەکانی مونکەر و نەکیر؛ مردو قسەی دیکەش دەکات. دیارە ئەمەش هەموی لەشێوە قسەکردنی دنیا جودایە. چونکە ئەوی پرسیاری لێ دەکرێ و بەوەرامان دێتە گۆ؛ گیانەکەیە. هەر گیانیش وەڵام دەداتەوە و دادەنیشێ و ئەشکەنجە دەدرێ و دەکەوتە خۆشی، ئەگەر چی جۆرە پەیوەندیەکیشی بەجەستەوە هەبێ. پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە ڕەنگە هەندێ خەڵك وشەیەك لە مردو ببیستن، پێغەمبەرﷺیش گەلێك شتی لەم بابەتەی گوێ لێدەبو.

# بەندی یەکەم

# کاتی داهاتنی قیامەت

## جێباسی یەکەم

## بێگومان قیامەت هەر دێ

**بڕواهێنان بە ڕۆژی قیامەت یەکێکە لە بنەڕەتەکان، بێ لەوی ئیمان ناتەواوە:** ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ: **چاکی تەنیا بەوەی نیە لەکاتی نوێژدا ڕوبکەنە خۆرهەڵات و خۆرئاوا، بەڵکو چاکە ئەوەیە بڕوا بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتە و کتێبی ئاسمانی و بە پێغەمبەران بێنن**﴾[1]، ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَالْمُقِيمِينَ الصَّلاَةَ وَالْمُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالْمُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أُوْلَئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا: **خاوەن بڕواکان بڕوا دێنن بەوەی بۆ تۆ دابەزیوەو، بەوەی پێش تۆ دابەزیوە و، نوێژکەران و زەکات دەران و بڕواهێنەران بە خودا و بەڕۆژی دوایی، پاداشتی مەزن بەوانە دەدەین.**﴾[2].

**قورئانی پیرۆزیش گەلێك شێوازی باڵای دەربڕین و گوزارە کردنی هێناوەتەوە، تا لە دەرونی بەندەکاندا داهاتنی ڕۆژی قیامەت بچەسپێنێ:** ﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ: **خوا تەگبیری کاران دەکات و نیشانەکان بۆ ئێوە ڕون دەکاتەوە تا بەڵکو ئاوەر(یقین) بە دیداری خودا پەیدا بکەن.**﴾[3]، **جا لە هەندێك**

---

[1] سورة البقرة: ١٧٧.

[2] سورة النساء: ١٦٢

[3] سورة الرعد: ٢

شوێندا تەنها بە هەواڵێکی پەتی(مجرد) باسی کردوە ﴿اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ: خودا دەست بە بەدیهێنان دەکات و پاشان دەیانگێڕێتەوە، لە پاشان بۆ لای ئەو دەگەڕێندرێنەوە﴾[1]. ﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا: ئەو رۆژی بۆ لای وی دەگەڕێندرێنەوە، هەواڵی ئەو شتانەیان پێدەدا کە کردویانە﴾[2]. جاری واش هەیە بە ئامرازی (إِنَّ) جەخت لەسەر ڕودانی دەکات وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ: بەڕاستی قیامەت هەر ڕو دەدات و دێت.﴾[3]. جاریش هەیە بە ئامرازی (ان) و پیتی لام ﴿وَإِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ: بەڕاستی قیامەت هەردێت. بە جوانی چاوپۆشی لەوانە بکە﴾[4]. ﴿فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ: بەڕاستی ئەو کاتەی خوا دیاریکردوە هەردێ و، هەر خوایە بیسەرو زانا﴾[5]. لەهەندێ شوێنانیشدا شك و گومان لە ڕودانی لادەدات ﴿إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ: بەڕاستی رۆژی دوایی هەردێ و هیچ گومانی تێدا نیە، بەڵام زۆرینەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن.﴾[6].

لە هەندێك ئایەتانیش خودای بەرز سوێند دەخوات کە قیامەت هەردێ، لە هەندێك شوێندا سوێند بە خۆی دەخوات، وەك دەفەرمێ: ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: خوایەك کە لەو بەدەر هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، بەڕاستی لە رۆژی قیامەتدا کۆتان دەکاتەوە﴾[7]. لەهەندێ شوێنیشدا سوێندی بە دروست کراوە مەزنەکانی خۆی خواردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا، فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا، فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا، فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا، إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ، وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ: سوێند بەو بایانەی کە گەلێك شت بەبڵاوکردنەوە بڵاودەکەنەوە، پاشان بەو هەورانەی هەڵگری باری قورس و گرانن، ئینجا بەو کەشتیانەی بە سانایی بەسەر ئاودا دەڕۆن.

---

[1] سورة الروم: ١١
[2] سورة النور: ٦٤
[3] سورة طه ١٥
[4] سورة الحجر: ٨٥
[5] سورة العنكبوت: ٥
[6] سورة غافر: ٥٩
[7] سورة النساء: ٨٧

سوێند بە فریشتەگەلێك كە كار دابەش دەكەن، بەڕاستی ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە ڕاستە و، بەڕاستی ڕۆژی پاداش و سزا هەردێ و ڕودەدا﴾[1]. هەروەها كە دەفەرموێ: ﴿وَالطُّورِ، وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ، فِي رَقٍّ مَنْشُورٍ، وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ، وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ، وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ، إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ، مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ: سوێند بە كێوی طور، سوێند بە كتێبی نوسراوە، لە لاپەڕەیەكی ناسك و بڵاودا و، سوێند بە خانەی ئاوەدان و، سوێند بە ساپیتەی بەرزكراوە و، سوێند بە دەریای لێوالێو و پڕ، بەڕاستی سزای پەروەردگارت بۆ بێبڕوایان دێتە دی، هیچ پاڵنەرێك نیە دوریخاتەوە﴾[2].

لە هەندێك شوێنی قورئانی پیرۆزیشدا، خودای بەرز فەرمان بە پێغەمبەرەكەی دەدات كە لەبواری بیانو هاوردن و گفتوگۆدا سوێند بە پەروەردگاری بخوات كە ڕۆژی قیامەت هەر دێتەدی: ﴿وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ: لە تۆ دەپرسن، ئایا ئەو بەڵێنی سزادانە ڕەوایە؟ بڵێ: ئەرێ سوێند بە پەروەردگارم بەڕاستی ئەوە ڕەوایە ئێوە ناتوانن بەری بگرن و كەنەفتی كەن.﴾[3]. هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ: بێبڕواكان گوتیان قیامەت بۆ ئێمە نایەتەدی. بڵێ: سوێند بە پەروەردگارم بە ڕاستی هەر بۆتان دێت.﴾[4]

لە هەندێك ئایەتانیش هەواڵمان دەداتێ كە قیامەت ڕەوایە ﴿إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا: بەڕاستی بەڵێنی خودا ڕەوایە، جا نەكەن ژیانی دونیا فریوتان بدا﴾[5].

هەركەسێكی بەدوای شێوازەكانی قورئانی پیرۆزدا بگەڕێ لەگەیاندنی هەواڵی ڕۆژی قیامەتێ، گەلێك جۆری دەست دەكەوێت، كە ئێمە بڕێكمان لێ هێنانەوە.[6]

---

[1] سورة الذاريات: ١-٦
[2] سورة الطور: ١-٨
[3] سورة يونس: ٥٣
[4] سورة سباء: ٣
[5] سورة لقمان: ٣٣
[6] ڕەنگە لە ئایەتێكدا پتر لە جەختێك هاتبێ، ئەگەر ورد بڕوانیە ئەو دەقانەی هاوردمانە ئەمەت بۆ ڕون دەبێتەوە.

## جێنباسی دووەم

# قیامەت نێزیکە

پەروەردگاری بەرز، لەو کتێبەی کە چواردە سەدە بەر لە ئێستا دایبەزاندوە بە بەندەکانی ڕاگەیاندوە، کە ڕۆژی دوایی نێزیك بۆتەوە و، کاتی ڕودانی داهاتوە: ﴿اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ: قیامەت نێزیك کەوتەوە و، مانگ لەت بو﴾[1].

ئەم لەتبونەی مانگیش یەکێکە لەو نیشانانەی کە بەڵگەن بۆ نزیك بونەوەی داهاتنی قیامەتێ. جا لەبەر ئەوەی ڕۆژی دوایی یەکجار نێزیك بۆتەوە. قورئانی پیرۆز وای وێنە کێشاوە کە هاتۆتە دی و رویداوە وەك دەفەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوه: فەرمانی خودا گەیشتوە، جا بۆ ئەوە پەلە مەکەن.﴾[2]

ئەگەر مرۆڤ بە دڵێکی بیناوە باوەڕیان بەوە هەبێ کە خوا دایبەزاندوە بە عەقڵێکی ئاگای پەی پێ بردو تێی بڕوانن، بە گرنگ سەیری مەسەلەکە دەکەن و، دەرونیان دادەگرێ. بۆیەشە کە باری مرۆڤ مایەی سەرسامیە، مەترسیەکە هێندە نزیکە، کەچی ئەوان بێ ئاگان لەو پەرژەنگ(هول)ـەی زۆری نەماوە دەوریان بگرێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ، مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ إِلاَّ اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ، لاَهِيَةً قُلُوبُهُمْ: کاتی لێپرسینەوە نێزیك بۆتەوە، بەڵام خەڵکی بێ ئاگان و ڕو وەردەگێڕن، هەر یاداوەریەکی تازەیان لەلای پەروەردگاریانەوە بۆبێ، بە گاڵتەوە گوێی بۆ رادەگرن، دڵیان بێ ئاگا و خەریکە﴾[3].

هەر بۆیە خودا لە قورئانی پیرۆزدا مرۆڤی زۆر لە قیامەتێ ئاگادار کردۆتەوە و، فەرمانی داوەتێ خۆی بۆ ئامادەکا و، بە سبەینێ گوزارە(تعبیر)ی لێکردوە، کە ئەو ڕۆژەیە دوای ئەو ڕۆژە دێ کە تێیدا دەژی، ﴿وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ:

[1] سورة القمر: ١

[2] سورة النحل: ١

[3] سورة الانبياء: ١-٣

با هەر کەسێك بڕوانی چی بۆ سبەی پێشکەش کردوە﴾[1].

ڕەنگە هەبێ بڵێ: چۆن ئەو شتە نێزیکە کە هەزارو چارسەد ساڵە هەواڵی نێزیکی ڕودانی ڕاگەیەنراوە؟ وەرامیش ئەوەیە، کە ڕۆژی قیامەت لە زانست و خەملاندنی خوادا نێزیکە، هەرچەندە بە پێوەرە مرۆییەکان دوریش بێتە بەرچاو. ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا، وَنَرَاهُ قَرِيبًا: بەڕاستی ئەوانە ڕۆژی دوایی بە دور دەبینن، وە ئێمە بەنێزیکی دەبینین.﴾[2]

دەبێ لەوەش ئاگاداربین، ئەو هێندەی لە دنیادا ماوەتەوە بە گوێرەی ئەو بڕەی لێی تێپەڕیوە کەمە، بۆ نمونە ئەگەر یەکێك قەرزارت بو، تۆ ماوەیەکی درێژت بۆی دانا تا قەرزەکەت بداتەوە، بۆنمونە پەنجا ساڵت مۆڵەت پێدا، ئەگەر چل و پێنج ساڵ تێپەڕی، ئەوا کاتی قەرز دانەوەکە نێزیك دەبێ لەچاو مۆڵەتە داندراوەکە. فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەرﷺیش ئاماژە بەو ڕاستیە دەکەن کە لێرەدا ڕونمان کردەوە.

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((انما أجلكم فيمن مضى قبلكم من الأمم من صلاة العصر الى مغرب الشمس: وادەی ئێوە لەچاو ئەو ئوممەتانەی پێش ئێوەتێپەڕیون، لە نوێژی عەسرەوە تا ئاوابونی ڕۆژە)). لە بێژەیەکیشدا دەفەرمێ: ((انما بقاؤكم فيما سلف قبلكم من الأمم ما بين صلاة العصر الى غروب الشمس: مانەوەتان لەچاو ئوممەتە پێشینەکانی پێش ئێوە، نێوانی نوێژی عەسر تا ڕۆژئاوا بونە)).

فەرمودەکە: بونی مرۆڤ بە ڕۆژێك لە ڕۆژانی دنیا ڕادەنوێنێ، بونی ئوممەتی ئیسلام لەکاتی عەسری ئەو ڕۆژەدا دەستی پێکردوە، جا کاتی تێپەڕیو لەتەمەنی بونی مرۆڤ بەگوێرەی ئەو ڕۆژە لە بەرەبەیان تا کاتی عەسرە، ئەوەندەی لەتەمەنی زەمەنیشدا ماوە تا ڕۆژی دوایی، وەکو نێوانی عەسر و ڕۆژئاوابونە. دەقەکانیش بەڕاشکاوی ڕادەگەیەنن کە ئێمە دوایین ئوممەتین لە بوندا، کۆتایی بونی ئەم ئوممەتەش بە داهاتنی قیامەت دەبێت.

لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتوە کە بوخاری و موسلیم لە سەهل ﷺ دەیگێڕنەوە،

---

[1] سورة الحشر: ١٨

[2] سورة المعارج: ٦ - ٧

دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ دو ئەنگوستی خۆی درێـژ کرد و ئامـاژەی پـێکردن و فـەرموی: ((بعثت أنـــا والســـاعة كـــهاتين: مـن لەگـەڵ ڕۆژی دوایـی بەم شێوەیە ڕەوان کراوم)).

لـە بێژەیـەکی دیکەشـدا کـە موسـلیم لـە سـەهل ﷺ دەیگێڕتـەوە دەڵـێ: گوێـم لێبـو پێغەمبەرﷺ بە ئەنگوستەکانی دۆشاومژە و ناوەڕاست ئاماژەی دەکرد و دەیفەرمو: ((بعثت انا و الساعة هكذا: من لەگەڵ ڕۆژی دوایی بەم شێوەیە ڕەوانەکراوم)).[1]

مانـای وایـە ئەگـەر ئێمـە تەمـەنی بـون بـە ئەنگوسـتی ناوەڕاسـت بخـەملێنین، سەردەمی ناردنی پێغەمبەر ﷺ بە قەدەر ئەوەی لێ مابو کە ناوەڕاست لـە دۆشـاومژە درێژترە و ئەوەی لێشی بەسەر چوە بە قەدەر دۆشاومژەیە لەچاو پەنجەی ناوەڕاست، ڕەنگە ئەوەندەی ماوە بەهەستی مرۆڤ درێـژ بێ، چونکە پەی بردنیان سنوردارە و، دیدیان کورتترە. بەڵام لە تەرازوی خودا کورت و نێزیکە:

﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوهُ: فەرمانی خودا گەیشتوە، جا بۆ ئەوە پەلە مەکەن)). ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْـرَبُ: کاتی ڕۆژی دوایـی بۆ خوا هێنـدە ئاسانە، وەکو چاوتروکانە یا لەمەش ئاسانتر و نێزیکترە﴾.[2]

ئەحمەدی پێشەواش لە عوتبەی کوڕی غەزوان دەگێڕتەوە، کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بۆ داین؛ سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان فەرموی:

((أما بعد: فان الدنيا قد آذنت بصرم، وولت حذاء، ولم يبق منها الا صبابة كصبابـــة الإنـــاء يتصابها صاحبها، وإنكم منتقلون منها الى دار لا زوال لها، فأنتقلوا منها بخير ما يحضرنكـــم..: ئیتر دونیـا نێزیکی پچڕان بوە و پێـی لێ هـەڵکردوە، هـەر بـە قـەد دواچۆڕێکـی مـاوە کـە خاوەنەکەی لە دەفرێـی کـا. ئـێوەش تێیـدا دەگوازنـەوە بۆ خانەیـەکی نـەبڕاوەو لـەبن نەهاتو. جا بەچاکترین کردەوە لێوەی بگوازنەوە)).[3]

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الرقاق، باب قول النبيﷺ: ((بعثت أنا والساعة كهاتين))، فتح البـــاري: (٣٤٧/١١) ورواه مسلم في كتاب الفتن، باب قرب الساعة: (٢٢٦٨/٤) ورقمه (٢٩٥٠)، وقد رواه البخاري ومسلم أيضا عن انس.

[2] سورة النحل:٧٧

[3] انفرد به مسلم: تفسير ابن كثير: (٤٦٨/٦).

## جیناسی سێیەم

# کەس کاتی دیاریکراوی قیامەت نازانێ

لەبارەی رۆژی دوایی، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا، فەرموی: ((ما المسؤول عنها بأعلم من السائل: پرسیارلێکراو پێی زاناتر نیە لەوی پرسیاری کردوە))، ئەوی پرسیارەکەشی کرد جبریل بو، هاتبوە سەر وێنەی مرۆڤ، جا ئەگەر پایەدارترینی فریشتان کە جبریلە و پایەدارترینی مرۆڤیش کە موحەممەدە ﷺ نەزانن کەی قیامەت دێ، ئاشکرایە کەسێکی دیکەش بێجگە لەوان هەر نایزانێ.

قورئانی پیرۆزیش بەراشکاوی رایگەیاندوە کە کاتی داهاتنی قیامەت زانستێکی تایبەتە بەخودا، بۆیە بەکەسی رانەگەیاندوە، جا چ فریشتەیەکی نێزیك بێ، یا پێغەمبەرێکی نێردراو؛

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ: لەبابەت رۆژی قیامەتەوە لێت دەپرسن داخوا کەی دێ؟ بلێ: زانستی ئەوە لای پەروەردگارمە، بێجگە لەو هیچ کەس نازانێ کاتەکەی دیاری بکات. هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکان و زەویش قورسە، لەناکاو نەبێ نایەتە سەرتان. وا لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی تۆ بەکاتی هاتنی ئاگادار بی، بلێ: زانستی تەنیا لای خودایە، بەلام زۆربەی خەلك نازانن.﴾[1].

لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنْ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا: خەلکی لەبارەی قیامەتەوە پرسیارت

---

[1] سورة الاعراف: ١٨٧

لێدەکەن. بڵێ: زانستی ئەوە تەنیا لەلای خودایە. تۆ چ دەزانیت بەڵکو ڕۆژی قیامەت نێزیك بێ﴾.[1]

هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا، فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا، إِلَى رَبِّكَ مُنتَهَاهَا: لەڕۆژی دوایی پرسیارت لێدەکەن، داخوا کەی دێ، تۆ چ کارت بە گوتنی وەختی ئەوە؟ سەرەنجامی ئەو زانستە لەلای پەروەردگارتە﴾[2].

ئەم ئایەتانە بە ڕونی ئەوە دەگەیەنن کە زانینی کاتی داهاتنی قیامەت هەر تایبەتە بە پەروەردگاری بەرز، قیامەتیش لەناکاو دێ، پێغەمبەریش ﷺ نازانێ کەینێیە.

ڕۆژی دوایی یەکێکیشە لە پێنج کلیلەکانی پەنهان کە لە ڕازەکانی زانستی خودان:

﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ: بەڕاستی زانینی سەردەمی داهاتنی قیامەت لای خودایە و، هەر ئەو باران دەبارێنێ و دەزانێ چ لە پزدان(رحم)ی دایکاندایە و، هیچ کەس نازانێ بۆ سبەی چ بەدەس دێنێ و کەس نازانێ لە چ زەویەك دەمرێ. بەڕاستی خودا زانا و ئاگایە﴾.[3]

لە صەحیحی بوخاریشدا، لە ئیبنی عومەر ﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرﷺەوە فەرموێ: ((مفاتيح الغيب خمس لا يعلمهن الا الله، ثم تلا هذه الآية: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾: کلیلەکانی پەنهان پێنجن، بێجگە لە خودا کەس نایانزانێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾.))[4]

---

[1] سورة الاحزاب: ٦٣

[2] سورة النازعات: ٤٢ —٤٤

[3] سورة لقمان: ٣٤

[4] جامع العلوم و الحكم لابن رجب: ٣٧

## جێباسی چوارەم

# دانایی لە شاردنەوەی کاتی ڕودانی

ڕەنگە مرۆڤ بپرسن: دانایی لە شاردنەوەی کاتی ڕۆژی دوایی و داهاتنی قیامەت چیە؟ وەلامیش ئەوەیە کە شاردنەوەی پەیوەستە بە چاکبونی دەرونی مرۆڤ، چونکە داهاتنی پەنهانە و، ئەو روداوە مەزنەی مرۆڤ ئاوەر(یقین)ی بە وەدیهاتنی هەبێ، بەلام نەزانێ کەی لەناکاو دەیگاتێ و لێی دێتە مەیدانێ، ئەمە وا لە مرۆڤ دەکا بەردەوام چاودێری بکا و چاوەڕوانی بێ.

مامۆستا سەید قطب (بەر میهری خوا کەوێ) دەڵێ:

(نادیار ڕەگەزێکی بنەڕەتە لە ژیانی مرۆڤ و لەپێکهاتەی دەرونیان، بۆ هەمیشە پێویستە نادیارێك هەبێ چاوی تێ ببڕن، ئەگەر مرۆڤ فریشکی هەر بەم شێوەیە با و هەمو شتێکیشی لەلا دیارو ئاشکرا با، چالاکیان دەوەستا و، ژینیان بۆگەنی دەبو، جا مرۆڤ بەدوای نادیار ڕادەکەن، بۆیە ئاگایان لەخۆ دەبێ و، هیواو ئاواتان دەخوازن و ئەزمونان ئەنجام دەدەن و، فێر دەبن و، وزە داپۆشراوەکانی خۆیان و بونەوەری دەوروبەریان دەدۆزنەوە و، دڵ و هەستیان بە ئەو کاتە نادیارە پەیوەست دەبێ و لە خافڵ بون و بێئاگایی دەیانپارێزێ، چونکە ئەوان نازانن کەی قیامەت دێ، جا بەردەوام لە ژوانەکەی وەئاگان و، خۆیان بۆ ئامادە دەکەن. ئەوە بۆ کەسانێك کە ڕێخت(فطرة)یان دروست و ڕاستاڵ بێ، هەرچی ئەو کەسەشە کە ڕێختی گەندەڵ بوە و شوێن ئارەزوی خۆی کەوتوە، دەخافڵێ و نازانێ، جا بەخۆ بە چارەنوسەوە بۆ بنەوە هەڵدەدێرێن.)[1]

---

[1] الیوم الاخر في ظلال القرآن: جمع و اعداد احمد فائز: ص٨٩

## جێباسی پێنجەم

# خەریك بون بە دیارکردنی کاتەکەی دروست نیە

**خەڵك زۆر لەبابەت کاتی قیامەتیٚ پرسیاریان کرد، پرسیارەکانیشیان ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کرد و، وەرامیش لە خودای مەزنەوە هات، کە رۆژی دوایی پەنهانە و، زانینی کاتی ڕودانیشی لە تایبەتمەندیەکانی زانستی خودایە؛**

﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنْ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا: **خەڵکی لەبارەی قیامەتەوە پرسیارت لێدەکەن. بڵێ: زانستی ئەوە تەنیا لەلای خودایە. تۆ چ دەزانیت بەڵکو رۆژی قیامەت نێزیك بێ**﴾[1].

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا، فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا، إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا، إِنَّمَا أَنْتَ مُنْذِرُ مَنْ يَخْشَاهَا: **لە بارەی رۆژی دوایی پرسیارت لێدەکەن، داخوا کەی دێ و رودەدا، تۆ لەچی وباسکردنی لەچی؟! سەرەنجامی ئەو زانستە لەلای پەروەردگارتە، تۆ هەر ترسێنەری کەسێکی لەباریدا هەبێ لەو رۆژە بترسێ**﴾[2].

**خودا کەسی لەم زانستە ئاگا نەکردوە، چ فریشتەیەکی نێزیك بێ یا پێغەمبەرێکی نێردراو، بۆیەش بو کە جبریل لەبارەی قیامەت پرسیاری کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((ما المسؤول عنها باعلم من السائل: **ئەوی پرسیاری لێکراوە پێی زاناتر نیە لەوەی پرسیارەکەی کردوە**)).

**جا تۆژینەوەی ئەم مەسەلەیە و، گریمان دانان کە گوایە لەساڵێکی دیاریکراو**

---

[1] سورة الاحزاب: ٦٣

[2] سورة النازعات: ٤٢ — ٤٤

ڕودەدات، سنور بەزاندنە لەئاست خودای بەرز و قسەی بێ بنەمایە و، ئەوانی ملیان بەمەوە ناوە، ناکۆکن لەگەڵ بەرنامەی قورئان و پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ کە خەڵکی ئاڕاستە کردوە واز لە تۆژینەوەی ئەم بابەتە بهێنن و، بۆ هەندێ بانگ کردون تا بە بڕوا و کاری چاك خۆ بۆ ئەو ڕۆژە ساز و ئامادەبکەن.

ئەوانەی لەم بوارەش دەکۆڵنەوە، وا گومان دەبەن دەتوانن شتێك بزانن کە پێغەمبەر ﷺ و جبیریل ﷺ نەیانزانیبێ، هێندەش بەسە بۆ کەسانێکی دڵیان زندو و چاویان بینا بێ، ئێمەش پێیان دەڵێین: دەبێ ئێوە هێندەتان بەس بێ کە بۆ پێغەمبەرﷺ و یاوەرانی بەدرێژایی مێژو و بۆ پێشەوایانی ئەم ئوممەتەش بەس بوە. ئەگەر زانینی ئەو کاتە چاکە و بەرژەوەندیەکی بۆ مرۆڤ تێدابا، خودا هەواڵی کاتی ڕودانی بە مرۆڤ ڕادەگەیاند، بەلاّم ئەوەی لێ داپۆشیون و پەنهانی کردوە و، بەرژەوەندی وانیش لەوەی دایە.

پێویستە ئەوانی دێن پەند لەوانە وەربگرن کە ڕابردون، چونکە هەندێك لەوانی پێشو خۆیان هێنا بەر ئەم بارە و، ڕۆژی قیامەتیان دیاریکرد، یان ڕودانی هەندێك نیشانەی نێزیك قیامەتیان دیاریکرد، بەلاّم ئاکامی گەیشتێ و ژیانی بە کۆتا هات و هیچ لەم شتانە روی نەدا، نەقیامەت هات و نەنیشانە دیاریکراوەکانی.

یەکێك لەوانەش طەبەری (بەرمیهرو لێخۆشبونی خوداکەوێ) بو، ئەو لە هەندێك دەقاندا وای فامیبو کە پاش پێنجسەد سالاّن لەناردنی موحەممەدﷺ دونیا تەفرو تونا دەبێ[1]. ئەوا نێزیکەی هەزار ساڵیش بەسەر ئەو ئاکامە تێپەڕی کە ئەو دیاریکردو، گومانەکەی نەهاتەدی.

هەروەها سیوطی فرەزانیش (خودا لێی ببورێ) یەکێکە لەوانە، لە بەشێکی کە ناوی ناوە (الکشف) وای دەرخستوە کە قیامەت لەسەری پازدەمین سەدە پاش هاتنی پێغەمبەر ﷺ ڕودەدات.[2] بەلاّم ئەوە چەند ساڵێك بەسەر ئەمەشیان تێپەڕی و،

[1] المقدمة لابن خلدون: ص٥٩٠

[2] لوامع الانوار البهية: (٢\٦٦)

قیامەتیش ڕوی‌نەدا، بەڵکو زۆر لەنیشانەکانیشی ڕویان نەداوە.

(سوهەیلی)یش پیتە پچڕپچڕەکانی سەرەتای سورەتانی کۆکردەوە و، دوبارەکانی لێ دەرهاویشت و بەحیسابی ئەبجەد لێکی دانەوە، لەسەر ئەم گریمانەی خۆی ئاکامێکی دیارکرد کە لە چەند سەد ساڵێك تێنەدەپەڕی.[1]

گەلێك خەڵکیش لەم بارەیە قسەیان کردوە و، بەبێ بەڵگە تێکیان هەڵشێلاوە، کردەوەکانیشیان لەگومان و درۆودەلەسان بەدەر نەبون. دوا شتێکیش لەمبارەیەوە کەوتبێتە بەرچاوم، ئەوە بو کە دکتۆرێکی بەهائی نوسیبوی، گوایە قیامەت لە ساڵی (١٧١٠)دا دێت. وای هەڵبەستابو کە ئەمەی بەحیسابی ئەبجەد لە پیتە پچڕاوەکانی سەری سورەتەکانی قورئان هەڵێنجاوە. ئێمەش دەڵێن: تەواو سەلماوە کە ئەم بەرنامەیە هەڵەیە. خەڵکانێکی پێشوش پشتیان بەم بەرنامەیە بەستوە و وادەو ئاکامی دیکەیان دیاریکردوە. لەبەرنامە و پێڕۆدا لەگەڵ ئەمەدا کۆك بون، بەڵام لە دیاریکردنی ئاکام جودا و، بۆچونەکانیشیان بەدرۆ دەرچون.

ئیبنی تەیمیەی شێخی‌ئیسلامیش (بەرمیهری خودا کەوێ وپاداشی نەبڕاوە بێ)، بەگژ ئەوان کەساندا هاتوە کە ئەم بابەتەیان تۆژیوەتەوەو ملیان بەبەر وەناوەو، ئاکامیان بۆ دیارکردوە و، دەڵێ:

( هەر کەسێك دەربارەی کاتی دیاریکراوی قیامەت ئاخاوتوە وەك ئەو کەسەی کتێبێکی نوسیوە بەناوی (الدر المنظم في معرفة الاعظم) و تیایدا دە ئاماژەی هێناوەتەوە و کاتەکەی پێ دیاریکردون و، ئەوانەی لەم بارەیەوە دواون لە پیتەکانی فەرهەنگدا و، ئەو کەسی لە (عنقاء مُغْرب)[2]دا باسی کردوە و، هاوشێوەکانی ئەوانە، ئەگەر چی لەلای شوێنکەوتوانیان وێنەیەکی مەزنیان هەبێ، زۆربەیان درۆزن و بوختانکەرن.[3] لەگەلێك ڕوانەوە سەلماوە، ئەوانە بەبێ زانست قسەیان کردوە،

---

[1] المقدمة لابن خلدون: ص ٥٩١

[2] ئیبنی عەرەبی، کە باوەڕی بە یەکبونی بون هەیە.

[3] لێرەدا شێخ دەڵێ: (زۆربەیان). چونکە هێندێك لەوانی ئەو بابەتەتان تۆژیوەتەوە، بە هەڵەدا چون دەنا مەبەستیان گومڕاکردن نەبوە، وەك طەبەری و سیوطی.

هەرچەندە بانگەشەی پەردەلادان و زانینی نهێنیەکانیان کردبێ. خودای بەرزیش دەفەرموێ:

﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: بڵێ: خودا کارو کردوەی بەدی حەرام کردوە، جا چ بەئاشکرا بێ چ بەنهێنی. هەروەها گوناح و ستەم کردن بە ناڕەوا و هاوبەش دانان بۆ خودا کە بەڵگەی بۆ نەهاتوە، لە خۆڕا مەیکەن بەهاوبەش بۆ خودا. وە شتێکی کە نایزانن بە دەم خوداوە مەیڵێن.﴾[1][2]

هیچ گومانیش لەوەدا نیە، کە بانگەشەی زانینی کاتەکەی، گۆتەیەکی بێ بنەماو زانستە.

---

[1] سورة الاعراف: ٣٣

[2] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٤\٣٤٢)

## جێباسی شەشەم

# ئەو کێشانەی بەدیاریکرنی قیامەت پەیوەستن

لەوەی پێشو ڕونمان کردوە کە کاتی داهاتنی قیامەت پەنهانەو بێجگە لە خودا کەس نایزانێ، بەڵام چەند فەرمودەیەك هەیە کە کێشە دروست دەکەن، هەندێ خەڵك وا گومان دەبەن کە ئەم فەرمودانە کاتەکەیان دیاری کردوە، ئەم فەرمودانەش هەندێکیان صەحیح نین و ئاوڕیان لێنادرێتەوە و دروست نیە بەرانگژ(تعارض)ی دەقی تەواو ڕاست و بەڵگەی چەسپاوی پێ بکرێتەوە، هی واشی تێدا کە فەرمودەی صەحیحن بەڵام نابنە بەڵگەی ڕاشکاو بۆ دیاریکردنی کاتی قیامەتێ.

لەو فەرمودە هەڵبەستراو و درۆیانەی کەپێچەوانەی دەقی قورئانن هەروەك ئیبنیقەیم (بەر میهری خوا کەوێ) باسی دەکا، ئەو فەرمودەیە کە دەڵێ: ((وانها سبعة الاف سنة، و نحن في الالف السابع: دنیا هەفت هەزار ساڵە و ئێمەش لە هەزاری هەفتەمین)).

ئیبنیقەیم دەڵێ: (ئەمە یەکێکە لە درۆ زەق و زلەکان. چونکە ئەگەر ڕاست با، هەمو یەکێك دەیزانی لە ئێستا ڕا (کە ئیبنیقەییم کتێبەکەی تێدا نوسیوە) دوسەد و پەنجا و یەك ساڵ ماوە. خودای بەرزیش دەفەرموێ:

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّــــهِ: لەبابەت ڕۆژی قیامەتێ پرسیارت لێدەکەن، ئاخۆ کەی دێ، بڵێ زانستی ئەوە لای پەروەردگارمە، لەو بترازێ هیچ کەسێك ناتوانێ کاتەکەی دیاری بکا. بەڵام هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکان و زەویش قورسە. زۆر لە ناکاو و لە هێکڕا دێتە سەرتان. وا لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی کە لە هاتنی ئەو ڕۆژە ئاگاداربی. بڵێ

زانستەکەی لەلای خودایە﴾[1]).[2]

دەڵێم: بەڵگەی تەواویش کە ئەو فەرمودەیە هەڵبەستراو و درۆیە، ئەوەیە کەوا هەزاری هەفتەم بەسەرچو و چوار سەد ساڵە تێپەڕیوە و، تەنانەت زۆر لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هێشتا ڕویان نەداوە.

لەو فەرمودە صەحیحانەش کە بەڵگە نین بۆ دیاریکردنی کاتی قیامەت، ئەو فەرمودەیە کە موسلیم دەیگێڕێتەوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم بیست مانگێك بەر لەوەی کۆچ بکات، دەیفەرمو: ((تسألوني عن الساعة، وإنما علمها عند الله، وأقسم بالله ما على الأرض من نفس منفوسة اليوم يأتي عليها مائة سنة وهي حية يومئذ: لەبارەی ڕۆژی دوایی لێم دەپرسن، کەچی زانستەکەی لەلای خودایە، سوێند بە خودا دەخۆم هەر نەفسێکی ئەمڕۆ لەسەر دونیا هەناسە دەدات، تا سەد ساڵی بەسەردا تێدەپەڕی بە زندویی نامێنێت)).[3]

لە هەر دو صەحیحەکانیشدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دوا دوای ژیانیدا شەوێك نوێژی عیشای پێ کردین، کە سەلامی داوە، فەرموی: ((أرأيتكم ليلتكم هذه، فان على رأس مائة سنة منها لا يبقى ممن هو اليوم على ظهر الأرض أحد: لەم شەوەی خۆتان دیوە، لەم شەوەوە تا سەد ساڵی دیکە، کەسێك نامێنی لەوانەی ئێستا لەسەر پشتی زەویدان)).[4]

بەورد بونەوە لەم دو فەرمودەیە، ڕون دەبێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمودانەی مەبەستی داهاتنی ڕۆژی دوایی نەبوە. بەڵکو مەبەستی بەسەرچون و تێپەڕینی ئەو سەدەیە بوە کە خۆی تێدا بو، واتە پاش سەد ساڵان هەمو ئەو کەسانە دەمرن کە زندو بون ئەو کاتی پێغەمبەر ﷺ ئەمەی فەرموە. جا ئیبنی عومەر ﷺ لەم مانایە گەیشتبو، لە خەڵکیشی دەگەیاند، ئەو کاتی بۆچونی جیاجیا دروست بو لەتێگەیشتنی ئەم فەرمودانە.

---

[1] سورة الاعراف: ١٨٧.

[2] المنار المنيف، لابن القيم:ص٨٠.

[3] جامع الأصول: (٣٨٧/١٠)، ورقم الحديث: (٧٨٩٠) ومعنى: نفس المنفوسة: أي مولودة.

[4] جامع الأصول: (٣٨٨/١٠)، ورقم الحديث: (٧٨٩١)

لە سونەنی تیرمیذی و ئەبو داوددا هاتوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پاش ئەوەی ئەم فەرمودەی پێشوی پێغەمبەرﷺی هێناوەتەوە، دەڵێ: (جا خەڵکی لەتاو ئەو فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ڕاچڵەکین و بیریان دور دەڕۆیشت، کە دەربارەی ئەم فەرمودانە دەدوان و باسی دەوروبەری سەد ساڵانیان دەکرد. بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لایبقی من هو علی ظـــهر الأرض احــد: هیچ کەسێك نامێنی لەوانەی کە ئێستا لەسەر پشتی زەوی دان)). مەبەستی ئەوەیە کە ئەو سەدەیە بەسەر دەچێ و خەڵکەکەی لەناو دەچن).[1]

لە هەردو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا لە عائیشەوە، دەڵێ: (کە دەشتەکیەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، دەرباری ڕۆژی دوایی پرسیاریان لێدەکرد: کەنگی ڕۆژی دوایی دێ؟ ئەویش سەیری گچکەترین مرۆڤی لەوان دەکرد و، دەیفەرمو: ((إن یعـــش هذا، إن یدرکه الهرم، حتی قامت علیکم الساعة: ئەگەر ئەمە بژی، پیرنابێ تا قیامەتی ئێوە دادێ)). هیشام دەڵێ: مەبەستی وایە کە دەمرن.[2]

لە صەحیحی موسلیمیشدا، لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ هاتوە: (پیاوێك لە پێغەمبەرﷺی پرسی: کەینی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەر ﷺ ئێستێکی کرد، پاشان سەیری منداڵێکی کرد کە لەبەردەمی دابو و لە خێڵی (ئەزدی شەنوئە) بو، جا فەرموی: ((إن عُمِّر هذا الغلام، لم یدرکه الهرم حتی تقوم السـاعة: ئەگەر ئەم منداڵە تەمەنی درێژ بێ. پیر نابێ تا قیامەت دادێ)). ئەنەس دەڵێ: منداڵەکە ئەو کاتی ئاوزەی من بو)[3]. جا مرازی پێغەمبەر ﷺ لەم دو فەرمودە پیرۆزەدا، قیامەتی ئەوانە بوە کە قسەی بۆ کردون، هەروەکو هیشام کە یەکێکە لە بگێڕەوەکانی فەرمودەی یەکەم لێکی داوەتەوە بەوەی کە مەبەست مردنیانە، چونکە قیامەتی هەر مرۆڤێك مردنیەتی، ئەم وەرامەی پێغەمبەریشﷺ وەرامێکی پڕ دانایی بوە، چونکە ڕێنوێنی کردوە تا بۆ مردنێ خۆ ساز و ئامادە بکەن و مردنیش زۆر نێزیکە.

---

[1] صحیح الجامع: (١٠ \ ٣٨٨)، رقم الحدیث: (٧٨٩١)

[2] جامع الاصول: (١٠/٣٨٩)، ورقمه (٧٨٩٢)

[3] جامع الاصول: (١٠/٣٨٩) ورقمه (٧٨٩٣)

## جێباسی هەفتەم

# ناساندنی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

لەگەڵ ئەوەی خودا کاتی ڕودانی قیامەت لەبەندەکان شاردۆتەوە، لە نیشانەگەلێکی ئاگادار کردون، کە بەڵگەن بۆ نزیک بونەوەی ڕودانی.

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەم نیشانانە بە (اشراط) ناونراون، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنْظُرُونَ إِلاَّ السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا: ئایا بێجگە لەوە چاوەڕوانن کە ڕۆژی دوایی لەناکاو بێ؟ بەڕاستی نیشانەکانی قیامەت دەرکەوتوە﴾.[1]

وشەی (الشَرَط) کە دو سەرەی لەسەر بێ واتە نیشانە، (اشراطها) واتە: نیشانەکانی.[2] لە فەتحولباریشدا هاتوە: (مەبەست لە (اشراط) ئەو نیشانانەن کە قیامەتیان بەدوا دادێ).[3]

هەندێك زاناش بەم نیشانانە دەڵێن: (الآيات).

(الآيات) واتە: ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بە شتێك دەکەن، وەکو ئەو نیشانانەی لە بیاباندا لەسەر ڕێ دەچەقێندرێن، یا ئەو نیشانانەی لەسەر لێواری دەریادا بەرز دەکرێنەوە، تا ڕێنمایی ئەو کەشتیانە بکا کە لە نێو دەریادا ڕەت دەبن، یا ئەو نیشانانەی لە نزیك شاران دادەنرێن بۆ ئەوەی گەشتیار ئاگادار کەنەوە لە نزیك بونەوەی لەو شارەی لە نێزیکی دانراوە.

(الطيبي) دەڵێ: (مەبەست لە (الآيات) نیشانەکانی ڕۆژی دوایین جا یان مانای نێزیك بونەوە یا مانای ڕودانی دەگەیەنن، لەوانی مانای نێزیك بونەوەی دەگەیەنن؛ دەجال و، دابەزینی عیسا ﷺ و، یاجوج و ماجوج و، نغرۆکردن(خسف). لەجۆری

---

[1] سورة محمد: ١٨

[2] مختار الصحاح: ٣٢٤

[3] فتح الباري: (٧٩/١٣)

دوەمیش کە مانـای داهـاتنی دەگەیـەنن؛ دوکـەڵ و، هـەڵاتنی رۆژ لـە رۆژئـاوا و، دەرکەوتنی جوڵندەکە(دابة) و، ئەو ئاگرەی خەڵکی کۆ دەکاتەوە.[١]

## جێباسی هەشتەم

## سودی تۆژینەوەی نیشانەکانی رۆژی دوایی و پەنهانە داهاتوەکان

رەنگە هـەبێ بڵێ: ئێوە خۆتـان بە ڕوانینـی هـەندێك مەسـەلەی کـەم سـود مـاندو کردوە، چاکتر وابو بەباری موسڵمانان و دۆز و گرفتـەکانیان خـەریك ببونایـە، لـەباتی ئەوەی کـاتێکی درێـژ بەسـەر ببـەن بـە گـەڕان و تۆژینـەوەی ڕوداو و کارەسـاتەکانی داهاتو. دەشڵێن: ئێوە لەو واقیعە هەڵدێن کە تێیدا دەژین، بەرەو جیهانێکی دیکە کە هیواخـوازن تێیـدا بژیـن، یـا لێـی دەترسـێن بەسـەرتان دابـێ، ئەمـەش هەڵاتنـە لـە روبەڕوبونەوەی ڕاستی و ناخۆشیەکان.

ئێمەش پێیان دەڵێن: ئێمە سەرپشك نین لە لێکۆڵینـەوەی پەنهانـە داهاتوەکـان، یـا پشـتگوێ خستنیان، کارەکە لـە دەست ئێمـە نیـە، چونکە ئاگـایی و حـاڵی بـون لـەو پەنهانـە و بـاوەڕ پێکـردن و بەڕاسـت زانینیـان لـە کرۆکـی ئـەو ئاینەیـە کـە پێغەمبەرەکـەمان ﷺ بـۆی هێنـاوین، جـا قورئـان هێندێکـی پـێ ڕاگـەیاندوین و، هێندێکیش لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺەوە هاتون. هاوەڵان ئەوانـەیان هـەمو زانیـوە و، خۆیـان پـێ خـەریك کردوە و، گرنگیـەکی زۆریـان پێـداوە، بـڕواش بـە پەنـهان یەکـەم سیفەتە کە خودا پارێزکارانی رێنوین بو و سەرکەوتوی پێ هەڵناوە:

﴿الم، ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـالْغَيْبِ وَيُقِيمُـونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ: ئەلف، لام، میم، ئەمە ئەو قورئانەیە کە گومانی تێدا نیە و هۆی رێنماییە بۆ پارێزکاران؛ ئەوانەی کە بڕوا بە پەنهان دێنن و نوێژ دەکەن و

[١] فتح الباري: (١١/٣٥٢)

لەو بەهرانەی بەوانمان داوە، دەبەخشن.﴾[1].

ڕاستە موسڵمانێکی زۆر خۆیان بەهێندێك هەواڵی پەنهانی واوە خەریك کردوە کە بەڵگەی لە قورئان و سونەتدا نەبوە و، کەسانێکیش لەوانەی کە خۆیان بە زانستدا شۆڕ کردۆتەوە، خۆیانیان تێدا نقوم کردوە.

بەڵام خەریك بون بە دەقە ڕاست و دروستەکان، بەشێکە لەو ئاینەی کە خودای زانا و شارەزا دایبەزاندوە.

ئێمە دەتوانین سەرکۆنەی ئەوان موسڵمانان بکەین کە دەستیان لەکار بەرداوەو، دەستەوئەژنۆ دانیشتون و، چاوەڕێی ئەو ڕوداوانە دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ڕاگەیاندوە، وەکو ئەوانی واز لە جیهاد دێنن و چاوەڕێی دەرکەوتنی مەهدین. بەڵام ئەمە هەڵەیەکە و پێویستی بە ڕاستکردنەوەیە و، ناشکرێ واز لە دەقە دروستەکان بێنن، چونکە پێشینە چاکەکانمان، لەگەڵ بڕوایان بە پەنهانە ڕاستەکان وازیان لە جیهاد نەهێناو دەستیان لەکار بەرنەدا.

دەشکرێ سەرکۆنەی توندی ئەو کەسانە بکرێ کە هەواڵە پەنهانەکانی پێغەمبەرﷺ لە شوێنی نەشیاودا دادەنێن و، دەقەکان بەباری نەگونجاودا دەشکێننەوە و، بانگەشەی وا هەڵدەبەستن بەندانی پێ گومڕا دەکەن، وەکو ئەوانەی بە درێژایی مێژو بانگەشەی مەهدیاتیان کردوە. بەڵام ئەمە هەڵەی ئەوانەیە و، هەڵەش ڕاست دەکرێتەوە و، ئەو پەڵەو هەڵانە هەڵمان نانێن تا باوەڕ بە دەقە ڕاستەکان نەکەین، چونکە هەق هەقە و، ناهەقیش ناهەق، جا نابێ ناهەق بە ئینکار کردنی هەق لابەین.

ئەوانی لاگریش دەبن لە خەریك بونمان بەم دەقە دروستانەی ئەم لایەنە، سەرنجیان ڕادەکێشین بۆ ئەو هەمو هەوڵە زۆرەی زانا هاوچەرخەکان لە دەرخستنی ڕازی نادیاری ڕابردوی دور و، ڕازی نادیاری دوایین، بۆیە دەیانبینین شوێنەواری پێشینەکانی ڕابردو تاوتوێ دەکەن و لاپەڕەی نوسراو و دەسکار و کاولگەکانیان

[1] سورة البقرة: ١-٣

هەڵدەدەنەوە. هەروەها دەیانبینین گرنگی بە گوتەی فاڵچی و پێشبینان دەدەن. لەگەڵ ئەوەی قسەی ئەمانە درۆیە و فڕی بەسەر ڕاستیەوە نیە. وە دەیانبینین دووربین و هاوێنەی گەورە و ڕوانگەی زەبەلاح دروست دەکەن و، مانگی دەسکرد دەنێرنە ئاسمانیٚ، تا شارەزابن لەو شتانەی نایزانن.

جا ئەگەر ئەمە حاڵی مرۆڤ بێت، هەمیشە ئارەزوی زانینی ئەو شتانەیان هەبیٚ کە نایزانن. حەز دەکەن ڕابردو و داهاتو بزانن، بە بونەوەری چواردەوری خۆیان ئاشنابن، ئەدی چۆن ئاگابون لە حەقیقەتی شتان لە لایەنێکەوە کە هەرگیز درۆی تێدا نیە، شیاو و شایانتر نیە!! ئەو زانیاریانەی دەقە دروستەکان لەم بوارە هێناویانە زانیاری یەکجار بەهادارن، بەلاّم مرۆڤایەتی زۆر لەخۆبایی بوە، کە وەرگرتنی هەواڵی سروشی ڕاستگۆی ڕەت کردۆتەوە، زۆر زیانباریش بوە کە پشتی لەو زانستە چاکانە کردوە. پاشان خەڵکانێك هەن دەیانەویٚ ئێمە وەدور کەوین لە لێکۆڵینەوەی ئەم بوارە لە میانەی دەقەکانی سروشەوە، لەکاتێکدا بە دوای هەر هەواڵێك غار دەدەن، کە زانایانی ڕۆژئاوا لەم بوارەدا دەیاندەنیٚ، هەرچەند درۆ و تێکەڵکاریەکی زۆری لەگەڵ دابێت.

دەتوانین ئەو سودانەی لە تۆژینەوەی ئەو هەوالاّنە دەستمان دەکەویٚ کە باس لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و پەنهانە داهاتوەکان دەکەن، لەم خالاّنەدا کورت بکەینەوە:

١) بڕوابون بەو هەوالاّنە کاتێك لە ڕاست و دروستیان دڵنیابین، لە بڕوا بون بە خودا و پێغەمبەرەکەیەوەیە ﷺ ، ئەدی چۆن بڕوامان بەخودا و پێغەمبەرەکەی دەبیٚ ئەگەر بە هەواڵەکانیان باوەڕ نەکەین ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ: ئەمە ئەو قورئانەیە کە هیچ گومانێکی تێدا نیە و ڕێنماییە بۆ پارێزکاران کە بڕوا بە پەنهان دێنن.﴾

٢) ڕودانی ئەو پەنهانانە بەو شێوەیەی هەواڵەکان باسیان دەکەن، بڕوا جێگیر و بەهێز دەکەن، چونکە موسڵمانان لە هەمو چاخ و سەردەمێکدا ڕوداوی وا دەبینن لەگەڵ ئەوانە تێك دەکەنەوە کە هەواڵە ڕاستەکان باسیان کردوە. هاوەڵان دیتیان کە

ڕۆمی بەسەر فارساندا سەرکەوتن و، پاشانیش موسڵمانان بەسەر فارس و ڕۆمیاندا سەرکەوتن و، ئیسلام بەسەر هەمو دینەکاندا باڵا بو. هەروەها لێك جیابونەوەی ئەم ئوممەتەیان لەهەمان ئەو ساڵیدا دیت کە پێغەمبەر ﷺ دیاریکردبو. گەلێك ڕوداوی تریشیان دیت، بەو شێوەیەی کە لە دەقەکاندا باس کرا وابون. لە هەمو سەردەمێکیشدا هەروایە؛ موسڵمانان ڕوداو کارەساتی وا دەبینن کە لە هەواڵەکاندا هاتبن. گومانیش لەوەدا نیە ئەمە کاریگەریەکی گەورەی لە جێگیر کردنی ئیمانداردا دەبێ لەسەر ئیمانەکەی. ڕەنگە ئەوەش ببتە دەروازەیەك بۆ بانگەوازی خەڵکانی دی بۆ ئەو هەقەی لە پەروەردگارمانەوە هاتوە.

٣) جێگیربونی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی؛ چونکە قیامەت و پەرژەنگەکانی لەو پەنهانانەن کە خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان گەیاندوین. باوەڕیش بە قیامەت یەکێکە لە کۆڵەگەکانی باوەڕ. ڕودانی ڕوداوانیش لە دنیادا بەو شێوەیەی لە دەقەکاندا هاتوە، بەڵگەیەکی ڕونە، کە هەمو هەواڵەکان ڕاستن، لەوانەش هەواڵەکانی قیامەتیٚ؛ چونکە هەموی هەر لە خودای بەرز و بێهاوتاوەیە.

٤) خودا پێغەمبەرەکەی ﷺ هەناردوە تا ڕێبەری چاکە بێ و لە خراپە ئاگادار بکاتەوە. پێغەمبەریش ﷺ ڕێنمایی هاوەڵانی کردوە بۆ نمونەییترین بەرنامە کە پێویستە بیگرنە بەر لەو ڕوداوانەی لەسەردەمی ویدا ڕویان داوە. کە هەواڵی پەنهانە داهاتوەکانیشی داوە، ئاڕاستەکردنێك بوە بۆ ئەوانەی پاشەخۆی دێن لە ئوممەتەکەی، تا بتوانن لە ئاست ئەو ڕوداوانەدا ڕەفتار بکەن کە ڕەنگە ڕوی هەقی تێدا ئاشکرا نەبێت. لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص هاتوە، دەڵێ: (لەگەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بوین، لە شوێنێك دابەزین، یەکمان ڕەشماڵەکەی چا دەکرد و، یەکێکمان بارەکانی دەکردەوە و، ئەوی تر بە ئاژەڵان خەریك بو، لەو کاتی بانگوێژی پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو، لەلای پێغەمبەر ﷺ کۆبوینەوە. فەرموی:

((انه لم يكن نبي قبلي إلا كان حقاً عليه أن يدل أمته على خير ما يعلمه لهم، وينذرهم شرّ ما يعلمه لهم، وإن أمتكم هذه جعل عافيتها في أولها، وسيصيب آخرها بلاء وأمور تنكرونها، وتجيء

فتنة، فيرقق بعضها بعضا، وتجيء الفتنة فيقول المؤمن: هذه مهلكتي، ثم تنكشف، وتجـــيء الفتنـــة، فيقول المؤمن: هذه، هذه، فمن أحب أن يزحزح عن النار ويدخل الجنة، فلتأته منيته وهو يؤمـــن بالله واليوم الآخر، وليأت الناس الذي يحب أن يؤتى إليه، ومن بايع إماماً، فأعطاه صفقـــة يـــده، وثمرة قلبه، فليطعه مـــا اســـتطاع، فـــإن جـــاء الآخـــر ينازعـــه، فـــأضربوا عنـــق الآخـــر: هـەر پێغەمبەرێکی لە پێشە من هاتبێ ئەو هەقەی لەسەر بوە کە ئوممەتی خۆی رێنوێنی بکا بۆ ئەو خێرەی کە دەیزانێ و، ئاگاداریشیان بکاتەوە لەو شەڕەی دەیزانێ. ئەم ئوممەتەی ئێوەش سەلامەتی لە سەرەتاکەی دایە، بەلاّ و باری ناخۆشیش توش دواییەکەی دێ، ئاشوبێك دێ، هێندێکیان دەکاتە کۆیلەی هێندێك. ئاشوبێکی تر دێ. بڕوادار دەڵێ: بەوەی تێدەچم، پاشان بەسەردەچێ و، ئاشوبێکی دی دێ، بڕوادار دەڵێ: ئەوەیانە، ئەوەیانە.. جا ئەوی حەز دەکا لە ئاگری بترازێ و بچێتە بەهەشت، با ئەو کاتی مردن دەیگاتێ، بڕوای بەخوا و بەرۆژی دوایی هەبێ، پێی خۆشە خەڵك چۆن بن لەگەڵی، با ئەویش لەگەڵ خەڵکی ئاوابێ، هەرچی بەیعەتیشی بە پێشەوایەك دا و، لەپی دەستی و بەروبومی دڵی دایە، با تا پێی دەکرێ گوێڕایەڵی بێ. ئەگەر یەکێکی دیکە هات ململانێی پێشەواکەی کرد، لەملی ئەوی دیکە دەن)).[1]

لەو ئاراستەکردنانەش کە کاریگەریەکی گەورەیان هەبوە لە رێنمایی موسڵمانان بۆ هەق، موژدەدانی پێغەمبەرە ﷺ بە عوسمان ﷺ کە بەهۆی ئەو بەلاّیەی توشی دێ دەچێتە بەهەشت و، ئەو هەواڵەش کە کۆمەڵێکی سەرکەش عەممار دەکوژن و، فەرمانی بۆ ئەبوذەر کە لە ئاشوب دورکەوێتەوە و کەنارگیر بێ و، ئەگەر بشکوژرێ شەڕ نەکا.

دەکرێ ئەو مانایەش بفامرێتەوە لە فەرمودەی حوذەیفە، کە لە بارەی شەڕەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد نەوەك بیگاتێ، لەکاتێکدا کە هاوەڵان لەبارەی خێرەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد. هەر بەم بۆنەیەوەشە کە پێغەمبەر ﷺ

---

[1] رواه مسلم والسياق له، والنسائي وابن ماجة وأحمد، سلسلة الأحاديث الصحيحة: رقم (٢٤١).

بەرهەڵستی کردوە لەوەی موسڵمان دەست بۆ شتێك ببەن لەو چیایە زێڕەی کە لەئاخیرزەمانیٚ فورات دەریدەخا، هەروەها هەواڵی حەقیقەتی دەجالی پێداون و، ئەو وێچونانەش(شبهات)ی دەرخستوە کە دەجال دەیانهێنی. گەلێك روداوی دیکەش کە پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی خۆی بینا کردوە تا بەشێوەیەکی نمونەیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن.

٥) رەنگە موسڵمانان لەداهاتودا هەندێك پێشهاتی وایان بەسەربیٚ کە پێویستی بەزانینی حوکمی شەرعی هەبیٚ. ئەگەر موسڵمانانیش بۆ کۆشین(اجتهاد)ی خۆیان وازیان لیٚ بهێنریٚ رەنگە ناکۆك و جیاڕا بن و بەڕاستەریٚ نەگەن. تەنانەت رەنگە حوکمی شەرعی لەئاست هەندێك ڕوداوان ببێتە ئەرك و واجب و، لێڵی و نادیاریش بە کەموکورتیەك بژمێردری کە شەریعەت لێی بەریە. لەوانەش؛ پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە دەجال چل رۆژان لە زەویدا دەمێنتەوە، یەکێك لە رۆژەکانی وەکو ساڵێکە و، رۆژێکیان وەکو هەیڤێکە و، رۆژێکیان وەکو هەفتەیەکە و، رۆژەکانی دیکەش وەکو رۆژانی ئێمە ئاساین. جا یاوەران لە پێغەمبەرﷺیان پرسی لەبابەت ئەو رۆژە درێژانە، ئایا نوێژی رۆژێك بۆ هەریەکەیان بەسە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا، اقدروا لە قـدرە: نەخێر، هەر رۆژەو بەقەدەر خۆی بۆ بخەمڵێنن)). جا ئەگەر بەندەکان ئەسپاردەی کۆشین(اجتهاد)ی خۆیان بکرابان، هەر بەو پێنج نوێژە وازیان دێنا، کە لە رۆژانی ئاساییدا لەکاتانی دیاریکراودا ئەنجام دەدرێن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ رایگەناندوە کە عیسا ﷺ پاش دابەزینی سەرانە لە جولەکە و گاوران قبولٚ ناکا و، لەبڕواهێنان بترازیٚ لێیان رازی نابێت. ئەم ڕونکردنەوەیەش لە پێغەمبەر ﷺ پێویستە، چونکە عیسا ﷺبەم شەرعە حوکم دەکات، ئەم شەرعەش قبولٚ کردنی سەرانەی تێدایە لەوانەی کە دەیدەن، تا کاتی دابەزینی عیسا کوڕی مەریم ﷺ و، ئەوکات سەرانە هەڵدەگیریٚ و، هەر کەسێکی بڕوا نەهێنی دەکوژریٚ، جا با سەرانەش بدا.

٦) هەوڵدان بۆ ئاگابون لە روداوەکانی داهاتو، مەسەلەیەکە لە سروشت و

ڕێخت(فطرة)دایە. مرۆڤ لەناخیدا هەست بە ئارەزویەکی توند دەکات بۆ زانینی ئەو پێشهات و روداوانەی رەنگە بەسەر جۆری مرۆڤ بێن، یا بەسەر ئەو ئوممەتەی بێن کە ئەوی گرتۆتە خۆ، یا بەسەرەخۆی بێ، هەر بۆیەشە سەرکردە و پاشاکان و تەنانەت تاك تاکی ئاساییش بۆ زانینی ئەو شتانە پەنا دەبەنە بەر جادوگەرو پێشبین و ئەستێرەگەران. جا خودای گەورە ئەو هەقەی بۆ هاوردن کە لەم لایەنە بێنیاز و بێ پێویستیان دەکا.

ئیبنی خەلدونیش لە پێشەکی مێژوەکەیدا باسی ئەم سودەی کردوە و، دەڵێ:

(یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی دەرونی مرۆڤان بریتیە لە ڕوانین بۆ سەرەنجامی کاروباریان و، زانینی ئەوەی بەسەریان دێ لە ژیان و مردن و خێر و شەڕ، نەخاسمە روداوە گشتیەکان وەك زانینی ماوەی ماوە لە تەمەنی دنیاو زانینی هەڵکشان و داکشانی وڵات و دەسەڵاتان و، هەوڵدانیش بۆ ئەمە لە سروشتی مرۆڤ دایەو فرچکیان پێوە گرتوە، بۆیەشە خەڵکێکی زۆر دەبینین مەرەقیانە ئەو شتانە بە خەون ببینن.

هەواڵی پێشبینەکانیش زانراو و دیارە کاتێك خەڵکانێك دەچنە لایان بۆ زانینی ئەم جۆرە هەواڵانە، جا چ پاشا بن یا رەشۆکی خەڵکی. لە شارانیشدا رەنگە خەڵکانێك ببینین ئەمەیان کردۆتە پیشە، چونکە دەزانن خەڵکی چەند بۆی مکوڕن، جا سەرەڕێیان دەگرن و بە جادە و کۆڵاناندا دەسوڕێنەوە بە دوای کەسێك پرسیاریان لێبکا، جا ژن و کوڕیژگەی ئەو شارەی هاموشۆیان دەکەن و گەلێکی بێهۆشیش دە داویان دەکەون و، هەولی ئاشکرا کردنی ئاکام و سەرنجامیان بۆ دەدەن، لەبابەت قازانج و سەرداری و بەڕێوەچون و دەگەڵ ژیان و دوژمنایەتی و شتی دیکە پرسیاریان لێ دەکەن، جا چ بەهێڵ کێشان لەنێو لمدا بێ کە کاری ئەسێترەگەرانە، چ بە بەرد و دانەوێڵە هەڵدان بێ، چ بە سەیرکردنی ئاوێنە و ئاو بێ کە بە مەندەل ناسراوە و، لەو کردارە بەدانەیە کە لەوڵات و شاراندا بڵاوە و، شەرعیش زۆری زەم کردوە، مرۆڤیش پەنهانیان لێ داپۆشراوە، بێجگە لەوانەی کە خودا بۆ خۆی هەواڵیان

پێدەدا جا چ لەخەودا بێ یا دۆستایەتی و کەرامەت.

زۆربەی ئەوانەی گرنگی بەم بابەتە دەدەن شا و شازادەکانن لەبارەی هەڵکشانی تەمەنی وڵات و موڵکیان. هەر بۆیەشە ئەهلی عیلم گرنگیان بەمە داوە. هەر ئوممەتێك، قسەی پێشبینێك یا ئەستێرەگەرێك یا وەلیەکیان لایە لەبابەت پاشایەك کە چاوەڕوانی دەکەن یا دەوڵەتێك کە لە نێوەخۆیان لەبارەی قسەدەکەن، لەگەڵ ئەو شەڕ و کارەساتانەی بەسەریان دێ و، ماوەی مانەوەی دەوڵەتەکەیان و، ژمارەی پاشاکانیان و، هەوڵدان بۆ زانینی ناوەکانیان.

پێشبین و فاڵچیش لەنێو عارەباندا هەبون، بۆ ئەم مەسەلانە دەچونە لایان، هەواڵی ئەوەشیان ڕاگەیاند بو کە عەرەب چ موڵك و دەوڵەتێکیان دەبێت. هەروەك بەسەر (شیق و سوطەیح)دا هات لە لێکدانەوەی خەونی ڕەبیعەی کوڕی نەصر کە یەکێك بوە لە پاشاکانی یەمەن، هەواڵی دانێ کە حەبەشی وڵاتیان دادەگرن و پاشان بۆیان دەگەڕێتەوە و، ئینجا لە دواییدا موڵك و دەوڵەتێك بۆ عارەبان پەیدا دەبێت. هەروەها لێکدانەوەی سوطەیح بۆ خەونی موبەذان کاتێك کیسرا لەگەل عەبدولمەسیح ناردیە لای و، هەواڵی پێدان کە دەوڵەت و دەسەڵاتی عارەبان دەردەکەوێ.

هەروەها لە نەوەی بەربەرانیش پێشبین هەبون و، ناسراوترینیان موسا کوڕی صالحە لە بەنی ییفرەن و هەندێکیش دەڵێن لە غەمرەیە، کە هەندێك پێشبینی وڵات و موڵکی بەشێوەی شیعر هەیە و، ڕوداوی گەورەی تێدا باسکراوە، زۆربەشی لەبابەت بەسەرهات و ڕوداوی موڵك و دەوڵەتی مەغریبە و، ئەمەش لەنێوان چیانشینەکاندا بڵاوە، جا هەندێك دەڵێن گوایە وەلی بوە. هەندێکیش دەڵێن پێشبین(کاهن) بوە، ڕەنگە هەندێکیش زۆر دور بڕۆن و بڵێن پێغەمبەر بوە چونکە مێژوی وی لەلای ئەوان زۆر لە پێش کۆچە. خوداش زانا و شارەزایە).[1]

---

[1] المقدمة لابن خلدون: ص٥٨٧ – ٥٨٨

## جێباسی نۆیەم

# بەشەکانی نیشانەکانی رۆژی دوایی

**گەلێك فەرمودە لە پێغەمبەرﷺەوە هاتون کە کۆمەڵێك لە نیشانەکانی قیامەتی ژماردوە، بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:**

((لا تقوم الساعة حتى تقتتل فئتان عظيمتان تكون بينهما مقتلة عظيمة، دعوهما واحدة، وحتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين، كلهم يزعم أنه رسول الله، وحتى يقبض العلم، وتكثر الزلازل، ويتقارب الزمان، وتظهر الفتن، ويكثر الهرج وهو القتل، وحتى يكثر فيكم المال، فيفيض حتى يُهمَّ رب المال من يقبل صدقته، وحتى يعرضه، فيقول الذي يعرضه عليه: لا أرب لي به، وحتى يتطاول الناس في البنيان، وحتى يمر الرجل بقبر الرجل، فيقول: يا ليتني مكانه، وحتى تطلع الشمس من مغربها، فإذا طلعت ورآها الناس آمنوا أجمعين، فذلك حين لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا: **قیامەت هەڵناستێ هەتا دو کۆمەڵی گەورە لە ئیسلام لەگەڵ یەکتر شەڕ دەکەن و کوشتارێکی زۆریان لە نێوان ڕودەدات، لەگەڵ ئەوەی بانگەوازی هەردوکیان یەکە. هەتا نێزیك سی دەجالی درۆزن پەیدا دەبن و هەمویان وا هەڵدەبەستن کە پێغەمبەری خودان، هەتا زانست لە بن دێ و، تاکو بومەلەرزە زۆر دەبێ و، کاتەکان لێك نزیك دەبنەوە و، ئاشوب زۆر دەبێ و، کوشتن زۆر دەبێ، هەتا ماڵ و سامان زۆر دەبێ و لەبەری دەڕوا و، خاوەن ماڵ خەمبار دەبێ چونکە کەس خێری لێ قەبوڵ ناکا و، ماڵ دەداتە خەڵکانێکی پێویست، کابرا دەڵێ: هیچ پێویستم نیە؟ هەتاکو خەڵك لە بەرزکردنی بنیاتی خانوبەرەدا رکابەری دەکەن، هەتا وای لێدێ کەسێك بەلای گۆڕێکدا ڕەت بێ، دەڵێ: خۆزگە من لەجێی وی بومایە. هەتا رۆژ لە رۆژئاواوە هەڵدێ، جا کە لەوێوە هەڵات و، خەڵك دیتیان هەمو بڕوا دێنن،**

بەڵام ئەوی تا ئەوکاتەبڕوای نەهێنابێ، بڕوا هێنانەکەی سودی نابێت، یان بڕوای هەبێ و کاری چاکی نەکردبێت، چاکەکاری لەمەودوای سودی نابێت)).[1]

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە، لە عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: (لەغەزای تەبوکدا چومە لای پێغەمبەر ﷺ لەژێر خێوەتێکی چەرمدا بو، فەرموی: ((أعدد ستاً بين يدي الساعة: موتي، ثم فتح بيت المقدس، ثم مُوتان يأخذ فيكم كقُعاص الغنم، ثم أستفاضة المال، حتى يعطى الرجل مائة دينار فيظل ساخطاً، ثم فتنة لا يبقى بيت من العرب الاّ دخلته، ثم هدنة تكون بينكم وبين بني الأصفر، فيغدرون، فيأتونكم تحت ثمانين غاية، تحت كل غاية اثناعشر الفاً: شەش شتان لەپێش قیامەت هەستانێ بژمێرە: مردنی من، فەتحی بەیتولمەقدیس، دەردێکتان تێ دەکەوێ وەکو ئەو دەردەی توشی مەڕ دەبێ و ئاوی لەبەر کەپوی دەڕوا، کە زۆرتانی پێ دەمرن، پاشان ماڵ زۆر بونێکی وا کە سەد دینار دەدەیت بەیەکێك کەچی توڕە دەبێت و بەکەمی دەزانێ، پاشان ئاشوبێك پەیدا دەبێ هیچ ماڵێك لە عارەبان نامێنێ نەچێتە ناویەوە، پاشان رێکەوتنێك لەنێوان ئێوە و بەنی ئەصفەر(ولاتانی رۆژئاوا)دا دەبێ، ئەوان غەدر دەکەن و پەیمانەکە دەشکێنن، بە لەشکرێکی هەشتا بەیداخەوە دێنە سەرتان، هەر بەیداخێك دوازدە هەزار کەسی لەژێر دابێت)).[2]

لەئەنەسەوە ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من أشراط الساعة الفُحش والتَفَحُّشُ، وقطيعة الرحم، وتخوين الأمين، وإئتمان الخائن: ئەمانە لەنیشانەکانی قیامەتن: بەدی و، بەدکاری و، پچڕاندنی خزمایەتی و، بەناپاك زانینی دەسپاکان و، بەدەسپاك دانانی ناپاکان)).[3]

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیشەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من أشراط الساعة أن يمر الرجل في المسجد، لا يصلي فيه ركعتين، وأن لا يسلم الرجل الا على من يعرف:

---

[1] رواه البخاري في كتاب الفتن، حديث رقم (٧١٢٠)؛ (فتح الباري) (٨١/١٣)، وقد رواه مسلم في صحيحه مفرقاً، وقد جمع رواياته ابن الأثير في جامع الأصول (٤٠٤/١٠) ورقم الحديث (٧٩٢٠).
[2] رواه البخاري في صحيحه: انظر جامع الأصول (٤١١/١٠)، ورقم الحديث (٧٩٢٧).
[3] رواه البزار، والطبراني في الأوسط عن أنس، واحمد والبزار عن ابن عمرو؛ صحيح جامع الصغير: ٢١٣/٥.

لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە پیاو بە مزگەفتێدا تێدەپەڕێ و دو ڕکاتە نوێژی تێدا ناکات، هەروەها پیاو تەنیا سڵاو لەوانە بکا کە دەیانناسێ)). [1]

لە ئەنەسەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من أشراط الساعة أن يتباهى النـــــاس في المساجد: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە خەڵکی لە مزگەفتان خۆ هەڵکێشن)) [2].

جا ئەم نیشانانە کە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمودانە و زۆری دیکەشدا باسی کردون، زانایان بەسەر دو بەشان دابەشیان کردون؛ نیشانە بچوکەکان و، نیشانە گەورەکان.

دەکرێ نیشانە بچوکەکانیش بکرێنە دو بەش؛ بەشێك ڕوی داوە و، بەشێك هێشتا ڕوی نەداوە.

ئەوی ڕوشی داوە ڕەنگە بەسەر چوبێ و تێپەڕیبێ، دەشبێ بە جارێك نەیێتە ئارا، بەڵکو وردە وردە دەرکەوێ، یا ڕودانی دوبارە بێتەوە، واش دەبێ لەداهاتو زیاتر لەوەی ڕوبدا کە لە ڕابردو ڕویداوە.

جا لەبەرئەوە چواربەند بۆ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی گرێ دەدەین:

یەکەم: ئەو نیشانە بچوکانەی ڕویاندا و بەسەرچون.

دوەم: ئەو نیشانە بچوکانەی ڕویانداوەو ئێستاش بەردەوامن و ڕەنگە دوبارەش ڕوبدەنەوە.

سێیەم: ئەو نیشانە بچوکانەی تا ئێستا ڕویان نەداوە.

چارەم: نیشانە گەورەکان.

---

[1] رواه الطبراني؛ صحيح الجامع الصغير: ٥/٢١٣

[2] رواه ابوداود، وأحمد في مسنده، والدارمي، وابن خزيمة؛ صحيح الجامع الصغير: ٥/٢١٣

# بەندی دووەم

# دوو نیشانانەی رویان داوە

مەبەستمان ئەو نیشانانەن کە ڕویـان داوە و بەسـەرچون و دوبارە ڕونادەنـەوە. ئەمانەش زۆرن، ئێمە هەندێکیان باس دەکەین.

## جیاسی یەکەم

## نێردران و کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ

نێردران و کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ لەنیشانەکانی قیامەتن، لە فەرمودەیەکدا لـە لای بوخاری و موسلیم هاتوە، لەسەهلی کوڕی سـەعدەوە، دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺم بینی هەردو پەنجەی دۆشاومژە و ناوەڕاستی ئاوا ڕاگرت و، فەرموی:

((بعثـت انـا و الســاعة كـهاتين: نـێردرانی مـن لەگـەڵ ڕۆژی دوایـی وەك ئـەم دو ئەنگوستەیە)). لە گێڕانەوەیەکی تریشدا، فەرموی: ((بعث انا والساعة كـهاتين)) ئـەوجا ئاماژەی بە دو پەنجەکەی کرد و، درێژی کردن.[1]

لە هەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم و سونەنی تیرمیذیدا هـاتوە، لـە ئەنەسـی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((بعث انا والساعة كهاتين، كفضل احداهما على الأخـرى: نێردرانی مـن و ڕۆژی دوایـی وەکـو ئـەم دو پەنجەیـە وان، وەکـو زیـادەی یـەکێکیان لـە ئاسـت ئـەوی تـر))، جـا

---

[1] جامع الاصول: (١٠/٣٨٤)

**دۆشاومژه و ناوەڕاستی خستە پاڵ یەك.**[1]

**لە ژیاننامەکانی پێغەمبەرﷺیشدا هاتوه کە جولەکە لەبابەت پێغەمبەرﷺ دەیانگۆت: لەگەڵ قیامەت ڕەوان دەکرێ.**

**کەمێك بەر لەئێستاش فەرمودەی عەوفی کوڕی مالیکمان لەلای بوخاری هێناوە، کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا فەرموی: ((أعدد ستا بين يدي الساعة؛ موتي...: شەش شت بەر لەهاتنی قیامەت بژمێرە؛ مردنی من...)).**

**ئەحمەدی پێشەواش بە سەنەدێکی ڕاست لە ئەبو جوبەیرە دەگێڕتەوە، لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((بعثت في نسم الساعة))[2] بەپێی گۆتەی ئیبنیئەثیر مانای فەرمودەکە وایە: من لە یەکەم کزەبای قیامەتێ نێردراوم. واتە: لەسەرەتای نیشانەکانی ڕۆژی دواییدا نێردراوم.**

## جێباسی دوەم

## لەتبونی مانگ

**زانایان یەکدەنگن کە مانگ لەسەردەمی پێغەمبەرﷺدا لەتبوە و، لەتبونیشی لەپەرچوە(معجزة) پرشنگدارەکانە.[3] قورئانیش بە ڕاشکاوی لەمە دواوە کە دەفەرموێ:** ﴿اقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ، وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ **: قیامەت نێزیك کەوت و مانگ لەت بو، وە ئەگەر بێبڕواکان موعجیزەیەك ببینن، ڕوی لێ وەردەگێڕن و دەڵێن: ئەمە جادوەکی بەردەوامە﴾.[4]**

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] سلسلة الاحاديث الصحيحة: (٢\٤٦٧). ورقم الحديث: ٨٠٨

[3] تفسير ابن كثير: (٦/٤٩٦).

[4] سورة القمر: ١، ٢.

نـەوەوی دەڵـێ: (قـازی دەڵـێ: لـەتبونی مـانگ لـە موعجـیزە هـەرە مەزنـەکانی پێغەمبەرمانە ﷺ و، چەند هاوەڵێك ﷺ گێڕایتیانەوە، لەگەڵ ڕواڵەت و مانـای ڕونـی ئایەتەکە.. ئـەلزەجاج دەڵـێ: هێندێـك بیدعـەچی لـەخۆبایی و لـەدین دەرچـو، ئـەم موعجیزەیـان ڕەت کردۆتـەوە، چونکە خـودا دڵـی کویێر کـردون و، لەعەقڵیشـدا بـواری ڕەت کردنـەوەی نیە، چونکـە مـانگ بەدیهێنراوێکی خـودای بـەزرە، ویسـتی چـۆن بـێ وای لێدەکات، هەروەك لە دواییدا، تونای دەکات و دەیپێچێتەوە.)[1]

ئیبنـی کـەثیریش لـە ڕاڤـەی سـورەتی (القمـر)دا گـەلێك فـەرمودەی هـاوردوە کـە لەبابەت لەتبونی مانگ هاتون. فەرمودەکانیش زۆرن و صەحیحیشن،[2] موسلمیش لە صەحیحەکەیدا هاوردونی. لەوانەش فەرمودەی ئەنەس، کە خەڵکی مەککە داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد نیشانەیەکیان نیشان دا، ئەویش دو جاران لەتبونی مانگی نیشان دان.[3] هـەروەها فـەرمودەی عـەبدوڵلای کـوڕی مەسـعود کـە دەڵـێ: (لـە سـەردەمی پێغەمبەرﷺدا مانگ بۆ دو لەتان شەق بو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اشهدوا؛ اشهدوا: شایەدبن، شایەدبن)). لە ریوایەتێکی دیکەشدا هەر لەویەوە، دەڵێ: (کاتێك لە مینادا لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا بوین، مانگ بۆ دو لەتان شەق بو، جا لەتێکی لـەو دیوی چیا بو و لەتێك لەم دیوەی، پێغەمبەریشﷺ بە ئێمەی فەرمو: ((اشهدوا: شایەدبن)).[4]

---

[1] شرح النووي على مسلم: (١٤٣/١٧).

[2] تفسير ابن كثير: (٤٦٩/٦).

[3] رواه مسلم في صحيحه، باب انشقاق القمر، (٢١٥٩/٤)، وحديث رقم (٢٨٠٢).

[4] رواه مسلم في صحيحه، باب انشقاق القمر، (٢١٥٨/٤)، وحديث رقم (٢٨٠٠).

## جێباسی سێیەم

# ئاگرەکەی حیجاز کە گەردنی حوشتری لەبوصرا روناك کردەوە

**لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لا تقوم الساعة، حتى تخرج نارٌ مــن أرض الحجاز تضيء أعنـــاق الإبــل ببصـــرى: **قیامـەت ڕانابێ، هـەتا ئاگرێك لـەخاكی حیجاز دەكەوێتەوە، كە ملی حوشتران لەشاری بوصرا ڕوناك دەكاتەوە)).**[1]

**جا ئەو نیشانە مەزنە لەساڵی (٦٥٤)ی كۆچی بەهەمان ئەو شێوەیە ڕوی دا كـە پێغەمبەری ڕاستگۆ ﷺ پێشبینی كردبو.**

**ئیبنی كەثیری مێژونوسیش لە روداوەكانی ساڵی (٦٥٤) لەبابەت ئەم ئاگرە دەڵێ:**

**لەو ساڵەدا بو ئەو ئاگرەی حیجاز كەوتـەوە، كـە ملـی حوشـترانی لـە بوصـرا روناك كردەوە، هەروەك لەو فەرمودەیە هاتوە كە بوخاری و موسلیم دەیگێڕنەوە، جا شێخی پێشـەوا شـەهابوددینی ئـەبو شـامەی حافیزی مەقدیسـی لـە كتێبی (الذیل و شـرحه) بەدرێژی باسی كردوەو لە گەلێك كتێبانیشی ئامادە كردەوە، كە هەواڵی موتەواتیریان لە بارەی ئەو ئاگرە لە حیجازەوە بۆ دیمەشق هێنا بو، لەوانەی كە بەچاوان دیتبویـان و، لەبارەی چۆنیەتی بەرپابون و كەوتنەوەی. پوختەی ئەوەی ئەبو شامەش[2] هێناویـە ئەوەیە كە دەڵێ: هـەندێك نوسـراو لەشـاری مەدینـەی پیرۆز بـۆ دیمەشـق هـاتن، كـە**

---

[1] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب خروج النار، فتح الباري: (٧٨/١٣)، ورواه مسلم في صحيحه، كتـــاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز، حديث رقم (٢٩٠٢)(٢٢٢٧/٤).

نەوەوی لە (النووي على مسلم: ١٨/ ٣٠)دا دەڵێ: (بوصرا شارێكی ناسراوە لە شامدا، بریتیە لە شاری حۆران و، سێ قۆناغ لە دیمەشقەوە دورە.) مێژونوسانیش دەڵێن: چۆن پێغەمبـەر ﷺ ڕایگـەیاندبو، ئەمە ڕوی دا و ملـی حوشترانی لەبوصرادا روناك كردەوە. فێرخوازیش لەگەلێك شاری دور لە مەدینە لەبەر تیشك و روناكی ئەو ئاگرە دەیانخوێندەوە.

[2] ئەبو شامە لەگەڵ كەوتنەوەی ئاگرەكەدا هاوچەرخە.

ئـاگرێك لــه ڕۆژی پێنجـەمی جومـادی دوایینــی ئـەم ســاڵ لــەلایان كەوتۆتــەوه و، نامەكانیش لە پێنجی ڕەجەبدا نوسراون، هەتا ئەوكاتەش ئاگرەكە هەروەكو خـۆی بوه، ئەو نوسراو و نامانەش لە دەی شەعبان گەیشتنە لای ئێمە. پاشان دەڵێ: (بسم الله الرحمن الرحیم، لە سەرەتاكانی شەعبانی ساڵــی شـەش سـەد و پەنجا و چـار، هـەندێك نوسـراو لـە مەدینەی شـاری پێغەمبـەری خوداﷺ گەیشتنە دیمەشق، باســی ڕوداوێكـی مـەزنیان دەكـرد، كە ڕاستی ئـەو فـەرمودەی پێغەمبـەرﷺ دەردەخـا، كــه لــه هەردو صەحیحاندا لەئەبو هورەیرەوە هاتوە، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة، حتى تخرج نارٌ من أرض الحجاز تضيء أعناق الإبل ببصـــرى: قیامـەت هەڵناستی تـا ئاگرێك لـەخاكی حیجاز دەكەوێتـەوە، ملـی حوشـتر لە بوصرا ڕونـاك دەكاتــەوە)). یەكێك لەوانی متمانـەم پـێ هەیە و ئاگرەكەیان دیوە، دەڵێ كە وای پێگەیشــتوه لــه (تیماء)دا لەبەر ڕوناهی ئەم ئاگرە كتێبیـان نوسـیوە. دەڵێ: جا لـەو شـەوانەدا لەماڵـه خۆمـان بویـن، دەتگـوت ماڵی هەریەكەمان چرایەكی تێدایـە. لەگـەڵ ئـەوەی ئاگرەكـه هێندە مەزنیش بو، گەرمی و بڵێسەی نـەبو، بەڵكو یـەكێك بو لە نیشـانەكانی خـودای بەرز).

ئـەبو شـامە دەڵــێ: ئەمـەش وێنـەی ئاگرەكەیـە لەمیانـەی نامـە و نوســراوەكاندا هاتون:

(لە شەوی چوارشەم، سێی جومادی دوایین لە ساڵی شەش سەد و پەنجا و چواردا، دەنگێكی زۆر گەورە لە شاری مەدینـە هـات و، پاشـان بومەلەرزەیـەكی گـەورە ڕوی دا كـه خـاك و دیـوار و سـاپیتە و دار و دەرگـەكانی هــەژاند. ئەمـەش سـەعات لــه دوای سـەعات بـو تـا ڕۆژی هـەینی پێنجـەمی هـەمان مـانگ، ئەوجا ئاگرێكی مـەزن لە خاكـه سوتاوەكەی (الحرة) دەركەوت لەنێزیك قورەیظە. ئێمە لەنێو ماڵی خۆمـاندا لـە شـاری مەدینـە ئاگرەكـەمان وا دەدیـت دەتگـوت لـەلای خۆمانـە. ئـاگرێكی زۆر گــەورە بــو، داگیرسانەكەی لە سێ مناران پتر بو. جا ئاگر بە دۆڵەكاندا ڕۆیشـت تا گەیشتە دۆڵـی (شــەظا) كـه ئـاوی لێـوە هـەڵدەقولا، ئاوگـەی (شـەظا)ی داخسـت و چـی دی ئـاوی لێنەچۆڕا. سوێند بە خوا ئێمـە كۆمـەڵێك بویـن وەدەركـەوتین تـا تەماشـای بكـەین،

دیتمان چیا جۆگەلە ئاگری بەستوە، وای لێهات خاکە سوتاوەکەش ڕێی حاجیەکانی عێراقی گرت. جا ئاگرەکە هات تا گەیشتە خاکە سوتاوەکە و، پاش ئەوەی ترسایز بگاتە ئێمەش ڕاوەستا، پاشان بەلای ڕۆژهەلاتدا جۆگەلەی بەستا، جا چیای ئاگرینی لێ وەدەردەکەوت، بەردی هەڵدەلوشی. نمونەی تێدا بو لەوەی خودای بەرز لە قورئانی پیرۆزدا باسی فەرموە: ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ، كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْـــرٌ: بەراستی دۆزەخ پریشکی وەك کۆشك دەهاوێت، بەرو دوا دەڕۆن، دەڵێی کاروانی حوشتری زەردن.﴾[1]

هەروەها ئاگرەکە خاکیشی خوارد، ئەم نوسراوەش لە پێنجەم ڕۆژی ڕەجەبی ساڵی شەش سەد و پەنجا و چواردا نوسراوە، تا ئێستاش ئاگرەکە لە زیاد بوندایە و نەگۆڕاوە، و گەڕاوەتەوە خاکە سوتاوەکەی قورەیظە لە ڕێی کاروانی حاجیانی عێراق لە خاکە سوتاوەکە هەموی ئاگری هەڵایساو بون دەتگوت مەشخەڵی حاجیانن. بەڵام چاوگی سەرەکی ئاگرەکە: کێوی ئاگرینی سور بون، سەرچاوەی هەرەگەورەش ئەوە بو کە ئاگرەکانی لێوە هەڵقولا لەلای قورەیظە، جا هەر زێدە دەبێ و خەڵکیش نازانن پاش ئەمە چی ڕودەات. خودا سەرەنجامی بەخێر بگێڕێ، بەڕاستی ناتوانم وەسفی ئەو ئاگرە بکەم)

ئەبو شامە دەڵێ: (لە نوسراوێکی دیکەشدا هاتوە: لە یەکەم هەینی جومادە دوایین ساڵی شەش صەد و پەنجا و چوار، لە ڕۆژهەلاتی شاری مەدینەی پیرۆزدا ئاگرێکی گەورە کەوتەوە. نیو ڕۆژەڕێ لە مەدینە دور بو. لە زەویدا هەڵقولا و دۆڵێکی هەڵبەستا تا لەگەڵ کێوی ئوحود ڕاستی کردەوە، پاشان ڕاوەستاو گەڕاوە و تا ئێستاش بەردەوامە و، نازانین چی بکەین، کاتێکیش ئاگرەکە کەوتەوە خەڵکی مەدینە چونە لای گۆڕی پێغەمبەرەکەیان ﷺ دەستی ژیوانی و داوای لێخۆشبونیان لە خودای بەرز کردبۆوە. ئەمەش لە نیشانەکانی قیامەتە).

دەڵێ: (لە نوسراوێکی تریشدا هاتوە: لە ڕۆژ دوشەمی سەرەتای جومادی دوایین

---

[1] سورة المرسلات: ٣٢-٣٣

ساڵی شەش صەد و پەنجا و چوار، ناوە ناوە لە مەدینەدا دەنگێکی وەك دەنگی گەواڵە دەهات. ئەم بارە دو ڕۆژی خایاند، جا لە شەوی چوارشەم، سێی مانگی ناوبراو بومەلەرزە بە دوای ئەو دەنگەدا هات کە گوێمان لێدەبو. لە ڕۆژی هەینی، پێنجەمی هەمان مانگ خاکە سوتاوەکە ئاگرێکی گەورەی لێ هەڵقوڵا کە بە قەدەر مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەبو و، لە مەدینەش ڕا بە چاوان دەبینرا، دەماندیت، هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ: پریشکی وەك کۆشك و تەلارانی دەهاویشت، لە شوێنێکدا بو کە پێی دەڵێن ئەجیلەین. دۆڵێك لەبەر ئەو ئاگرەی ڕۆیشت هێندی چوار فەرسەخان بو، چوار میلیش بەرین بو، بەژن و نیوێکیش قوڵ بو، بەسەر ڕوی زەویدا دەڕۆیی و دۆڵ و کێوی بچوکی لێ دەردەکەوت. بە ڕوی زەویدا ڕێی دەکرد و بەرد بو دەتاواوە و شتێکی وەك قوڕقوشمی تواوەی لێ بەجێ دەما، کە دەیبەستا ڕەنگی ڕەش دەبو و پێش بەستانیش ڕەنگی سور بو، جا بەهۆی ئەو ئاگرەی خەڵکێکی زۆر وازی لە گوناحان هێناو بە تاعەتان لە خودا نێزیك بۆوە و، ئەمیری مەدینە گەلێك شوێنی بە زۆر داگیرکراوی بۆ خاوەنەکانیان بەجێ هێشت).

شێخ شەهابوددینی ئەبو شامە دەڵێ: (لە نوسراوی شەمسەدینی کوڕی سینانی کوڕی عەبدولوەهابی کوڕی نەمیلەی حوسەینی کە قازی مەدینە بوە، بۆ یەکێك لە هاوەڵەکانی ناردوە، هاتوە: لە شەوی چارشەم سێی جومادی دوایین، لە دوا سێیەکی شەوێدا بومەلەرزەیەکی مەزن ڕویدا کە لێی ترساین، ئەو شەوە و شەوانی دیکەش هەر بەردەوام بو و، لە شەو و ڕۆژێکدا دە جاران دەلەرزی. سوێند بە خوا جارێك عەرد لەرزی ئێمە لە دەوری ژوری پێغەمبەر ﷺ بوین، مینبەرەکەی لەگەڵ هەژا بەشێوەیەك لێی ترساین چونکە گوێمان لە دەنگی ئەو ئاسنە بو کە تێیدایە. چراکانی حەرەمی پیرۆزیش هاتنە هەژانێ. ئەوجا چێشتانی ڕۆژی هەینی بومەلەرزە تەواو بو، دەنگێکی وەکو دەنگی گەواڵەی شریخەداری لێوە دەهات، ئەوجا لە ڕۆژی هەینی، لە ڕێی (الحرة)دا لە سەری ئەجیلەیندا ئاگرێکی گەورەی بەقەد شارێکی گەورە پەیدابو، تا شەوی شەموی لە ئێمە دەرنەکەوت. ئێمە زۆری لێ ترساین و، من چومە لای ئەمیر و پێمگوت: ئەشکەنجە دەوری داوین، بۆ لای خودا بگەڕێوە و ژیوان بەوە. جا هەمو

کۆیلەکانی خۆی ئازاد کرد و، ماڵی کۆمەڵێکی بۆ گێڕانەوە، کە ئەم کارانەی ئەنجام دا، گوتم با پێکەوە دەمێك بچینە لای پێغەمبەرﷺ، جا لەگەڵمان دابەزی و، ئەو شەوی شەموە سەرجەم خەڵکی و ژن و منداڵ، کەس نە لەنێو دارخورمایاندا ماوە نە لەنێو شاری. هەموی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، پاشان ڕوبارێکی ئاگرین لەبەر ئاگرەکە ڕۆیشت و، بە دۆڵی ئەجیلەیندا چو و ڕێگەی گرت، ئەوجا گەیشتە دەریای حاجیان و دەریا ئاگرێك بو دەڕۆیشت، پۆلیە و ژیلەمۆی بەسەرەوە بو، تاکو ڕێگەیی دۆڵی (شەظا)ی گرت و چیدی یەك دڵۆپە ئاو بە دۆڵەکەدا نەهات چونکە ئاگر بەبەرزی دو بەژن و سێیەکی گەمارۆی دابو.

سوێند بەخودا برایەکەم، ژینی ئەمڕۆمان تەنگە و، هەمو خەڵکی مەدینەش تۆبەیان کردوە، کەس تێیدا گوێی لە دەنگی ڕەبابە و دەف و خواردنەوە نابێ. ئاگریش هەر دەڕوا و جۆگەلەی بەستوە تا هەندێك ڕێگەی حاجیان و هەندێك دەریاچەی حاجیانیشی گرتوە. بە دوڵێدا کەمێکی بۆ لای ئێمە هات، ترساین بۆ لامان بێت. جا خەڵکی گردبونەوە و چونە ژوری پێغەمبەرﷺ لە شەوی هەینی هەمو لەلای وی تۆبەیان کرد، هەرچی ئەو جۆگەلە و دۆڵەش بو کە لە پاش ئێمەی جێهێشتبو، بە توانای خودا کوژایەوە. تاکو ئێستاش هیچی لێ کەم نەبۆتەوە و، هەر بەردی وەك حوشتران دەبینین، کە لرمە و دەنگی هەیە، نە دێڵێ بنوین، نەبخۆین، نەبخۆینەوە، منیش نەدەتوانم بۆتی وەسف بکەم، نەبۆم دەکرێ باسی ناخۆشی و پەرژەنگەکانی بکەم.

خەڵکی (یەنبوع) دیتیان و ئیبنی سەعدی قازی خۆیانیان نارد، هات و تێی ڕوانی، بەڵام نەیتوانی مەزنی و گەورەیی ئاگرەکە وەسف بکات.

لە ڕۆژی پێنجەمی ڕەجەبدا نوسراوە، ئاگرەکەش هەر وەکو خۆیەتی و، خەڵکیش لێی دەترسێن. لەو ڕۆژی ئاگرەکەش هەڵبوە مانگ و ڕۆژ هەر بەگیراوی و بزری هەڵدێن. جا خودا سەلامەتمان کا.)

ئەبو شامە دەڵێ: شون و کاریگەری ئەو ڕۆژگیران و مانگ گیرانە لەلای ئێمەش

لەدیمەشق دەرکەوت، بەهۆی لاوازی روناهیەکەی لەسەر دیواران، ئێمەش لەوە سەرسام بوین و نەماندەزانی چیە؟ تاکو هەواڵی ئەو ئاگرەمان پێگەیشت.

گوتم: ئەبو شامە پێش هاتنی نوسراوەکانیش لەبارەی مێژوی ئەو ئاگرە نوسیو یە و دەڵێ: ئەوجا لەشەوی دوشەم، شازدەی جومادی دوایین، لەسەرەتای شەوێدا مانگ گیرا، زۆر سورهەڵگەڕا و دوایی بەریدا. خۆریش گیرا و لەسبەینەکەی لەکاتی هەڵاتن و ئاوابونێدا سور هەڵگەڕا، چەند رۆژێك بە رەنگێکی گۆڕاو و روناکیەکی کز مایەوە. خوداش بەسەر هەمو شتێکدا توانایە، پاشان دەڵێ: بەمەش ئەوە رون بۆوە کە شافیعی باسی کردبو لە کۆبونەوەی رۆژگیران و چەژنەدا و، ئەستێرەگەرەکانیش رەتیان کردبۆوە.

پاشان ئەبو شامە گوتی: ( لە نوسراوێکی دیکەی یەکێك لە بەرەی بەنی‌لفاشانی لە مەدینەدا هاتوە، تێیدا دەڵێ: لە جومادی دواییندا هەندێك نەجیبزادەی عێراق هاتن و هەواڵی بەغدایان پێدابن، کە توشی نقوم بونێکی مەزن هاتوە، تا ئاو بەسەر شورەکانی بەغدادا بۆ ناو شار پەڕیوەتەوە و، زۆری لێ نقوم بوە و، ئاو گەیشتۆتە خانەی خەلیفە لە ناوەڕاستی شاردا و، خانەی شالیار و سێصەد و هەشتا خانوی دیکە ڕوخان و، کۆگەی خەلیفەش ڕوخاوە و، شتێکی زۆریش لە ئەمباری چەکەکاندا فەوتاوە و، خەڵکیش هێندەی نەماوە تەفرو تونابن و. بەلەم و کەشتیش دەگەنە ناو شار و، بەکۆڵانەکانی بەغدادا ڕەت دەبن.

دەڵێ: بەڵام ئێمە، بەسەرهاتیەکی مەزنمان لەلا ڕویدا؛ لەشەوی چارشەم، سێی جومادی دوایین و دو رۆژیش پێشتر، خەڵکی گوێیان لە دەنگێکی وەکو گەواڵەی بو، هەمو لەو دەنگەی بێزار بون و، لەخەوێ هەستان و، هەمو خەڵك داوای لێخۆشبونیان لە خودای بەرز کرد و، بە پەشێوی چونە مزگەفتێ و نوێژیان تێدا کرد، جا سەعات لەدوای سەعات ئەو خەڵکەی ڕادەچڵەکاند تا سبەینێ، بەدرێژایی ئەو رۆژەش کە چوارشەم بو لەگەڵ هەمو شەوی پێنجشەم و شەوی هەینیدا، سبەینەی هەینیش زەوی بە توندی ڕاهەژا، تا منارەی مزگەفتێ تێکداشڵەژا و ساپیتەی مزگەفتیش

سیرەیەکی گەورەی لێوە هات و، خەڵکی هەمو لە گوناهەکانی خۆیان ترسان، ئەوجا بومەلەرزەکە پاش سبەینەی رۆژی هەینی تا پێش نیوەڕۆیێ ئارام بو.

پاشان لە حەرە(خاکە سوتاوەکە)ی پشت قورەیظە و لەسەر رێی (سوارقی)یەکان لە دوری دانەڕۆژەك، ئاگرێکی گەورە دەرکەوت لەزەویەوە دەتەقیەوە، خەڵکی زۆر لێی ترسان. پاشان دوکەڵێکی مەزنی لێ هەستا، لە ئاسمانێ گرد دەبۆوە تا وەکو هەوری سپی لێهات، بەشێوەیەك تاکو پێش رۆژاوابونی هەینی خایاند، پاشان مەشخەڵ و بڵێسەی سوری بە حەوایدا بۆ ئاسمانێ هەڵکشا دەتگوت قەڵاتە، خەڵکی تەواو پەشۆکان و بەرەو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و حوجرەی پیرۆزی رایان کرد، خەڵکی لەوێ خۆیان پەناداو دەوری ژورەکەیان داو، سەری خۆیان روت کردو، دانیان بە گوناهەکانیاندا نا و، لەخودای بەرز پاڕانەوە و، چونە پاڵ پێغەمبەرەکەی ﷺ، خەڵکی لە هەمو کوچە و کۆڵان و لە هەمو رەزو باخێکدا هاتنە مزگەوتێ، ژن و منداڵ لە ماڵان وەدەرکەوتن، هەمو کۆبونەوە و دڵیان لەگەڵ خودا ڕاست کرد. سوری ئاگریش هەمو ئاسمانی داپۆشیبو، تا روناکی ئەو رۆژە وەکو تریفەی مانگی لێهاتبو، ئاسمانیش وەك زەروی لێهاتبو. خەڵکیش تەواو ئاوەر(یقین)یان هێنا کە تونا دەبن یا ئەشکەنجە دەدرێن. تا سبەینێ ئەو خەڵکە بە نوێژ کردن و قورئان خوێندن و کڕنۆش و سوژدە بردن و لەخودا پاڕانەوە خەریك بون و، گوناهی خۆیان دەردەخست و ژیوان دەبونەوە و داوای لێخۆشبونیان دەکرد، جا ئاگرەکە لە شوێنی خۆی وەستا و چەند هێندبونەوە و بڵێسەی لەکەمی دا.

جا زانا و قازی چونە لای ئەمیر تا پەندی بدەن، ئەویش پارە و ماڵی باج ستاندنی هەڵرێشت و تێکڕای کۆیلەکانی خۆی ئازاد کرد و، هەمو ئەو ماڵەی کە زەوتی کردبو گێڕایەوە. ئەو ئاگرەش هەر بە هەڵایساوی مایەوە و، بەقەد کێوێك بڵند بو، هێندی شارێك بەرین بو، بەردی لێوە دەردەپەڕی بۆ ئاسمان و لەوێڕا بەردەبونەوە و ئاگری هێندەی چیایەکی لێ دەردەچو و هەروەك گەواڵە دەیهاویشت. چەند رۆژێك وامایەوە و پاشان جۆگەلەی بەستا بەرەو دۆڵی ئەجیلەین و لەگەڵ دۆڵەکە تا (شەظا) داکشا، تا جۆگەلەکەی گەیشتە دەریاچەی حاجیان، بەردیش لەگەڵی دەجما و دەڕۆیی تا

**هێندەی نەمابو بگاتە حەڕەی بەرین، پاشان داسەکنا و بۆ چەند ڕۆژێك وەستا، ئەوجا دەستی کردەوە بە بەرد هەڵدان بۆ بەردەم و بۆ پشتەوەی، تاکو دو کێوی بنیات نا و، ئەوی ماوە لەنێوان هەردو کێواندا زمانە و مەشخەڵی هەبو. ئەوجا تا ئێستاش بڵێسەی مەزنتر دەبێ و، بە گەورەترین شێوە دەئایسێ. هەمو شەوێکیش لەدوا دوای شەوێدا تا چێشەنگاو دەنگێکی مەزنی لێ دەبیسترێت. جا سەمەرەی وای هەن ناتوانم بە تەواوی بۆت ڕاڤە بکەم. بەڵکو ئەمە هەر بەشێکە و هێندەی بەسە کە تا ئێستا مانگ و ڕۆژ دەڵێی گیراون. ئەم نوسراوەش پاش تێپەڕبونی مانگێك نوسراوە. ئاگرەکەش نە بەرەو پێش دەچێت نە بەرەو دوا).**

**یەکێکیش ئەو خشتەکانەی دەربارە گوتوە:**[1]

یا كاشف الضر صفحاً عــن جرائمنــا        لقــد أحــاطت بنــا يــا ربُ بأســــاء
نشــكو اليــك خطوبــاً لا نطيــق لهــا        حمــلاً ونحــن بهــــا حقــــا أحقــــاء
زلازل تخشــع الصُــم الصــلابُ لهــــا        وكيــف يقــوى علــى الزلــزال شمــاءُ
أقــام ســبعاً يــرج الأرض فــأنصدعت        عن منظر من عـــين الشــمس عشــواءُ
بحــر مــن النــار تجــري فوقــه ســفنُ        مــن الهضــاب لهــا في الأرض أرســاءُ
كأنمــا فوقــــه الأجبــــال طافيــــة        مــوج عليــه لفــرط البــهج وعثــاءُ
ترمــي لهــا شــرراً كــالقصر طائشــة        كأنهــــا ديمــــةٌ تنصــــب هطــــلاءُ
تنشقُ منها قلــوب الصخــر إن زفــرت        رعباً وترعــــد مثــل الســعف أضــواءُ
منــها تكــاثف في الجــو الدخــــان الى        أن عــادت الشــمس وهــي دهمــــاءُ
قد أثـــرت ســفعةٌ في البــدر لفحتــها        فليلــة التــم بعــد النـــور ليــــلاءُ
تحــدث النــيران الســــبع ألســـنها        بمــا يلاقــي بهــا تحــت الــثرى المــاءُ
وقــد أحــاط لظاهــــا بالـــبروج الى        أن كــاد يلحقــها بــالأرض إهــــواءُ
فيــا لهــا آيــةٌ مــن معجــزات رســو        ل الله يعقلــــها القــــوم الألبــــاءُ
فبإسمك الأعظـــم المكنـــون إن عظمــتْ        منــا الذنــوب وســاء القلــب أســواءُ

---

[1] وەرگێڕانی ئەم شیعرانەمان بەپێویست نەزانی، چونکە ئاشکرایە ئەوی لەناوەڕۆکەکەیدا هاتوە پێشتر چەندین جار دوبارە بۆتەوەو وەرگێڕدراوە. بەڵام وەك ئەسپاردە بەپێویستمان زانی تۆماری بکەین. (ژیوان)

فأسمح وهب وتفضل وامح واعف وجـــد ... واصفح فكـــل لفــرط الجـــهل خطــاءُ

فقوم يونس لـــا آمنــوا كشــف الـــ ... ــعذاب عنـــهم وعـــمَّ القــوم نعمــاءُ

ونحـــن أمـــة هـــذا المصطفـــى ولـــــا ... منـــه الى عفـــوك المرجـــو دعـــاءُ

هذا الرسول الذي لـــولاهُ مــا ســلكت ... محجـــةٌ في ســـبيل الله بيضـــــاءُ

فأرحم وصلِّ على المختــار مــا خطبــت ... علـــى عـــلا منـــبر الأوراق ورقـــاءُ

دەڵێم: ئەو فەرمودەیەی لەبابەت ئەم ئاگرە هاتوە، لە هەردو صەحیحان تەخریج کراوە، لە ڕێگەی زوهەری لە سەعیدی کوڕی موسەییەب، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة، حتى تخرج نارٌ من أرض الحجاز تضيء أعناق الإبـــل ببصرى: قیامەت ڕانابێ هەتا ئاگرێك لە خاکی حیجازدا دەکەوێتەوە، گەردنی حوشتران لە بوصرا روناك دەکاتەوە)). ئەمەش بێژەکەی بوخاریە.

جا ئەم روداوە لەو ساڵەدا -٦٥٤- رویدا، صەدرەدین عەلی کوڕی ئەبولقاسمی تەمیمی حەنەفی کە قازی قازیان بو و حوکمڕانی دیمەشقیش بو، لە یاداوەری هەندێك ڕۆژاندا، لە پاش باسی کەوتنەوەی ئەو ئاگرە لەو ساڵی، پێی گوتم: گوێم لە پیاوێکی دەشتەکی بو باسی بوصرای لە ئەوان شەوان بۆ بابم دەکرد کە ملی حوشترانیان بەڕوناکی ئەو ئاگرەی دیت کە لەخاکی حیجاز کەوتبۆوە.

دەڵێم: لە دایك بوی ساڵی ٦٤٢ بو، باوکیشی مامۆستای حەنەفیان بو لە بوصرا، باپیریشی هەروا بو، ئەمیش هەر لە بوصرایەی خوێندوە پاشان گوازتیەوە دیمەشق و لە (الصادریة) و (المعدیة)ی خوێند، پاشان بوە قازی قازیەکانی حەنەفیان، لە ئەحکامدا سەربوردەی باشی هەن. کاتێك ئەو ئاگرە لە حیجازدا کەوتەوە، ئەم دوازدە ساڵان بو، هاوکوفی ویش ئەو هەواڵانە وەردەگرن کە گوێیان لێدەبێ و لەیادیان دەمێنێ: کە دەشتەکیەکە لەوان شەواندا بە باوکی گوتوە. درود و سڵاوی خوداش پێشکەش بە موحەممەدی پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ خانەوادەو یارانی.

له هەڵبەستی شاعیرانیش لەبابەت نقوم بونی بەغدا و ئاگری حیجاز ئەوەیە کە دەڵێ:

سبحان من أصبحت مشيئته جارية في الورى بمقدار
أغرق بغداد بالمياه كما أحرق أرض الحجاز بالنار

واتە: پاکی بۆ ئەو خودایەی کە ویستی وی بە پێوانە و خەمڵاندنی ورد لە هەمو بونەوەردا دەگەڕێ، بەغدای لە ئاوێدا نقوم کرد و خاکی حیجازیشی بە ئاگر سوتاند.

ئەبو شامە دەڵێ: راستتر بو بڵێ:

في سنةٍ أغرق العراق وقد أحرق أرض الحجاز بالنار

واتە: لە ساڵێکدا عێراقی نقوم کرد و، خاکی حیجازیشی بە ئاگر سوتاند.

ئیبنیساعی لە مێژوی ساڵی ٦٥٤دا دەڵێ: لە رۆژی هەینی، هەژدەی رەجەب – ئەو ساڵە–، لەلای وەزیر دانیشتبوم، کە نوسراوێکی لە مەدینەی پیرۆزەوە بۆ هات، بەدەستی پەیکێك(قاصد) کە ناوی قەیمازی عەلەوی حەسەنی مەدەنی بو، نوسراوەکەی دا دەستی، کە خوێندیەوە ئەوەی تێدا هاتبو کە لە رۆژی سێشەم، دوی جومادی دوایین، مەدینەی پیرۆز وا لەرزیوە کە گۆڕی پاکی پێغەمبەرﷺی لەگەڵ هەژاوە و، چیرەی ئاسنی بیستراوە و، زنجیرەکان جولاون، ئاگرێك لە دوری چوار فەرسەخ لە مەدینە، کەوتۆتەوە و، کەف و کوڵی وەك لوتکە شاخانی هەڵداوە و، پازدە رۆژی خایاندوە.

پەیك(قاصد)ەکە گوتی: کە هاتم هێشتا نەبڕابۆوە، بەڵکو هەروەکو خۆی بو. وەزیر لێی پرسی: بەرەو کێهان لای هەڵدەدا؟ گوتی: بە ئاڕاستەی رۆژهەڵات بو، منیش لەگەڵ چەند یەمەنیەك لێی تێپەڕیم، لقە دارخورمایەکمان هەڵدا ناو ئاگرەکە بەڵام نەیسوتاند، بەڵکو بەردی دەسوتاند و دەیتاواندەوە. ئەوجا قەیماز بەردێکی سوتاوی دەرهێنا، لە ڕوی ڕەنگ و سەنگەوە بە ڕەژو دەچو.

دەڵێ: هەروەها لە نوسراوەکەدا هاتوە کە بەختەی قازی مەدینە بو: کاتێك بومەلەزەکە رویدا ئەوان چونەتە ناو حەرەم و سەریام کۆت کردوە و داوای

لێخۆشبونیان کردوه و، ئەمیری مەدینەش هەمو کۆیلەکانی خۆی ئازاد کردوەو خۆی ئەو ماڵانەی دەرهاوردوە کە بەزۆر ئەستێنراون، هەر بەداوای لێخۆشبونێ خەریك بون هەتا بومەلەرزەکە داسەکناوە، بەڵام ئەو ئاگرەی کەوتۆتەوە، کە پەیکی ناوبراو لەوێوە بەرێ کەوتوە ئاگرەکە پازدە رۆژی خایاندوەو تا ئێستاش هەر بڵێسە دەداو نەبڕاوەتەوە.

ئیبنیساعی دەڵێ: بەدەسخەتی مەحمودی کوڕی یوسفی ئەمعانی کە شێخی حەرەمی مەدینەی پیرۆز بوە، خوێندمەوە، دەڵێ: ئەو ئاگرەی لە حیجاز کەوتەوە نیشانەیەکی مەزن بو و، ئاماژەیەکی ڕاست و ڕەوانیش بو کە قیامەت نێزیك بۆتەوە، جا شاد و ئاسودە ئەو کەسەیە کە لەپێش مردن دەرفەتان دەقۆزتەوەو، بەخۆی ڕادەگا و لە باری نێوان خۆی و خودا چا دەکات. کەوتنەوەی ئەم ئاگرەش لە وڵاتێکی چەقێنی بێ داروبار، کە ئەگەر هیچی دەست نەکەوتبا هەڵی لوشێ خۆی دەخواردەوە، بەردی دەسوتاند و دەیتاواندەوە، تا وەکو قوڕی تەڕی لێدەکرد، ئەوجا بەبای دەدا وەکو خۆڵەمێشی ئاسن کە لە کورەی دەردەچێ، خودا دەیکاتە پەند بۆ موسڵمانان ومیهر و بەزەیی بۆ جیهانیان، بە موحەممەد و خانەوادە بێگەردەکەی. باسەکەی ئیبنی کەثیر تەواو.[1]

لەو زانا گەورە و پایەدارانەش کە لەکاتی کەوتنەوەی ئەم ئاگرە زیندوبون، نەوەوی پێشەوا بوە (بەر میهر و بەزەیی خودا کەوێت)، لە ڕاڤەکەشی بۆ صەحیحی موسلیم باسی کردوە و دەڵێ:

(لەسەردەمی ئێمەدا، لە ساڵی شەش صەد و پەنجا و چاردا، ئاگرێك لە مەدینە کەوتەوە، ئاگرێکی زۆر مەزن بو و دەکەوتە لای ڕۆژهەڵاتی مەدینە، لە پشت خاکە سوتاوەکە(الحرة)دا، ئاگایی لە کەوتنەوەی ئەو ئاگرە لەلای هەمو شامیان و خەڵکی وڵاتانی دیکە موتەواتیرە و، کەسانێکی خەڵکی مەدینە باسیان بۆ کردوم کە لەکاتی ئاگرەکەدا لەوێ بون)[2]. لەوەسفی ئەوان کەسان ڕا دیارە کە ئاگرەکەیان دیوە، ئەو

---

[1] البداية و النهاية: (١٣/١٨٧-١٩٢)

[2] شرح النووي على مسلم: (١٨\٢٨)

ئاگره گڕکانێکی زۆر گەوره بوه، گەلێك بومەلەرزەی مەزنی لەگەڵدا بوه، بەم شێوەیەش کەوتۆتەوه کە پێغەمبەری ڕاست و ڕاستگۆ درودو سڵاوی خوای پێشکەش بێ باسی فەرموه.

## جێباسی چوارەم

## نەمانی سەرانە و زەویانە

ئەو سەرانەیەی لە گاور و جولەکەکانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی دەستێنران لەگەڵ ئەو زەویانەی ئەوان کەسان دەیاندا کە ئەو زەویانەیان وەبەردێنا کە دەوڵەتی ئیسلامی فەتحی کردبون، لە گرنگترین سەرچاوەکانی بەیتولمالی موسڵمانان بون، پێغەمبەرﷺیش هەواڵی داینێ کە ئەوە رادەوەستێت و نامێنێ، لەبەر ئەوە موسڵمانان داهاتێکی زۆر گرنگیان لە دەست دەچێت.

لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئەبو هورەیرەﷺ هاتوه، دەڵێ: پێغەمبەری خوایﷺ فەرموی: ((منعت العراق درهمها وقفيزها، ومنعت الشام مدها ودينارها، ومنعت مصر إردبها ودينارها، وعدتم من حيث بدأتم، وعدتم من حيث بدأتم: عێراق درهەم و قەفیزی ناداو رایدەگرێ و، شام مود و دیناری ناداو رایدەگرێ و، میصر ئەردەب و دیناری ناداو رایدەگرێ. ئێوەش لە کوێوە هاتون بۆ ئەوێ دەگەڕێنەوە)) گۆشت و خوێنی ئەبوهورەیرە شایەدی لەسەر ئەوە دەدا.[1]

قەفیز و مود و ئەردەبیش پێوانەی ئەو کاتن لەو وڵاتانەدا، تاکو ئێستاش هەندێکیان بەکاردێن. درهەم و دیناریش ناوی دراوی نا سراوی ئەو سەردەمەن، هۆی ئەو راگرتنەش ئەوەیە کە بێبڕوایان لە هەندێك کاتدا ئەو وڵاتانە داگیر دەکەن،

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، (٤/٢٢٢٠) ورقم الحديث (٢٨٩٦).

هـەروەك رۆم و دواتریـش تەتـەر گـەلێك وڵاتـی موسـڵمانانیان داگـیر كـردوە، لـەم سەردەمەی خۆشماندا كافرەكان وڵاتی ئیسلامیان داگیر كردوەو دەوڵەتی خەلیفایەتی ئیسلامیان لابردوە و، شەرعی خودایان لە حوكم وەدور خستۆتەوە.

نـەوەوی لـە ڕاڤـەی ئـەم فەرمودەیـەدا دەڵـێ: (دیـارترین روی ماناكـەی ئەوەیـە كـە عەجەم و رۆم لە ئاخیر زەماندا دەست بەسەر وڵاتەكاندا دەگرن و، رێی دەستكەوتنی ئەوانە لە موسڵمانان دەگرن. موسلیم دوای چەند لاپەڕەیـەك لـە جابیرەوە دەگێڕتـەوە، دەڵێ: ((يوشك أن لا يجيء إليهم قفيز ولا درهم، قلنا: من أين ذلك؟ قال: من قبـــل العجـــم، يمنعـون ذاك: هێنـدەی نـەماوە نەقەفیزێك و نەدرهـەمێكیان بـۆ نـەیێ، گوتمـان: ئـەوە لەكوێوە؟ گوتی: لە لایەن عەجەمانەوە، ئەمانە چیدیكە نایدەن و قەدەغەی دەكەن)).

لەبابەت ڕاگرتنی ئەو شتانەش لەلایەن ڕومیانەوە لە شام هـەر وای گـوت. ئەمـەش لـە سـەردەمی ئێمـەدا لـە عێراق دیترا و ڕویدا و، ئێستاش هەیـە، دەشـڵێن لـە ئاخـیر زەمـاندا هەڵدەگەڕێنـەوە و، زەكـات و خێرەكانیـان نابەخشـن، دەشـڵێن رەنگـە ئـەو كافرانـەی سـەرانەیان لەسـەرە دەسـەڵاتیان زۆر بـێ و، چـی دیكـە سـەرانە و زەویانـە نەدەن و، شتی تریش)[1].

ئـەم هـەمو پاسـاوانەش بـوەهـۆی ڕاگرتـن و نـەمانی ئـەو داهاتانـە لـە خەزێنـەی دەوڵـەتی ئیسـلامی، كـە نـەوەوی باسـی كـردون هـەمویان ڕویـان داوە و هاتونـەدی، سەرەڕای دارمانی دەوڵەتی ئیسـلامی، كە ئابوری خۆی لەسـەر شـەریعەتی ئیسـلامی بنیات دەنا. جا گازاندە و سكاڵامان هەر بۆ لای خودایە.

---

[1] شرح النووي على مسلم: (١٨/٢٠)

## بەندی سێیەم

# ئەو نیشانانەی ڕویان داوە و بەردەوامن یان ڕو دەدەن

## جیٚباسی یەکەم

### ڕزگارکردنی وڵاتان و جەنگەکان

خودای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڕێنمایی و دینی هەق ڕەوان کردوە، تا بەسەر هەمو دینانی دیکەی سەرخا و، هەڵگرانی ئەم ئاینە پیرۆزەش بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا کشاون و وڵاتانیان ڕزگار کردوە و ئیسلامیان تێدا بڵاو کردونەوە، بەسەر وڵاتە زلهێزەکانی ئەو کاتیدا زاڵ بون و سەرکەوتن و، لەناویان بردون و بە درێژایی مێژو هەر ئەمە داب و نەریتی موسڵمانان بوەو، تاکو هاتنی دەجال و بەرانگژبونەوەی لەلایەن دواییینی ئەم ئوممەتە، هەر بەردەوام دەبێت.

پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی دەدا هاوەڵان کە خودا چ سەرکەوتن و زاڵبونێک بەوان یان بە نەوەکانی دوای ئەوان دەبەخشێت. لەکاتێکدا کە موسڵمانان لەمەککەدا لاواز و بێهێز بون، پێغەمبەرﷺ ئەو موژدانەی پێدەدان. یا لەو کاتانەی لە مەدینەدا گەمارۆ درابون و هەمو دەمێ ترسی بەسەرردادانی دوژمنانیان هەبو.

بوخاری لە خەبابی کوری ئەرەت دەگێڕتەوە: (پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری کەعبەدا پاڵی بە عەبایەکی خۆی دابو، ئێمەش سکاڵامان لەلای کرد و گوتمان: ئەدی داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی و، بۆمان لەخودا ناپاڕێیەوە؟ فەرموی:

((كان الرجل فيمن قبلكم يحفر له في الأرض فيجعل فيه، فيجاء بالمنشار فيوضع على رأسه فيشق بإثنتين، وما يصده ذلك عن دينه، ويمشط بأمشاط الحديد ما دون لحمه من عظم أو عصب، وما يصده ذلك عن دينه، والله ليتمن الله هذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضرموت لا يخاف إلا الله أو الذئب على غنمه، ولكنكم تستعجلون: پیاوانی پێش ئێوه، قۆرتێکیان له زەویدا بۆ هەڵدەکەند و دەیانخستە ناوی، جا مشارێکیان دەهێنا و، لەسەر سەریان دادەناو دەیانکردە دو لەت، هێشتا لە دینەکەی پاشگەز نەدەبۆوه و، بە شانەی ئاسنین دادەهێنرا تا هەمو گۆشت و دەماری لە هێسکان جودا دەبۆوه، هێشتا لە ئاینەکەی پاشگەز نەدەبۆوه. سوێند بە خودا، خودا ئەم ئاینە سەردەخات هەتا سوار لە صەنعاوە دێتە حەضرەمەوت و لە کەس ناترسێ، بێجگە لە خودای گەورە و، لە گورگیش بۆ مەڕەکانی. بەڵام ئێوە پەلە دەکەن))[1].

ئاسایش و ئارامی لە دورگەی عەرەبی باری کردبو، پاسای باو پاسای دارستان(جەنگەڵ) بو، گەلێك فەرمودەش هەن باس لە بەرقەراربونی ئاسایش دەکەن لە دورگەکەدا، بەهۆی هاتن و دەرکەوتنی ئیسلام. هەروەك پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندوە کە ئیسلام سنوری دورگەی عەرەبیش دەپەڕێنی و، وڵاتە زلهێزەکانی ئەو کاتی دەخاتە بەر لێشاو، وەکو موڵکی کیسرا وقەیسەر، لە صەحیحی موسلیمدا، لە نافیعی کوڕی عوتبە هاتوە: کە لە پێغەمبەرﷺی بیستوە، فەرموی:

((تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله، ثمّ فارس فيفتحها الله، ثمّ تغزون الروم فيفتحها الله، ثمّ تغزون الدجال فيفتحه الله: غەزای دورگەی عەرەبی دەکەن و خودای گەورە رزگاری دەکات، پاشان دەچنە سەر فارس و خودای مەزن ئازادی دەکات، ئەوجا هێرش دەبەنە سەر رۆم و خودا رزگاری دەکات، پاشان دەچنە سەر دەجال و خودا ژێری دەخات و ئێوە زاڵ دەکات))[2].

بوخاریش لە عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕتەوە، کە دەڵێ: (من لەلای پێغەمبەر ﷺ

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب المناقب، حديث رقم: (٣٦١٢) فتح الباري: (٦/٦١٩).

[2] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب ما يكون من فتوحات المسلمين قبل الدجال، (٤/٢٢٢٥)، حديث رقم (٢٩٠٠).

بوم، پیاوێك هاته لای و گازاندەی دەسكورتی خۆی لەلا كرد، یەكێكی دیكەش هاتە لای و گازاندەی لە ڕێگران كرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یا عدي، هل رأیـــت الحـــیرة؟: ئەرێ عەدی، تۆ حیرەت دیوە؟)) گوتم: نەخێر نەم دیوە، بەڵام باسیان بۆ كردوم. فەرمووی: ((فان طالت بك حیاة، لترین الظعینة ترتحل من الحیرة حتى تطوف بالكعبة لاتخـــاف الا الله: ئەگەر تەمەنت درێژ بێ، دەبینی ئافرەتی نێو كەژاوە لە حیرەوە سەفەر دەكەن تا دەگەنە كەعبە و بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، بێجگە لە خوا لە كەسی دیكە ناترسێن)). لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەدی ئەوكاتی بەدڕەوشتانی طەی لەكوێن، كەپەشێویان خستۆتە ئەوناوە؟ ئەوجا فەرمووی: ((لئن طالت بك حیاة لتفتحن كنوز كســـرى: هەروەها ئەگەر ژیان مەودات پێ بدات گەنجینەی كیسرا وەدەست دێنن))، گوتم: كیسرای كوڕی هورموز! فەرمووی: ((كنوز كســـرى بـــن هرمـــز: گەنجینەكانی كیسرای كوڕی هورموز))، ((ولئن طالت بك حیاة لترین الرجل یخرج ملء كفّه من ذهب او فضة یطلب مـــن یقبله منه فلا یجد احداً یقبله منه، ولیلقین الله احدكم یوم یلقاه، ولیس بینه وبینه ترجمان یترجم لـه، فیقولن: ألم أبعث إلیك رسولاً فیلغك؟ فیقول: بلى، فیقول: ألم أعطك مـــالاً وأفضـــل علیـــك؟ فیقول: بلى، فینظر عن یمینه فلا یرى الاّ جهنم، وینظر عـــــن یســـاره فـــلا یـــرى الاّ جـــهنم: ئەگەر تەمەنت درێژ بێت دەبینی پیاو پڕ بە چنگی زێڕ یان زیو دەردەهێنی و داوا دەكات یەكێك لێی وەرگرێ؟ كەس لێی قبوڵ ناكات. هەر یەكێكیشتان لە ڕۆژی قیامەتدا خودای دەبینێ و، هیچ پاچڤان(ترجمان)ێك لەنێوان وی و خوادا نیە پاچڤە(ترجمة)ی بۆ بكات. ئەوجا خودای بەرز دەفەرموێ: ئەدی پێغەمبەرم بۆ نەناردی تا پەیامت پێ ڕابگەیەنێ؟ دەڵێ: بەڵێ. دەفەرموێ: ئەدی ماڵ و بەهرەم پێ نەبەخشیت؟ دەڵێ: بەڵێ. جا تەماشای لای ڕاستی دەكات هەر دۆزەخ دەبینێ و سەیری لای چەپەشی دەكات هەر دۆزەخ دەبینی)). عەدی دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیست، دەیفەرمو: ((إتقوا النار ولو بشق تمرة، فمن لم یجد شق تمرة فكلمـــة طیبـــة: بەكەرتە خورمایەكیش بێ خۆتان لە ئاگر بپارێزن، ئەوی كەرتە خورماكەشی نەبو بە وشەیەكی باش و شیرین)). عەدی دەڵێ: جا كەژاوەم دیت لە حیرەوە دەهات تا دەگەیشتە كەعبە و تەوافی دەكرد، لەخوا بترازێت لەكەس نەدەترسا و، لەوانەش بوم

گەنجینەی کیسرای کوڕی هورموزمان دەکردەوە، ئەگەر ئێوەش تەمەنتان درێژ بێت ئەوەش دەبینن کە پێغەمبەر ﷺ باسی فەرمو کە پیاو پڕ چنگی زێڕ و زیو دەردێنێ...).[1]

لە فەرمودەیەکی تریش پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندوە کەموسڵمانان موڵکی کیسرا و قەیسەر لەنێو دەبەن و، گەنجینەکان لە پێناو خودا دەبەخشن، لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئەبو هورەیرەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إذا هلك كسرى فلا كسرى بعده، وإذا هلك قيصر فلا قيصر بعده، والذي نفس محمد بيده لتنفقن كنوزهما في سبيل الله: ئەگەر کیسرا لەناوچو، چ کیسرای دیکەی لەپاش نایێ. ئەگەر قەیسەریش لەناوچو، چ قەیسەری دیکەی لەدوا نایێ، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئێوە گەنجینەکانی ئەوان لەپێناو خوادا دەبەخشن)).[2]

لە صەحیحی موسلیمدا، لە ثەوبان هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن الله زوى لي الأرض، فرأيت مشارقها ومغاربها، وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوى لي منها، وأعطيت الكنزين الأحمر والأبيض: خودا زەوی بۆ وێك هێنامەوە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکانم دیت. موڵکی ئوممەتی منیش هەمو ئەوان شوێنان دەگرێتەوە کە من دیتم، هەردو گەنجینەی سورو سپیشم پێ بەخشراوە)).[3] جا پێغەمبەر ﷺ چۆنی فەرمو، وا ڕویدا. موڵکی ئەم ئوممەتە گەیشتە ئەو ڕادەیە و، زۆرینەی درێژ بونەوەی موڵکی ئەم ئوممەتەش روەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بو، کەچی بەئاڕاستەی باکور و باشور کەم بو بەگوێرەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە غەزای هیندیش دەکەین، لەفەرمودەیەکدا هاتوە کە ثەوبان دەیگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((عصابتان من أمتي أحرزهما الله من النار؛ عصابة تغزو الهند، وعصابة تكون مع عيسى بن مريم : خودا دو کۆمەڵی لە ئوممەتی من لە ئاگر پاراستوە؛ کۆمەڵێکیان غەزای هیند

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب المناقب، حديث رقم (٣٥٩٥) فتح الباري: (٦/٦١٠).
[2] رواه البخاري، كتاب المناقب، حديث رقم (٣٦١٨) فتح الباري: (٦/٦٢٥).
[3] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب هلاك هذه الأمة بعضهم ببعض، (٤/٢٢١٥)، ورقمه (٢٨٨٩).

دەکەن و، کۆمەڵێکیش لەگەڵ عیسا کوڕی مەریەم ـدا دەبن)).[1]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ موژدەی ڕزگارکردنی قوستەنتینیەی پێداوین کە پێتەختی دەوڵەتی ڕۆمانی خۆرهەلاَت بو، هەروەك موژدەی ڕزگار کردنی ڕۆمای بارەگای ڤاتیکانی پێداوین، لە فەرمودەیەکی صەحیحدا لەئەبو قوبەیل هاتوە، دەڵێ:

لەلای عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص بوین، لێیان پرسی کامە شار پێشتر ڕزگار دەکرێ: قوستەنتینیە یا ڕۆمیە؟ عەبدوڵلا داوای سندوقێکی ئاڵقەداری کرد و بۆیان هێنا جا نوسراوێکی لێدەرهێنا و، گوتی: ئێمە لە دەوروبەری پێغەمبەرﷺدا بوین، نوسینمان دەنوسی، کە لێیان پرسی: کامە شار پێشتر ڕزگار دەکرێت؛ قوستەنتینیە یا ڕۆمیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((مدينة هرقل تفتح اولاً، يعني القسطنطينية: قوستەنتینیەی شاری هیرەقل یەکەم جار ڕزگار دەکرێت)).[2]

جا فارس و ڕۆم ڕزگار کران و موڵکی کیسرا و قەیسەریش لەنێو چون، موسڵمانان غەزای هیندیان کرد و، قوستەنتینیەشیان ڕزگار کرد. لە داهاتوشدا موسڵمانان موڵکێکی مەزنیان دەبێت، ئیسلام بڵاو دەبێتەوە و شیرکیش زەبون دەبێت و، ڕۆماش ڕزگار دەبێت وەك فەرمودە دروستەکەی پێغەمبەر ﷺ، کە دەفەرموێ:

((ليبلغن هذا الأمر ما بلغ الليل والنهار ولا يترك الله بيت مدر ولا وبر إلا أدخله الله هذا الدين، بعز عزيز، أو بذل ذليل، عزاً يعز الله به الإسلام، وذلاً يذل به الكفر: ئەم ئاینە دەگاتە هەمو شوێنێکی شەو و ڕۆژی بگاتێ. خودا ئەم ئاینە دەباتە هەمو ماڵێك چ لە خانودا بێ یا ڕەشماڵ، بەسەربەرزی سەربەرزان، یا بە زەبونی زەبونان، سەربەرزیەك خودا ئیسلامی پێ سەربەرزکا و، زەبونیەك کوفری پێ زەبون بکات)).[3]

---

[1] الحديث أخرجه النسائي، وأحمد وغيرهما، وإسناده قوي، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني: (٤/٥٧٠) حديث رقم (١٩٣٤).

[2] رواه أحمد والدارمي وابن أبي شيبة والحاكم وصححه وافقه الذهبي، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة (٨/١) حديث رقم (٤).

[3] رواه إبن حبان في صحيحه، وإبن عروبة في المنتقى من الطبقات، وأورده الشيخ ناصرالدين في سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٧/١)، حديث رقم (٣).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندوە کە دەگەڵ تورکان دەجەنگێن. لە صەحیحی بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرە ﵁ هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن من أشراط الساعة أن تقاتلوا قوما ينتعلون نعال الشعر، وإن من أشراط الساعة أن تقاتلوا قوماً عراض الوجوه كأن وجوههم المجان المُطْرقة: لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە لەگەڵ قەومێکدا دەجەنگێن کەوشیان لە موە، لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە لەگەڵ قەومێکدا دەجەنگێن رویان پانە، وەك قەڵغانێك وایە پێستەپۆش کرابێ)).

هەروەها لە ئەبو هورەیرە دەیگێڕنەوە: ((لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا الترك، صغار الأعين حمر الوجوه، ذلف الأنوف، كأن وجوههم المجان المطرقة، ولا تقوم الساعة حتى تقاتلوا قوماً نعالهم الشعر: قیامەت هەڵناستێ هەتا شەڕ لەگەڵ تورکان دەکەن، چاویان گچکەیە و رویان سورە و لوتیان کورت و فشە، رویان دەڵێی قەڵغانی پێستەپۆشە، قیامەت هەڵناستێ تا لەگەڵ قەومێکدا دەجەنگێن کەوشیان موە)).[1]

جا پێغەمبەر ﷺ چۆنی فەرمو، وا ڕوی دا. زیاتر لە جارێك موسڵمانان لەگەڵ تورکان جەنگان. نەوەوی لەبابەت ئەو تەتەرانەی جیهانی ئیسلامییان داگیر کرد. دەڵێ: (ئەو تورکانەی پێغەمبەر ﷺ باسی کردون لە زەمانی ئێمەدا هەبون، بە هەمو سیفەتەکانیانەوە کە پێغەمبەر ﷺ لێیان دوابو؛ چاوی بچوك، رەنگی سور، لوتی کورت و فش، روی پان وەکو قەڵغانی پێستەپۆش، کەوشی مویان لەپێ بو، بەم هەمو سیفەتانەوە لەسەردەمی ئێمەدا هەبون. موسڵمانانیش چەندین جار دەگەڵیان جەنگان، ئێستاش لە جەنگ دان، لەخودا دەپاڕێینەوە پاشینە و سەرەنجامی موسڵمانان چاك بکات و لەکاروباری خۆیان وجگە لە خۆیان سەریان بخا و هەمو حاڵێکیان رێك بخا و بە میهری خۆی بیانپارێزی، و درودو سڵاویش پێشکەش بەو پێغەمبەرەی هەمو ئاخاوتنێکی بە نیگای خودایە)[2]

---

[1] رواه البخاري في كتاب الجهاد، باب كتاب الترك، وفتح الباري: (١٠٣/٦). ورواه مسلم في كتاب الفتن، (٢٢٣٣/٤) حديث رقم (٢٩١٢).

[2] شرح النووي على مسلم: (٣٨/١٨)، وواضح تأثر النووي بنبوأة الرسول ﷺ، لأنه كان يشرح الحديث والمعركة مستمرة بين المسلمين وهؤلاء الذين تحدث الرسول عن قتال المسلمين لهم، وقد رأى وصفهم بأم عيني رأسه.

## جێباسی دووەم

# دەرکەوتنی ئەو درۆزنانەی بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکەن

**پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین، کە تەڵەکەباز و درۆزنی وا لە ئوممەتەکەی دەردەکەون داوای پێغەمبەرێتی دەکەن و ژمارەشیان خۆی لە سی کەس دەدات. لە هەندێك فەرمودانیش بە بیست وحەوت کەسی داناون، مەبەستیش لەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکەن، ئەوان کەسانن کە ئاشوبان دەوروژێنن و خەڵکیش دوایان دەکەوێت و، بەناهەقیان فریو دەخۆن، هەرچی ئەوانەش کە بانگەشی پێغەمبەرێتیان کردوە، بەڵام کەس گوێی نەداونێ، گەلێك زۆرن.**

**لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:**

((لا تقوم الساعة حتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كل يزعم أنه رسول الله:
**قیامەت هەڵناستێ هەتا تەڵەکەباز و درۆزنەکان دێن کە نزیکەی سی کەس دەبن. هەریەکە وا بانگەشە دەکات کە پێغەمبەری خوایە)).[1]**

**لە صەحیحی موسلیمیشدا لە ثەوبات هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:**
((وإنه سيكون في أمتي كذابون ثلاثون كلهم يزعم أنه نبي، وأنا خاتم الأنبياء، لا نبي بعدي:
**سی دەجال و درۆزن لە ئوممەتی من هەڵدەکەون، هەریەك دەڵێ من پێغەمبەرم، کەچی من دوایینی پێغەمبەرانم و چ پێغەمبەرێکی دیکە لەپاش من نیە)).[2]**

**هەروەها بەسەنەدێکی صەحیح لە حوذەیفەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرموێ:**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، فتح الباري: (١٣/٨١).
[2] رواه مسلم في صحيحه، انظر جامع الأصول: (١٠/٤٠٤).

((في أمتي كذابون ودجالون سبعة وعشرون، منهم أربعة نسوة، وإني خاتم النبيين، لا نبي بعـــدي: درۆزن و تەڵەکەباز لە ئوممەتی من هەڵدەکەون و ژمارەیان بیست وحەوتە، چواریان ژنن، منیش دوایینی پێغەمبەرانم و، هیچ پێغەمبەرمێك لە پاش من نیە)).[1]

ژمارەیەکی زۆریش لەم درۆزنانە لە ڕابردودا دەرکەوتون، لەسەردەمی هاوەڵاندا موسەیلەمەی درۆزن و ئەسودەی عەنسی و سەجاح کە ژنێکی پێشبین(کاهنـة) بـو، هاتون و دەرکەوتون. لەسەردەمی شوێنکەوتوانیش موختاری ثەقەفی دەرکەوت کە داوای پێغەمبەرێتی دەکرد. پێش زێتر لە سەدەیەکیش، حوسێن کوڕی عەلی کوڕی میرزا عەبباس لەئێران هەڵکەوت و بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکرد،[2] بە بەهائوڵڵا دەناسراو شوێنکەوتوانیشی پێیان دەگوترێ بەهایی.

دوایین کەسیش بانگەشەی پێغەمبەراتیمان لێوە بیستبێ، مەحمود موحەممەد تەهای سودانی بو، کە بەهۆی نوسین و وتارەکانی خەڵکێکی زۆری گومڕا کرد و، لەسەرەتای ئەم ساڵدا[3] لە سێدارە درا، بەهۆی گومڕایی و بێبڕوایی و هەڵگەڕانەوەکەی حکومەتی سودانی لە سێدارەی دا، جا نەفرەتی خودا لەستەمکاران بێ.

هەرچی دەجالی گەورەشە، ئەوەیە کە لە دوایین کاتدا دەردەکەوێ، خوداش عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێنی تا ئاشوب و ئاژاوەکەی بنبڕ بکات.

---

[1] في مسند أحمد، ومشكل الآثار للطحاوي، ومعجم الطبراني الكبير والأوسط؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٦٥٤)، ورقمه (١٩٩٩).

[2] لەساڵی ١٢٣٣ی کۆچی لەتاران لەدایك بوەو لەشاری عەککای فەلەستین لە١٣٠٩ی کۆچی مردوە.

[3] ساڵی ١٩٨٥

جێباسی سێیەم

# ئاشوبەکان

## خوازگەی یەکەم

## ئاگادارکردنەوە لە ئاشوبەکان

مرۆڤی چاك بریتیە لەو موسڵمانە ڕاستاڵەی کە جێگیرە لەسەر ئەو ئاینەی خودای بەرز دایبەزاندوە. ئوممەتی چاکیش هەر ئەو ئوممەتەیە کە ئەم دینە پاکە بکاتە بەرنامە و لەسەریشی ڕاستاڵ بێ. ئەوجا تاکی موسڵمانان و، تێکڕای ئوممەتی ئیسلامیش توشی گەلێك جۆرە تاقیکردنەوە دێن، جا ڕەنگە هەر لەنێو ریزەکانیدا بەهۆی ئارەزو ناکۆکی و دوبەرەکی سەرهەڵبدا، یا لە دوژمنێکی ڕق و کینە لە دڵدا ڕەنگ بداتەوە کە هێرشیان بۆ بێنێ و زەبونیان بکات. ڕەنگە ئەو تاقیکردنەوە و سەرهاتیانەی بەهۆی دوبەرەکی و ناکۆکی سەرهەڵدەدا بگاتە ڕادەیەك شمشێر لێك هەڵکێشن، جا گیان بڕفێ و خوێن بڕژێ، سنوری حەرام ببەزێنرێ و ماڵ تالان بکرێ، خوداش گەلێکی لەو ئاشوب و ئاژاوانە بە پێغەمبەرەکەی ڕاگەیاندوە کە لە داهاتودا ئوممەتی ئیسلامی تێی دەکەوێ. بۆیەش پێغەمبەر ﷺ بە درێژی باسی ئەو ئاشوبانەی بۆ یاوەران فەرموە. لەگەڵ ڕون کردنەوەی دەرفەتەکانی لێ دەربازبونیان.

ئەبو زەید؛ عەمری کوڕی ئەخطەب دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی پێ کردین، جا بەسەر مینبەر کەوت و وتاری بۆ داین تا نیوەڕۆیی، دابەزی نوێژەکەی کرد و، دیسان چۆوە سەر مینبەر و تا نوێژی عەسر وتاری بۆ داین و، نوێژ کرا و، چۆوە سەر مینبەر و تا ڕۆژاوایی وتاری بۆ داین، باسی هەمو ئەو شتانەی کرد کە ڕو

**دەدەن. جا ئەو کەسەمان زانا و بەئاگاترە لەو ڕوداوانە، کە زێتری لەبەرە).[1]**

**رەنگە هەر ئەوەش بێ کە حوزەیفەی کوڕی یەمان باسی دەکا و، دەڵێ: (جارێك پێغەمبەر ﷺ لەنێوماندا ڕاوەستاو، هیچ شتێکی نەهێشتەوە باسی نەکا، هەر لەوکاتی ڕاوەستانی خۆیەوە تا قیامەت دادێ، جا ئەوی لەبەری کرد لەبەری کرد و، ئەوی لەبیری کرد لەبیری کرد، ئەوان هاوەڵانیشمان زانیان، شتی واش دەبێت کەمن لەبیرم چوە، کە دەبینم وەبیرم دێتەوە. هەروەك پیاوێك ئەگەر یەکێکی لێ بزر بو لەبیری دەکا بەڵام کە دیتی بە بیری دێتەوە).[2]**

**جا هەندێك لەو ئاشوبانە توند و تاریکن و هەندێکیشیان سوك و سانان. لە فەرمودەی حوزەیفە لە صەحیحی موسلیمدا لەبارەی ئاشوب هاتوە:** ((منهن (أي من الفتن) ثلاث لا يكدن يذرن شيئاً، ومنهن فتن كرياح الصيف، منها صغار، ومنها كبار: **سێ لە ئاشوبەکان هەن هیچ شتێکی وا جێنایەڵن و، ئاشوبی واش هەیە وەك هوڕەبای هاوینە، گچکەی هەیە و گەورەشی هەیە)).[3]**

**رەنگە توندی ئەو ئاشوبانە بگاتە ڕادەیەك موسڵمان لە دینەکەی وەدەرنێ، لە فەرمودەی ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەر ﷺەوە، فەرموی:**

((بادروا بالأعمال فتنا كقطع الليل المظلم، يصبح المرء مؤمناً، ويمسي كافراً، ويمسي مؤمناً ويصبح كافراً، يبيع أحدكم دينه بعرض قليل من الدنيا: **بە کردەوان پێش لە ئاشوبی وەك شەوی تاریك و نوتەك بگرنەوە؛ مرۆ بە بڕواداری سبەینێ دەکاتەوە و بۆ شەوێ کافر دەبێت و، بەبڕواداری شەو سەردەنێتەوە و بە کافری ڕۆژدەکاتەوە. یەکێکتان دینەکەی بەبڕە دنیایەکی کەم دەفرۆشێ)).[4]**

**لە فەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیکیش هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

---

[1] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب إخبار النبي ﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة؛ (٢٢١٧/٤) ورقمه: (٢٨٩٢).

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب إخبار النبي ﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة، (٢٢١٦/٤) ورقمه: (٢٨٩١).

[4] رواه احمد ومسلم والترمذي؛ صحيح الجامع الصغير: (٤/٣).

((يكون بين يدي الساعة فتن كقطع الليل المظلم، يصبح الرجل مؤمناً ويمسي كـــافراً، ويمسي مؤمنـــاً ويصبـــح كـــافراً، يبيـــع أقـــوام دينـــهم بعـــرض مـــن الدنيـــا: له پێش هاتنی قیامەتیّ ئاشوبی وەك پارچە شەوی تاریك و نوتەك بەرپا دەبن، پیاو بـــەبڕواداری ڕۆژدەکاتـــەوە و بـــەکافری شـــەو ســـەردەنێتەوە، بـــەبڕوداری شـــەو سەردەنێتەوە و بەکافری ڕۆژدەکاتەوە، قەومگەلێك هەن دینی خۆیان بە دنیایەکی کەم دەفرۆشن)).[1]

جا قورسی و گرانی ئەو ئاشوبانە هێندە زۆرن بۆ موسڵمان کە مەرگ بە ئاوات بخوازێ تا لەدەست ئەو بەڵایانە دەرباز بێ. لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەر ﷺ فەرمویی: ((لا تقوم الساعة حتى تمر الرجل بقبر الرجـــل، فيقـــول: يا ليتـــني كنـــت مكانـــه: قیامەت هەڵناستێ هەتا پیاوێك بەلای گۆڕی یەکێکی دیکە ڕەت دەبێ، دەڵێ: خۆزگە لە جێی وی باما)).[2]

لە گێڕانەوەیەکی موسلیمیش بەم شێوەیە هاتوە: ((والذي نفسي بيـــده، لا تذهـــب الدنيا حتى يمر الرجل على القبر فيتمرغ عليه، ويقول: يا ليتني كنت مكان صاحب هـــذا القـــبر، وليس به الدِّين إلا البلاء: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، دونیا بەسەرناچێ تا وای لێدێ، پیاو بەلای گۆڕێکدا دەچێت، خۆی لەسەر دەگەوزێنێ و دەڵێ: خۆزگە لەجێی خاوەنی ئەم گۆڕە بومایە، لەگەڵ ئەوەی هیچ قەرزێکیشی لەسەر نیە و لەبەر بەڵا و ئاشوبانیەتی)).[3]

لەگەورەترین هۆکارەکانی ئاشوب کەوتنەوەش، کەمی زانست و، زۆری نەفامیە، لەگـەڵ واز هێنـــان لـــە ئیســـلام و، تـــاوان و گوناهکـــاری و یـــاخیبون و، بـــەزاندنی حەرامەکان.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ، دەڵێن پێغەمبـەر ﷺ

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه وقال: حديث حسن صحيح؛ جامع الأصول: (١٠/٣٨٣)

[2] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يغبط أهل القبور، فتـــح البـــاري: (١٣/٧٥) ورواه مسلم كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل... (٤/٢٢٣١).

[3] صحيح مسلم، في الكتاب والباب الذي سبق ذكره.

فەرموی: ((إن بين يدي الساعة أياما ينــزل فيها الجهل، ويرفع العلم، ويكثر الهرج، والهـــرج: القتل: رۆژانێك لـە بەردەمی قیامـەتدا هـەن، نـەفامیان تێدا دیتـە خـوار و، زانسـت بـەرز دەكرێتەوە و كوشتن زۆر دەبێت)).[1]

لەئەنەسەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم بیست دەیفەرمو: ((إن من أشراط الساعـــة أن يرفع العلم، ويكثر الجهل، ويكثر الزنا، ويكثر شرب الخمر، ويقل الرجال، ويكثر النساء، حـــتى يكون لخمســـين امـــرأة القيـــم الواحـــد: لەنیشانەكانی رۆژی دوایـی ئەمانـەن؛ زانسـت هەڵدەگیرێ و، نەزانی زۆر دەبێ و، زینا زۆر دەبێ و، مەی خواردنەوە زۆر دەبێ، پیـاو كــەم دەبنــەوە و، ژنــان زۆر دەبــن، تــا بــە پــەنجا ژنــان تاكــە پیاوێكیــان دەبــێ)). لەگێڕانەوەیەكی تریش: ((يقل العلم، و يظهر الجهل: زانست كەم دەبێ و نەزانی تەشەنە دەكات)).[2]

هۆی كەم بونەوەی ژمارەی پیاوان و زۆری ژنان، هەروەك لە هەندێك فەرمودان ڕون كراوەتەوە، بریتیە لەو شەڕانەی لەو كاتی بەرپا دەبن. لەگەڵێك فەرموداندا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە كە كوشتن لە دوا دواییدا زۆر دەبێت. مەبەستیش كوژرانی بێبڕوایان نیە بەدەستی موسڵمانان، بەڵكو مەبەست یەكتر كوشـتنی خۆبـەخۆی موسـڵمانانە، بەشێوەیەك زۆر كات هۆ و ئامانجی ئەو كوشتنە نازانرێ.

لـە فەرمودەیـەكدا لـە ئـەبو موسـای ئەشعەری هـاتوە كـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ((إن بين يدي الساعة الهرج، قالوا: وما الهرج؟ قال: القتل، إنه ليس بقتلكم المشركين، ولكن قتـل بعضكم بعضاً، [حتى يقتل الرجل جاره، ويقتل أخاه، ويقتل عمه، ويقتل إبن عمه]، قالوا: ومعنـــا عقولنا يومئذٍ؟ قال: إنه لتنـــزع عقول أهل ذلك الزمان، ويخلف له هباء مـــن النـــاس؟ يحســـب أكثرهم أنهم على شيء، وليسوا علـــى شـــيء: لـە پێش هـاتنی قیامـەتێ، كوشـتن ڕودەدا، مەبەستیش كوشتنی كافران نیە بە دەستی ئێوە. بەڵكو یەكتر كوشتنە لەنێو خۆتاندا، تـا وای لێـدێ پیـاو دراوسـێكەی دەكـوژێ و، بـرای خـۆی دەكـوژێ و، مـامی خـۆی

[1] اخرجه البخاري ومسلم، جامع الأصول: (٤٠٨/١١) ورقمه (٧٩٢٤).
[2] متفق عليه، مشكاة المصابيح: ٢١/٣.

دەکوژێ و، ئامۆزای خۆی دەکوژێ، گوتیان: ئەو ڕۆژی ئێمە عەقڵمان هەیە؟ فەرموی: خەڵکی ئەوکاتی عەقڵ و هۆشیان نامێنێ و، خەڵکێکی پوك دەبنە جێنشینیان و، زۆربەیان وادەزانن لەسەر ئاینێکن، بەڵام لەسەر هیچ نین)).[1]

ئەبو هورەیرەش دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((والذي نفسي بيده، ليأتين على الناس زمان لا يدري القاتل في أي شيء قتل، ولا يدري المقتول على أي شيء قتل: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، زەمانێك بەسەر خەڵکی دادێ بکوژ نازانی بۆچی کوشتوە و، کوژراویش نازانی لەسەرچی کوژراوە)).[2]

## خوازگەی دوەم

# هەندێك نمونەی ئاشوبەکان

**یەکەم: کوژرانی عوسمان جێنیشنی پێغەمبەر ﷺ و لێك دابڕانی ئوممەت**

مەزنترین ئاشوب کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی ڕاگەیاندبو، ئەو ئاشوبە بو کە بوە هۆی کوژرانی عوسمانی کوڕی عەففان و لێك دابڕانی ئوممەتی ئیسلامی و، پاشانیش شەڕ لەنێوخۆدا قەوما و شمشێریان لێك هەڵکێشاو و، خوێنی پاك و بێگەردی هەردوك لایان ڕژا کە دو کۆمەڵە موسڵمانی ناکۆك بون، ڕاسترین وەسفی ئەو ئاشوبەش ئەوەیە کە وەکو دەریا شەپۆلی دەدا.

لە فەرمودەیەکی حوذەیفەدا هاتوە کە جارێك لە لای عومەری کوڕی خەطاب دانیشتوە، کە لێی پرسیون: (کامەتان فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺی لەبارەی ئاشوبەوە لەبەرە؟ حوذەیفە گوتی: ئەو ئەزمون و ئاشوبە کە مرۆڤ بەهۆی خانەوادە و ماڵ و منداڵی دوچاری دەبێ و بەنوێژ و خێر، لەگەڵ فەرمان بە چاکە و بەرهەڵستی خراپە

---

[1] رواه أحمد بإسناد صحيح (أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة) للشيخ ناصرالدين الألباني: (٤/٢٤٨).

[2] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل... (٢/٢٢٣١)، ورقمه: (٢٩٠٨).

گوناحەکانیان لادەچێت. عومەر گوتی: دەربارەی ئەوەت لێناپرسم، بەڵکو مەبەستم ئەو ئاشوبانەن وەکو دەریا شەپۆڵ دەدەن. حوذەیفە گوتی: تۆ ئەو خەمە هەڵمەگرە ئەی ئەمیری ئیمانداران، دەرگایەکی قەپات لەنێوان تۆ و ئەوان ئاشوباندا هەیە. عومەر گوتی: ئەو دەرگەیە دەشکێنرێت یا دەکرێتەوە؟ گوتی: دەشکێنرێ. عومەر گوتی: کەواتە هەرگیز داناخرێتەوە. جا لە حوذەیفەیان پرسی: عومەر دەیزانی دەرگەکە کێیە؟ گوتی: بەڵێ، هەروەك چۆن دەیزانی لە پاش سبەینێ شەوێك دێت، ئاوا دەیزانی دەرگەکە کێیە؟ چونکە من فەرمودەیەکی ڕاست و دروستم بۆگێڕابۆوە. بە مەسروقمان گوت بپرسێ کە دەرگەکە کێیە؟ گوتی: عومەرە).[1]

پێغەمبەر ﷺ ئەو ساڵەی دیاریکردبو کە ئاشوبی تێدا ڕودەدات، لە فەرمودەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((تدور رحى الإسلام بعد خمس وثلاثين، فإن يهلكوا فسبيل من هلك، وإن يقم لهم دينهم-يقم لهم سبعين عاما: ئاشی ئیسلام تا پاش سیو پێنج ساڵی دیکە دەگەڕێ، جا ئەگەر بەهیلاك چون ئەوا دەچنە ڕێی فەوتاوان و، ئەگەر دینەکەشیان بەرپا بێ حەفتا ساڵی دی بەرپا دەبێت)). عومەر گوتی: لەوەی ماوە، یا لەوەی تێپەڕیوە؟ فەرموی: ((مما مضى: لەوەی تێپەڕیوە)).[2] پێغەمبەر ﷺ بەئاشی ناوبردوە، چۆن ئاش دانەوێڵە دەهاڕێ، ئەویش بۆ جەنگاوەران وایە، لەپاشماوەی فەرمودەکەشدا پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بە ماوەی فەرمانڕەوایی بەنی ئومەییە کردوە، کە حەفتا ساڵ بو.

لە هەندێك گێڕانەوەشدا بە ڕاشکاوی باسی ئومەتی کردوە لەو ئاشوبانەدا. هەروەك لە فەرمودەی ئەبو هورەیرەدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة حتى تقتتل فئتان عظيمتان، وتكون بينهما مقتلة عظيمة، ودعواهما واحدة: قیامەت هەڵناستێ هەتا دو کۆمەڵی گەورە دەگەڵ یەك دەجەنگێن و، شەڕێکی

---

[1] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب الفتنة التي تموج كموج البحر؛ فتح الباري: (٤٨/١٣)، ورواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب الفتنة التي تموج كموج البحر (٢٢١٨/٤) واللفظ للبخاري.

[2] حديث صحيح، أخرجه أبو داود، والطحاوي في مشكل الآثار، والحاكم، وأحمد وغيرهم، وصححه الحاكم، ووافقه الذهبي؛ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني، (٧٠٣/٢)، حديث رقم (٩٧٦).

گەورەیان لەنێواندا ڕودەدات و، بانگەوازەکەشیان یەکە)).[1]

**دوەم: ئاشوبی خەواریجان**

شوێنەواری ئاشوبان جودابونەوە و جیاڕاییە. پێغەمبەر ﷺیش پێی ڕاگەیاندوین کە لە ئاخیر زەمانێ کۆمەلأنێك پەیدا دەبن، ڕۆلێکی مەزنیان لە لێك دابڕینی ئوممەتی ئیسلامی دەبێت، چونکە ئەوانە بانگەشەی زانست دەکەن و، لە پەرستشدا کرد و کۆش دەکەن و، بۆ کتێبی خوا بانگەواز دەکەن، بەلأم نەفام و نەزانن و حوکمەکانیان زۆر و ستەمە و، ڕاو بۆچونیان کورت هەلدێنی و خوێنی ئەو موسلمانانە دەڕێژن کە لەگەلیاندا جیاڕان و، هاوەلأن و زانایان بە نەفام و نەزان دادەنێن.

لە فەرمودەیەکی بوخاری و موسلیمدا لە عەلی کوڕی ئەبوطالیب هاتوە دەلێ: (پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((سيخرج في آخر الزمان قوم أحداث الأسنان، سفهاء الأحلام، يقولون من قول خير البريّة، يقرؤون القرآن، لا يجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرميّة، فإذا لقيتوهم فاقتلوهم، فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم عندالله يوم القيامة: لە ئاخیرزەماندا قەومێك سەرهەلدەدەن تەمەنیان بچوکە، دورن لە نەرم و نیانی، فەرمودەی چاکترین مرۆڤ دەلێنەوە، قورئان دەخوێنن و، لە گەرویان تێناپەڕێ، چۆن تیر لە نێچیر دەچێتە دەرێ، ئەوانیش بەم شێوەیە لە ئیسلام دەردەچن. جا ئەگەر پێیان ڕاگەیشتن بیانکوژن، چونکە کوشتنی ئەوانە مایەی پاداشتی بکوژەکانیانە لە ڕۆژی قیامەت لەلای خوای گەورە)).[2]

لە سونەنی ئەبو داود و سونەنی ئیبنی ماجە و موستەدرەکی حاکیم و موسنەدی ئەحمەددا، لە ئەنەسەوە هاتوە کە دەلێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((سيكون في أمتي إختلاف وفرقة، قوم يحسنون القيل، ويسيئون الفعل، يقرؤون القرآن، لا يجاوز تراقيهم، يمرقون من الدين مروق السهم من الرميّة، لا يرجعون حتى يرتد السهم الى فُوقه، هم شرار الخلق والخليقة، طوبى لمن قتلهم وقتلوه، يدعون الى كتاب الله، وليسوا منه في شيء، من

---

[1] رواه البخاري، كتاب المناقب، حديث رقم (٣٦٠٨، ٣٦٠٩)؛ فتح الباري(٦/٥١٦) ورواه مسلم، كتاب الفتنة، باب اذا تواجه المسلمان بسيفهما (٤/٢٢١٤) واللفظ للمسلم.

[2] صحيح الجامع: (٣\٢١٣)

قاتلهم كان أولى بالله منهم، سـيماهم التحالق: جياڕايى و لێك دابڕانێك دەكەوێتە نێو ئوممەتى من، كۆمەڵێك قسەى جوان دەكەن و، كارى خراپ ئەنجام دەدەن، قورئان دەخوێنن و لە چۆلەمەيان ناچێتە خوار، چۆن تیر نێچیر دەسمێ و لێیەوە دەردەچێ، ئاوا لە ئیسلام دەردەچن. ناگەڕێنەوە تا تیر بۆ ژێ و كەوانەكەى نەگەڕێتەوە، ئەوانە خراپترین بەدیهێنراوى خودان، مزگێنى بۆ ئەو كەسەى دەیانكوژێ و دەیكوژن، بۆ كتێبى خوا بانگەواز دەكەن، فریان بەسەریەوە نیە. هەركەسێ دەگەڵیان بجەنگێ لەوان نێزیكترە لە خوداوە، سیمایان موتاشین یان سەرتاشینە -بەشێوەیەكى تایبەتى-)).[1]

جا ئەم كۆمەڵە لەسەردەمى هاوەڵاندا وەدەركەوتن و، هاوەڵانیان بەبێبڕوا داناو، خوێنى موسڵمانانیان بە حەڵاڵ زانى و، بەڵایەكى گەورە بون بۆ ئەم ئوممەتە و ئاژاوە و ئاشوبێكى زۆریان ناوە.

## خوازگەى سێیەم

## چۆنیەتى قوتاربون لە ئاشوبان

گەلێك لە هاوەڵان هەوڵیان داوە تا ئەو ئاشوبانە بزانن كە ئوممەتى ئیسلامى دوچاریان دەبێ و بە ڕێى دەربازبون و لێ قوتاربونیشیان ئاشنابن، لە سەروى هەمویان حوذەیفەى كوڕى یەمان بو كە دەیگوت: (من شارەزاترین كەسم بە هەمو ئاشوبێك كە لەنێوان خۆمەوە تا ڕۆژى قیامەتێ ڕودەدات).[2]

حوذەیفە لەبابەت ئاشوبان زۆر پرسیارى لە پێغەمبەر ﷺ دەكرد، تا تێیان نەكەوێ و توشیان نەبێت. لە صەحیحى بوخاریدا هاتوە كە حوذەیفە دەڵێ: (خەڵكى لەبارەى خێر و چاكەوە پرسیان لە پێغەمبەرى خوا ﷺ دەكرد، بەڵام من لەبابەت شەڕو

---

[1] صحيح الجامع: (٣\٢١٣)

[2] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب إخبار النبي ﷺ فيما يكون إلى قيام الساعة، (٤/٢٢١٦) ورقمه: (٢٨٩١).

خراپەوە نەوەك تێی بکەوم و بگەمە کاتی شەڕ و ئاشوبان. جا پرسیم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەنەفامی و شەڕدا بوین، خودا ئەم خێرەی بۆ هێناین، ئایا لە دوای ئەم خێرە شەڕ هەیە؟ فەرموی: ((نعم: بەڵێ)). گوتم: ئەدی لە دوای ئەو شەڕە خێر هەیە؟ فەرموی: ((نعم وفيه دخن: بەڵێ بەلاّم لێڵی تێدا هەیە)). گوتم: لێڵییەکەی چیە؟ فەرموی: ((قوم يهدون بغير هديي، تعرف منهم و تنكر: قەومێك بەرێبازی بێجگە لە رێنمایی مندا دەڕۆن، چاکەشیان هەیە و خراپەشیان هەیە، جا کاری چاکیان پەسند دەکەی و خراپەیان ئینکار دەکەی)). گوتم: ئەدی پاش ئەو خێرەی چ شەڕی دیکە هەیە؟ فەرموی: ((نعم، دعاة على ابواب جهنم، من اجابهم قذفوه فيها: بەڵێ، کۆمەڵێك خەڵکی بۆ دەرگەی دۆزەخ بانگ دەکەن، هەر کەسێ بە گوێیان بکا هەڵیدەدەنە ناو دۆزەخ)). گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا وەسفیانم بۆ بکە. فەرموی: ((هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا: ئەوانە لە خۆمانن و بەزمانی ئێمە دەدوێن)). گوتم: ئەگەر گەیشتمە ئەو زەمانە چیم پێدەفەرموی؟ فەرموی: ((تلزم جماعة المسلمين و امامهم: پابەندی کۆمەڵ و پێشەوای موسڵمانان دەبی)). گوتم: ئەدی ئەگەر کۆمەڵ و ڕابەریان نەبو؟ فەرموی: ((فاعتزل تلك الفرق كلها، ولو ان تعض باصل شجرة، حتى يدركك الموت وانت على ذلك: کەواتە لە هەمو ئەو کۆمەڵانە کەنار بگرە ئەگەر بەددانیشت بنکی دارێك بگەزی، تاکو لەسەر ئەم بارە مردنت دەگاتێ)).[1]

لە فەرمودەی عیرباضی کوڕی ساریەشدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەستگرتن بە ئیسلام و گوێڕایەڵی ئیمامی داوە، لەگەڵ پابەند بون بە سونەتی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتنی جێنشینە رابەر و رێنماکانی دوای خۆی. عەبدوڕەحمان کوڕی عەمری سەلەمی دەگێڕێتەوە کە گوێی لە عیرباضی کوڕی ساریە بو، گوتی: (پێغەمبەر ﷺ پەندو وەعزێکی کاریگەری داین، چاوان ئەشکیان لە تاوان دەباران و دڵان دەلەرزین. گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە پەند و قسەی یەکێکە کە جێمان بێڵێ، جا چمان پێ رادەسپێری؟ فەرموی:

((تركتكم على المحجة البيضاء، ليلها كنهارها، لا يزيغ عنها بعدي إلا هالك، ومن يعش منكم

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب كيف يكون الأمر إذا لم تكن جماعة، فتح الباري: (٣٥/١٣).

بعدي فسيرى إختلافاً كثيراً، فعليكم بسنتي وسنة خلفاء الراشـــدين المـــهديين، عضـــوا عليـــها بالنواجذ، وعليكم بالطاعة، وإن عبداً حبشياً، فإنما المؤمن كالجمل الأنف، حيثمـــا قيـــد ينقـــاد: لەسەر ڕاستەڕێیەکی سپی جێم هێشتون، شەوی وەك ڕۆژی وایە، هەر کەسێکی لە پاشەمن لێی لاڕێ بێ تونا دەبێ. هەر کەسێکیش لەئێوە لەپاش من بژی گەلێك جیاوازیان دەبینێ. جا پابەند بن بە سونەتی من و سونەتی جێنیشینە ڕابەرو ڕێنماکانی پاش من، بە کەڵبان گازی لێبگرن، هەردەم گوێڕایەڵیش بن بۆ ئەمیران، ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیش بێ، چونکە موسڵمان وەك حوشتری دەستەمۆ وایە، بۆ کوێی ببەن بۆ وێ دەچێ)).[1]

## موسڵمان لە شەڕی نێوان موسڵمانان‌اندا چیبکا

پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی ڕێنمایی کردوە، لەو جۆرە ئاشوبانەدا چۆن ڕەفتار بکات، کە لەنێوان موسڵماناندا بەرپا دەبن و، هەق بزر دەبێ و، کاروباریان دەپەشۆکێ. جا پێغەمبەر ﷺ داوا دەکا کە موسڵمان دورەپەرێز بن لەو جۆرە ململانێ و جەنگانەدا، لە شوێنکی دوردا کەنار بگرن، یا لەلوتکەی چیایاندا شوانی بکەن، یا لەسەر سنوری وڵاتی موسڵماناندا دژی دوژمنان جیهادێ بکەن. خۆ ئەگەر ئاشوب و شەڕی نێوان موسڵمانانی گەیشتێ، فەرمانی پێدراوە دەست نەکاتەوە و داکۆکی لەخۆی نەکات، ئەگەرچی سەریشی تێدابچێ.

ئەبو بەکرە بۆمان دەگێڕتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إنها ستكون فتن، ألا ثم ستكون فتنة، القاعد فيها خير من الماشي فيها، والماشي خـــير مـــن الساعي إليها، ألا فإذا نـــزلت أو وقعت، فمن كان له إبل فليلحق بإبله، ومن كـــان لـــه غنـــم فليلحق بغنمه، ومن كان له أرض فليلحق بأرضـــه: بەڕاستی ئاشوبگەلێ بەرپادەبێ، ئاگادار بن لە پاش ئەو ئاشوبانە ئاشوبێك بەرپا دەبێ، ئەوی تێیدا دادەنیشێ چاکترە لەوی تێیدا دەڕوا. ئەوی تێیدا دەڕوا چاکترە لەوی بۆی غاردەدا. ئاگاداربن ئەگەر ئەو

[1] حديث صحيح، أخرجه ابن ماجة، والترمذي، وأحمد، أنظر سلســـلة الأحـــاديث الصحيحـــة، للألبـــاني (٢/٦٤٧)، حديث رقم (٩٣٧).

ئاشوبه بەرپا بو؛ ئەوی حوشتری هەیە بچێتە لای حوشترەکانی و، ئەوی مەڕی هەیە بچێتە لای مەڕەکانی و، ئەوی زەویەکی هەیە بچێتە سەر زەویەکەی)). پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی ئەو کەسەی نە حوشتر و نە مەڕ و نە زەوی نیە؟ فەرموی: ((یعمد علی سیفه فیدق علی حده بحجر، ثم لینج إن استطاع النجاء، اللهم هل بلغت؟ اللهم هل بلغت؟: شمشێرەکەی خۆی دەست دەداتێ و دەمی بە بەردێك بشکێنێ. جا ئەگەر توانی خۆی رزگار دەکا. خودایە، ئایا پەیامەکەتم ڕاگەیاند؟ خودایە، ئایا رام گەیاند؟)) پیاوێك گوتی: ئەدی ئەگەر بە زۆر بردمیانە یەکێك لەو دو ریز و کۆمەڵە؟ یەکێك شمشێرێکی لێدام یا تیرێك هات و کوشتمی؟ فەرموی ((یبوء باثمه و اثمك، ویکون من اصحاب النار: گوناهی خۆی و گوناهی تۆ هەڵدەگری و دەچێتە دۆزەخ)).[1]

لە ئەبو سەعیدی خودری هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یوشك أن یكون خیر مال المسلم غنم یتبع بها شعف الجبال ومواقع القطر، یفر بدینه من الفتن: هێندەی نەماوە مەڕ ببتە چاکترین ماڵی موسڵمان، بەخۆو بە ڕانەکەی دۆڵ و چیایان بە شوێن مێرگ و جێبارانداا بگەڕێ و دینەکەی خۆی لە ئاشوبان قوتاربکات)).[2]

لە فەرمودەیەکی ئەبو هورەیرەش لەلای حاکمدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((أظلتكم فتن كقطع اللیل المظلم، أنجی الناس منها صاحب شاهقة، یأكل من رسل غنمه، أو رجل من وراء الدروب، آخذ بعنان فرسه، یأكل من فیء رمحه: ئاشوبی وەکو پارچە شەوی تاریك و نوتەك سێبەری لەسەر کردون، ئەوی لەسەر لوتکەی کێوێکی بەرزدایە و لەشیری ڕانە مەڕەکەی دەخوا لەهەمو کەس زیاتر رزگار بوە. یا پیاوێکی سەنگەرنیشینە جڵەوی ماینەکەی گرتوە و، لە غەنیمەتی ڕمەکەی دەخوا)).[3]

هەروا پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبوزەری ڕون کردۆتەوە چۆن لە ئاشوب هەڵسوکەوت بکا و پێی فەرمو: ((أرأیت إن قتل الناس بعضهم بعضاً حتی تغرق حجارة الزیت من الدماء، كیف تصنع؟ أقعد في بیتك، واغلق علیك بابك: ئەگەر خەڵکی یەکدیان کوشت تاکو

---

[1] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب نزول الفتن: (٤/٢٢١٢) ورقمه: (٢٨٨٧).

[2] رواه البخاري، باب التعرب في الفتنة، فتح الباري: (١٣/٤٠).

[3] رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/٤٦٦) (٤/٦٤٢).

حیجارەتولزەیت (شوێنکی مەدینەیە) لە خوێندا نقوم دەبیٚ، تۆ چ دەکەی؟ لە ماڵی خۆت دانیشە، و دەرگاکەت لەسەر خۆت داخە)). گوتی ئەگەر وازیان لێنەهێنام؟ فەرموی ((فأت من کنت معه، فکن فیـــهم: وەرە لای ئەوەی لەگەڵیدا بوی و لەناویاندا بە)). گوتی: چەکی خۆم ببەم؟ فەرمووی: ((إذا تشارکهم فیما هم فیه، ولکن إن خشـیت أن یروعك شعاع السیف فألق من طرف ردائك علی وجهك، کي یبوء بإثمه وإثمك، ویکـون مـن أصحاب النار: بەم شێوەیە دەبیە هاوبەش لەوەی تێی کەوتون، بەڵام ئەگەر لە تیشکی شمشێر ترسای، لچکی پۆشاکەکەت بەسەر ڕوت دادە تا گوناهی خۆی و گوناهی تۆ هەڵگری و بچێتە دۆزەخ)).[1]

بۆیە هەریەکێك لە هاوەڵان، لە ئاشوبەکەدا نەجەنگابیٚ، ئەم فەرمودانەی کردۆتە بیانو و (ئەوانیش بریتین لەوانەی جەنگیان لە پاڵ عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا نەکردوە لە شەڕەکانیدا، وەکو سەعدی کوڕی ئەبیوەقاص و، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و، ئەبو بەکرە و، هی دیکەش. وەگوتیان: دەبیٚ دەست هەڵگرین، تەنانەت ئەگەر یەکێك بهاتبا سەری بیکوژیٚ بەرگری لەخۆی نەدەکرد و وەلای نەدەنا.

جەماوەری هاوەڵان و شوێنکەوتان ڕایان وایە دەبیٚ حەق سەر خریٚ و شەڕ لەگەڵ دەستدرێژان بکریٚ. ئەمانەش ئەو فەرمودانەیان وا لێك داوەتەوە کە لەبارەی لاوازان هاتوە، یا بۆ ئەوانەیە کە خاوەن هەق ناناسنەوە).[2]

طەبەری دەڵێ: (بنەڕەتی ئاشوب تاقیکردنەوە و ئەزمونە، جا ئەوی بتوانیٚ لەسەری واجبە بەرەنگاری خراپان بێتەوە، هەر کەسێکی یاریدەی خاوەن حەق بدا پێکاویەتی و، ئەوی یارمەتی هەڵەکاریش بدا هەڵەی کردوە، ئەگەر هەق و ناهەقیش تێکەڵ بو، ئەو بارەیە کە نەهی کراوە مرۆڤی تێدا بجەنگیٚ).[3]

گومانیش لەوەدا نیە کە ناسینەوەی هەق و ڕاستی گەلێك گران و ئەستەمە، لەو

[1] حدیث صحیح، رواه أحمد وأبوداود وإبن حبان والحاکم، أنظر صحیح الجامع الصغیر: (٦/٢٥٨).
[2] فتح الباري: (٣٣\١٣)
[3] فتح الباري: (٣١\١٣)

جۆرە باروزروفانەی ئاشوبیان تێدا بەرپادەبێ و ئارەزویان تێدا دەردەکەوێ، جا دورکەوتنەوە و کەنارگیری دروست ترە، تاکو موسڵمان خوێنێکی حەرام نەڕێژێ و موسڵمانێك ئازار نەدا. خوداش زانا و شارەزاترە.

## خوازگەی چوارەم

## سەرچاوەی ئاشوبان

پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە ڕەشەبای ئاشوبان لە کوێوە هەڵدەکاتە سەر موسڵمانان. لە هەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم و موەطەئی مالیکدا لە ئەبو هورەیرە ﵁ هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((رأس الكفر نحو المشرق، والفخر والخيلاء في اهل الخيل والإبل، الفدادين أهل الوبر، والسكينة في اهل الغنم: سەری بێباوەڕی لە ڕۆژهەڵاتەوەیە و، لەخۆبایی بون و زلفیزی لەنێو دەوارنشینی خاوەن وڵاخ و حوشتری قەڵەو و، ئارامی لەنێو خاوەن مەڕان دایە)).[1]

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، لە پێغەمبەر ﷺەوە، کە لەپاڵ مینبەر ڕاوەستا و فەرموی: ((الفتنة هاهنا، من حيث يطلع قرن الشيطان، أو قال: قرن الشمس: ئاشوب ئەوەتا لێرەیە، لێرە کە شاخی شەیتان دێتە دەرێ، یا فەرموی شاخی خۆر)).

لە ڕیوایەتێکی موسلیمیشدا لە عائیشە هاتوە فەرموی: ((رأس الكفر هاهنا من حيث يطلع قرن الشيطان: سەری کوفر ئەوەتا لێرەیە کە شاخی شەیتانی لێوە دێتە دەرێ)).[2]

لە فەرمودەیەکی دیکەشدا لە ئیبنی عومەر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اللهم بارك لنا في شامنا، اللهم بارك لنا في يمننا، قالوا يا رسول الله: وفي نجدنا؟ فأظنه قال في

---

[1] جامع الأصول: (١٠/٦١)، ورقم الحديث: (٧٥٢٨).

[2] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب قول النبي ﷺ ((الفتنة من قبل الشرق)) فتح الباري: (١٣/٤٥) ومسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب الفتنة من المشرق (٤/٢٢٢٩) حديث رقم (٢٩٠٥).

الثالثة: هناك الزلازل والفتن، وبها يطلع قرن الشيطان: **خودایە شامەمان بۆ پیرۆز و بەهرەدار کەی، خودایە یەمەنمان بۆ پیرۆز و بەهرەدار کەی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی نەجد؟ عائیشە دەڵێ: پێموایە لەبارەی سێیەم فەرمووی: بومەلەرزە و ئاشوبەکان لەوێوەن و شاخی شەیتانی لێوە دەردەکەوێ)).** [1]

**لە بنەڕەتدا مەبەست بە نەجد هەمو زەویەکی بەرزە. خەطابی دەڵێ: (نەجد لای ڕۆژهەڵاتە و هەر کەسێکی لە مەدینە نیشتەجێ بێ نەجدەکەی بریتیە لە دەشتی عێراق و دەوروبەری، کە خۆرەلاتی خەڵکی مەدینەن. لە بنەڕەتیشدا نەجد زەوی بەرزە و، پێچەوانەی (غەور)ە کە هەمو زەویەکی نزمە. جا تیهامە هەموی غەورە و مەککەش دەکەوێتە تیهامە).** [2]

**بێگومان عێراقیش دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵات بەگوێرەی مەدینەش بەنەجد دادەنرێ و، سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش هەروای تێگەیشتوە، جا کاتێك خەڵکی عیراق گوناهی مەزنیان ئەنجام دەدا و لەشتی پوچیشیان دەپێچاوە، سالم پێی گوتن: (هۆ خەڵکی عێراق، چەند لە گوناهی گچکە دەپێچنەوە و گوناهی گەورەش ئەنجام دەدەن، لە بابم بیست دەیگوت: گوێی لە پێغەمبەرﷺ بو دەیفەرمو: ((ان الفتنة تجيء من هنا: ئاشوب ئا لێرەوە سەرهەڵدەدەن و دێن))، بەدەستی پیرۆزیشی ئاماژەی بۆ لای ڕۆژهەڵات کرد ((من حيث يطلع قرنا الشيطان: لێرە کە هەردو شاخی شەیتانی لێوە دەردەکەوێ)). ئێستاش ئێوە لە ملی یەکتر دەدەن).** [3]

**هەر کەسێك چاو بە مێژودا بخشێنێ، دەزانێ ئاشوبەکان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ سەر موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی هەڵیان کردوە. هەر لەوێ ئەو ئاشوبە سەری هەڵدا کە بوە هۆی شەهید کردنی عوسمانی جێنیشنی پێغەمبەر ﷺ و رابەر و پێشەوای موسڵمانان. حەرورییە لە دین دەرچوەکانیش کە خەواریج بون هەر لەوێ سەریان هەڵدا، ڕەشەبای خەواریجانیش بەدرێژایی سەردەمی ئەمەوییان، ئوممەتی ئیسلامی**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب قول النبي ﷺ: الفتنة من قبل المشرق، فتح الباري: (١٣/٤٥).

[2] فتح الباري: (١٣\٤٧)

[3] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب الفتنة من المشرق (٤/٢٢٢٩) حديث رقم (٢٩٠٥).

هەژاند. شۆڕشی زنجیش هەر لەوێدا لە ساڵی ٢٥٥ کۆچی لەشاری بەصرا بەرپا بو، لە ساڵی ٢٧٨ی کۆچیش بزاڤی قەرامیطە لەویّ سەری هەڵدا. ئەوی چاویش بداتە ئەو کارەساتانەی کە زنج و قەرامیطە لەنیۆ ئوممەتی ئیسلامی نایانەوە سەرسام دەبیّ کە چییان بەسەر هێناوە.

هەروەها ڕەشەبای تەتەرانیش هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵیکرد و، هەرواش دەمێنێتەوە تا بەیداخەکانی دەجالّ لە خوراسانەوە دێن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین.

ئەو فەرمودانەی کە سەرچاوەی هەڵکردنی ئاشوب بۆ سەر موسڵمانان دیاری دەکەن، تێکگیرنابن لەگەڵ ئەو فەرمودەی کە ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنه دەیگێڕتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتە سەر یەکێك لە قەڵاتەکانی مەدینە و فەرمووی: ((هل ترون ماأری؟: ئەوی من دەبینم ئێوەش دەیبینن؟)) گوتیان: نەخێر. فەرمووی: ((فإني لأری الفتن تقع خلال بیوتکم کوقع القطر: من دەبینم ئاشوب وەکو باران لەماڵەکانتان دەکەویّ))[1].

ئیبنی حەجەر لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەدا دەڵێ: (مەدینە بەمە تایبەتمەند بو، چونکە عوسمان رضي الله عنه ی تێدا کوژرا، پاشان ئاشوب بە وڵاتاندا بڵاو بۆوە، جەنگی (جەمەل) و (صوفەین) هەر بەهۆی کوژرانی عوسمان بو، شەڕی (نەهرەوان)یش بەهۆی دادوەری جەنگی (صوفەین) بو، هەمو جەنگێکیش کە لەوکاتە ڕویدا بێ بەهۆی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی کوژرانی عوسمان بو. توندترین هۆی کوشتنی عوسمانیش ناڕازی بونی خەڵك بو بە ئەمیرەکانی و ئینجا بەخۆشی کە ئەو ئەمیرانەی داناوە. یەکەمجاریش ئەوە لەعیراق سەری هەڵدا کە دیارە هەر لە ڕۆژهەڵاتەوەیە، بۆیە هیچ تێکگیرانێك لەنێوان ئەم فەرمودانە ڕونادات).[2]

---

[1] رواه البخاري في كتاب الفتن، باب قول النبي ﷺ: ((ويل للعرب من شرّ قد إقترب)) فتح الباري: (١١/١٣)، ورواه مسلم (٤٢٢١١) واللفظ للبخاري.
پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمودەیەدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئاشوبەکان بەرپادەبن و بە تەنیا کۆمەڵێك تایبەت نین بەڵکو هەموان دەگرێتەوە، وەکو باران. ئەوەی چاو بداتە مێژو و ڕوداوەکانی دوای کوشتنی عوسمان و کوشتنی حوسێن، ڕاستی فەرمودەکەی بۆ ڕون دەبێتەوە.
[2] فتح الباري: (١٣\١٣)

## جێباسی چوارەم

# کار دانە دەست کەسی نەشیاو

یەکێك لەو بنچینە گرنگانەی کە ژینی مرۆڤی پێ چارەبێت ئەوەیە کار بدرێتە دەست پیاوی شیاو و کەسی گونجاو لەشوێنی گونجاو دابنرێت. بۆیە ئەو ماوانەی فەرمانڕەوایی لە دەست کەسانێکی بەتوانا و چاك و پارێزکاردا بو، ماوەیەکی ڕوناك و پرشنگدار بون لە مێژوی ئوممەتی ئیسلامیدا، کوشندەترین دەردیش بکەوێتە وێزەی سیستمی ژیان ئەوەیە کەسانێکی نابوت و نالەبار و ناشایەن کاروبار و فەرمانڕەوایی بگرنە دەست و، بەپێی ئارەزوی خۆیان ژین ببەنە سەر و مرۆڤی لێهاتو و هەڵکەوتەو توانا لە ئاست بەڕێوەبردنی کاروباران بەچاکترین شێوە، پشتگوێ بخرێن.

پێغەمبەریش ﷺ رایگەیاندوە کە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کار بدرێتە دەست کەسی ناشایستە. هەروەك لە صەحیحی بوخاریدا لە ئەبو هورەیرە ﷺ هاتوە دەڵێ: (ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەکۆڕێکدا قسەی بۆ خەڵکی دەکرد. دەشتەکیەك هاتە لای و لێی پرسی کەینێ قیامەت دێ؟ بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەر لەباسەکەی خۆی بەردەوام بو. هەندێك لە خەڵکەکە گوتیان: قسەکەی بیست، بەڵام حەزی لێناکا. هەندێکیش گوتیان: نەخێر، گوێی لێ نەبو، تاکو لە فەرمایشتەکانی خۆی بۆوە. ئەوجا فەرموی: ((این السائل عن الساعة؟: کوا ئەوی لەبارەی قیامەت پرسیاری کرد)). کابرا گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خودا. فەرموی: ((اذا ضعیت الامانة فانتظر الساعة: ئەگەر ڕاسپاردە بزرکرا چاوەڕێی قیامەت بە)). گوتی: جا بزرکردنی چۆنە؟ فەرموی: ((اذا وسد الامر الی غیر اهله فانتظر الساعة: ئەگەر کار درا دەست کەسانی ناشایستە، چاوەڕێی قیامەت بە)).[1]

[1] جامع الاصول: (١٠/٣٩٦)، حديث رقم (٧٩٠٤).

طەحاوی لە (مشكل الآثار)دا لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ((يوشك أن يغلب على الدنيا لكع، إبن لكع، وأفضل الناس مؤمن بين كريمين: هێندەی نەماوە سپڵەی کوڕی سپڵە بەسەر دنیایێدا زاڵ بێ. چاکترین خەڵکیش بڕوادارێکی نێوان دو ڕێزدارانە)).[1]

هەر کەسێکیش چاوی دابێتە مێژوی ئوممەتی ئیسلامی، دەزانێ ئەو نەخۆشیەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردوە، لەو بەڵا هەرە گەورانەیە کە موسڵمانانی گرفتار کردوە، کەسانێکی زۆردار و کەڵەگا کاروباری ئەم ئوممەتەیان گرتۆتە دەست، ناتوانن گوێ بدەنە ڕای پێچەوانە و ناکۆك لەگەڵ بۆچونی خۆیان.

لە فەرمودەیەکدا لە موعاویە هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ستكون أئمة من بعدي، يقولون فلا يرد عليهم، يتقاحمون في النار كما تقاحم القردة: پێشەوای وا لە پاشە من دێن: قسان دەکەن و وەرامیان نادرێتەوە، وەکو مەیمونی بێهۆش خۆیان هەڵدەدەنە نێو ئاگر)).[2]

هەندێك لەم فەرمانڕەوایانە بە ئارەزو و ڕابواردن دەخافڵێن و ئاگایان لە کاروباری موسڵمانان نامێنێ، هەندێکیشیان هەق ناناسن، بۆیە خەڵکی بەرەو کاری نەشیاو هەڵدەنێن و، بیدعە و خراپەکاریان تێدا بڵاودەکەنەوە.

هەروەك لەو فەرمودەدا هاتوە کە عوبادەی کوڕی صامیت لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە: ((ستكون أمراء تشغلهم أشياء، يؤخرون الصلاة عن وقتها، فاجعلوا صلاتكم معهم تطوعاً: هەندێك فەرماندە دێن شتانێك خەریکیان دەکا، نوێژان لەکاتی خۆی دوا دەخەن، جا ئێوە نوێژەکانی خۆتان لەگەڵ ئەواندا بکەنە نوێژی سونەت)).[3]

لە فەرمودەی ئوم سەلەمەش لەلای موسلیم و ئەبوداود، هاتوە: ((ستكون أمراء فتعرفون وتنكرون، فمن كره برئ، ومن أنكر سلم، ولكن من رضي وتابع لم يبرأ:

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٩) ورقم الحديث (١٥٠٥) وفي إسناد الحديث المرفوع ضعف. ألا إن له طريقاً صحيحة موقوفة، والموقوف له حكم المرفوع في مثل هذا.

[2] رواه الطبراني في الكبير والأوسط، وابو يعلى؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٩٨/٤)، ورقمه: (١٧٩٠).

[3] رواه ابوداود واحمد وابن ماجة باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (٢٠٥/٣).

فەرماندەی وا پەیدا دەبن، کاری چاکیان لێ دەبینن و کاری خراپیش، جا ئەوی ڕقی لەکارە خراپەکان بۆوە ساغ دەبێ و، ئەوی بەرهەڵستی بکا سەلامەت دەبێ، بەلام ئەوی پێی رازی بێ و شوێنکەوتەبێ ساغ دەرناچێ)).[1]

لە موسنەدی ئەحمەد و موعجەمی طەبەرانی و سونەنی ئیبنی ماجەدا، لە ئیبنی مەسعود هاتوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((سيكون عليكم أمراء يؤخـرون الصـلاة عـن مواقيتها، ويحدثون البدع، قال إبن مسعود: فكيف أصنع؟ قال: تسألني يا إبن أم عبد كيف تصنع؟ لا طاعة لمن عصى الله: فەرماندەی وا دێنە سەرتان نوێژ لەکاتی خۆی دوادەخەن و، بیدعە دەنێنەوە، ئیبنی مەسعود گوتی: جا چ بکەم؟ فەرموی: دەپرسی چ بکەم؟! گوێڕایەڵی بۆ کەسێك نیە لەخودا یاخی بێ)).[2]

تێبینی دەکرێ، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی نەداوە لەژێر فەرمانی فەرمانڕەوای گوناهکار دەربچین، چونکە رەنگە ئاشوب و خوێنڕشتنی لێبکەوێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا ئەو فەرمانڕەوایانە بەشێوەیەکی گشتی شەرعی خودایان وەرگرتبێ.

لە سونەنی نەسائی و موسنەدی ئیبنیحیبان بەسەنەدێکی صەحیح لە عورفوجە هاتوە: ((ستكون بعدي هنات وهنات، فمن رأيتموه فارق الجماعة، أو يريد أن يفرق أمر أمة محمد كائناً من كان فاقتلوه، فإن يد الله مع الجماعة، وإن الشيطان مع من فارق الجماعة يركض: لە پاشە من خراپەکاری ڕودەدەن، هەرکەسێکی دیتتان لەکۆمەڵ جودا بۆتەوە، یا دەیەوێ کاروباری ئوممەتی موحەممەد لێك جودا و پەرتەوازە بکا، هەرکێ بو بیکوژن. دەستی خودا لەگەڵ کۆمەڵ دایە، شەیتانیش لەگەڵ ئەو کەسەی لە کۆمەڵ جودا دەبێتەوە رادەکات)).[3]

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] هەمان سەرچاوە (٣/٦ ٢١).

[3] صحيح الجامع الصغير: (٣/٦ ٠ ٢).

# جێباسی پێنجەم

## گەندەڵبونی موسڵمانان

باڵابون و سەروەرێتی ئوممەتان بەقەدەر بونی تاکی چاك وەدی دێ كە بەهای بەرز و رەوشتی چاكیان لە خۆدا چەسپاندبێ، بكۆشن بۆ بەرپاكردنی دادگەری و، ڕاست كردنەوەی خوار و خێچی و، چاكردنی گەندی و، ئەوانەش ئەو راسپاردەیان لە ئەستۆ گرت كە ئاسمانەكان و زەوی لەخۆیان رانەدیت هەڵی بگرن،

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً: بەڕاستی ئێمە راسپاردەمان بە ئاسمانەكان و زەوی و كێوەكان نیشان دا و، ئەوان لە هەڵگرتنی ئەو راسپاردە ترسان و خۆیان لێنەدا و، مرۆڤ چوە ژێر باری، بەراستی مرۆڤ ستەمكار و نەزانن ﴾[1]

راسپاردەش ئەو شتانەیە كە خودا ئەسپاردەی بەندانی كردوە لە بڕوا و ئەركباری و، لەوانەش دانەوەی ماڵ و ماڤی بەندان. پێغەمبەر ﷺیش باسی كردوە كە ئەو ئەسپاردەیە بەرز دەكرێتەوە و چین چین هەڵدەگیرێ ر نامێنێ. حوذەیفەش لەسەردەمی خۆی هەستی بە هەندێكی كردبو، ئێستاكەش گەلێك زۆر بوە و، سەردەمێك دێ لەئێستا زیاتر دەبێ.

موسلیم لە صەحیحەكەیدا لە حوذەیفە ؓ دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دو فەرمودەی بۆ گوتین: یەكێكیانم دیوە و چاوەڕێی ئەوی دیكەم، فەرموی:

((إن الأمانة نزلت في جذر قلوب الرجال، ثم نزل القرآن فعلموا من القرآن، وعلموا من السنة، ثم حدثنا عن رفع الأمانة، قال: ينام الرجل النومة، فتقبض الأمانة من قلبه، فيظل أثرها

---

[1] سورة الاحزاب: ٧٢

مثل الوَكْت، ثم ينام النومة، فتقبض الأمانة من قلبه، فيظل أثرها مثل المَجل دحرجته على رجلك، فنفط، فتراه منتبراً، وليس فيه شيء، ثم أخذ حصى فدحرجَهُ على رجله، فيصبح الناس يتبايعون، لا يكاد أحد يؤدي الأمانة، حتى يقال: إن في بني فلان رجلاً أميناً، حتى يقال للرجل: ما أجلده، ما أظرفه، ما أعقله، وما في قلبه مثال حبة من خردل من الإيمان: راسپارده دابەزیوەتە ناخی دڵی پیاوان و، پاشان قورئان دابەزی. جا لە قورئان شارەزابون و لەسوننەت شارەزابون، ئەوجا دەربارەی هەڵگیرانی راسپاردە قسەی بۆکردین و فەرموی: پیاو خەوێکی لێدەکەوێ، راسپاردەی لە دڵی دەستێنرێ، بۆیە پەڵەو شوێنەوارێکی وەك خاڵێك جێ دەهێڵێ. پاشان خەوێکی دی لێدەکەوێ و راسپاردەی لە دڵی دەستێنرێ، شونەکەی وەك پۆرگێکی لێ دێ کە لەپێی هاتبێ و تەقێنرابێ و پوچ بوبێتەوە و هیچی تێدا نەمابێ. ئەوجا بەردێکی هەڵگرت و بەسەر پێی خۆیدا گلۆری کردەوە. جا خەڵکی وایان لێدێ راسپاردان بەجێ ناگەیەنن، دەگاتە رادەیەك کە دەگوترێ: لە فلان خانەوادەی پیاوێکی دەستپاك هەیە ئەسپاردان دەداتەوە. تا بە پیاوێك دەڵێن: چەند پتەو و خۆراگر و، رێکوپێك و، ژیرە، لەگەڵ ئەوەی تۆزقاڵێك بروای لە دڵیدا نیە)) حوذەیفە دەڵێ: (کاتێکیش بەسەر مندا هات، گوێ نەدەمێ بەیعەتم داوەتە کێ، ئەگەر موسڵمان بێ دینەکەی وای لێ دەکا حەقی من بگێڕێتەوە، ئەگەر گاور و جولەکەش بێ ساعیەکەی لەمنی دەگێڕێتەوە، ئەمڕۆش لە فلان و فلان بترازێ بەیعەت نادەمە کەستان).[1]

مرازی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، راسپاردە دابەزیوە بۆ رەگی دڵی پیاوان، واتە لە ناخیدا رەگی داکوتاوە، پاشان راسپاردە دەستێنرێتەوە و تەنیا شوێنەوارەکەی دەمێنێ.

---

[1] رواه مسلم، كتاب الإيمان، باب رفع الأمانة: (١/١٢٦)، ورقمه: (١٤٣).

## جێباسی شەشەم

# کە کەنیزەك گەورەی خۆیان لێ دەکەوێتەوە و شوانەوێرەی پێخواس و روت تەلاران بنیات دەنێن

**موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەگێڕتەوە، لەبارەی هاتنی جیبریل بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەوێنەی پیاوێك کە جلێکی زۆر سپی لەبەربو، موی یەکجار ڕەش بو، لەبابەت ئیسلام و بڕوا و چاکەکاری پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و ئەویش وەرامی داوە. پاشان دەربارەی قیامەت پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەرﷺیش فەرموی:** ((ما المسؤول عنها بأعلم من السائل، قال فأخبرني عن أماراتها، قال: أن تلد الأمة ربتها، وأن ترى الحفاة العراة رعاء الشاة يتطاولون في البنيان: **پرسیارلێکراو زاناتر نیە لەوەی کە پرسیارەکە دەکات. گوتی: کەواتە باسی نیشانەکانیم بۆ بکە. فەرموی: ئەگەر کەنیزەك گەورەی خۆی لێ ببێ و، شوانەوێرەی پێخواس و روت لەبنیاتنانی تەلاراندا سنور ببەزێنن)).**[1]

**ئیبنی عەبباسیش بەم شێوەیە وەرامەکەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕتەوە:** ((إذا رأيت الأمة ولدت ربتها أو ربها، ورأيت أصحاب الشاة يتطاولون في البنيان، ورأيت الحفاة الجياع العالة كانوا رؤوس الناس، فذلك من معالم الساعة وأشراطها: **ئەگەر دیتت کەنیزەك گەورەی خۆی لێبکەوێتەوە و، خاوەن مێگەلْ لەبنیاتی تەلاران سنوربەزێنی بکەن و، پێخواسی برسی باری سەر خەڵکی ببنە سەرکردە، ئەوانە لە نیشانەکانی قیامەتن)).**

**گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خاوەن مێگەلْ و پێخواسی برسی باری سەرخەڵکی کێن؟ فەرموی ((العرب: عەرەبن)).**[2]

---

[1] رواه مسلم في صحيحه انظر جامع العلوم والحكم: ص٢١.

[2] أخرجه الإمام أحمد في مسنده (١/٣١٨-٣١٩)، وقال الشيخ ناصر فيه بعد أن ذكر إسناده: وهذا إسناد لا ←

ئیبنی ڕەجەب لەبارەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: (ئەو نیشانانەی قیامەت کە لەم فەرمودەیەدا هاتون، ناوەڕۆکەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کاروبار دەدرێتە دەست کەسی نەشیاو و ناشایان، هەروەك پێغەمبەر ﷺ لەوەرامی ئەو کەسەی لەبارەی قیامەتیێ پرسیاری لێکرد، فەرموی ((اذا وسد الأمـــر الى غـير اهلــه فـانتظر السـاعة: ئەگەر کاروبار درا دەست کەسی نەشیاو، چاوەڕێی قیامەت بە)). جا ئەگەر پێخواسی ڕوت و قوتی شوانەوێرەی مێگەلان، کە نەزان و نەفام و کەللە ویشك و ڕەقن، ببنە سەرکردەی خەڵکی و خاوەن ماڵ و سامانی زۆر تا دەستدرێژی و سنوربەزێنی لەبنیاتنانی تەلارانـدا بکەن، بەم شێوەیە سیستمی ژین و دین تێك دەچێ).[1]

کە دەشفەرمێ: ((ان تلد الأمـــة ربتـــها: کەنیزەك گەورەی خۆیان لێدەبێ و لێیان دەکەوێتەوە))؛ زانایان دەڵێن مراز بەوەی، زۆربونی کەنیزەکانە کە منداڵیان لە گەورە و خاوەنەکانیان دەبێت، جا ئەو منداڵانە دەچنە پلەو پایەی باییان و دەبنە گەورەی دایکیان. چونکە ماڵی مرۆڤ بۆ منداڵیەتی و دەتوانێ وەکو خاوەن ماڵ هەڵسوکەوتی تێدا بکا. جا بە مۆڵەتی ڕاستەوخۆی باوکی بێ یا بە عورف ڕاهاتن و بەکارهێنان. دەشڵێن مانای وایە کەنیزەك پاشایان لێدەکەوێتەوە، جا دایك وەبەر تێکڕای ڕەعیەت دەکەوێت و ئەم دەبێتە گەورەی خەڵکی و گەورەی داکیشی[2]. ئەمەش هەموی ڕویدا، گەلێك ئازاد لە کەنیزان کەوتنەوەو، لە ڕوی شەرعیشەوە ئاشکرایە کە ئەو منداڵانەی لە کەنیزان دەکەونەوە، ئازادن، بەم شێوەیە کەنیزەك گەورەی خۆی لێکەوتەوەو، هەندێکیش لەوانە گەیشتە موڵك و پاشایەتی.

---

بأس فيه في الشواهد، سلسلة الأحاديث الصحيحة، (٣٣٢/٣)، حديث رقم: (١٣٤٥).

[1] جامع العلوم والحكم، لإبن رجب: ص٣٩.

[2] شرح النووي على مسلم: (١٥٨/١).

## جێباسی حەفتەم

# پەلاماری ئوممەتان بۆ ئوممەتی ئیسلامی

**یەکێك لە نیشانەکانی رۆژی دوایی بەدەرخستنی دژایەتی ئوممەتە کافرەکانە لەم ئوممەتە، لە فەرمودەدا لە ثەوبان هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((یوشك الأمم أن تداعى عليكم، كما تداعى الأكلة إلى قصعتها، فقال قائل: ومن قلة نحن يومئذ؟ قال: بل أنتم يومئذ كثير، ولكنكم غثاء كغثاء السيل، ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم، وليقذفن الله في قلوبكم الوهن، فقال قائل: يا رسول الله وما الوهن؟ قال: حب الدنيا وكراهية الموت: **نێزیك بوە ئوممەتان پەلامارتان بۆ بێنن و تێتانوروکێن، هەروەك بخۆر پەلامار دەداتە خواردنەکەی. یەکێك گوتی: ئەو رۆژی لەبەر کەمیمانە وامان لێدێ؟ فەرموی: بەڵکو ئێوە لەو رۆژەی زۆرن، بەڵام وەکو کەف سەرئاوێ وان، خودا ترسی ئێوە لە دڵی دوژمنتان دەردێنی و، لاوازیش دەخاتە دڵی ئێوە، یەکێك گوتی: لاوازی چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: خۆشەویستی دونیا و رکبونەوە لە مردن)).[1]**

**جا بە درێژایی مێژو پتر لە جارێك ئەمە رویداوە، کاتێك ئوممەتەکانی خاچپەرستان لەم ئوممەتە ئالان و پەلاماریان دا، جارێکی دیکەش تەتەرەکان هێرشیان هێنا سەر جیهانی ئیسلامی و داگیریان کرد، بەڵام ئەم پێشبینیەی پێغەمبەر ﷺ لەم سەدەی دواییدا بەشێوازێکی رون و ئاشکراتر وەدیهات، کاتێك خاچپەرست و جولەکە و بێدینان تێکرا رێکەوتن تا خەلافەتی ئیسلامی بروخێنن و، پاشان ئەو وڵاتانەیان بەشبەش کرد کە موسڵمانان فەرمانرەواییان تێدا دەکردن و، وڵاتانی موسڵمانانیان لەنێوان خۆ دابەش کرد و، فەلەستینیان دایە جولەکان، جا**

---

[1] الحديث بمجموع طرقه صحيح، كما قال الشيخ ناصر، وقد عزاه إلى أبي داود، والروياني، وابن عساكر، وأحمد في مسنده، وأبو نعيم في (الحلية) وغيرهم (سلسلة الأحاديث الصحيحة): (٦٨٤/٢)/ حديث رقم (٩٥٨).

موسلمانان ویلتر بون لە هەتیوی سەرخوانی ناکەس و سپلان، تا ئەمرۆش هێزە شەرخوازەکان لە هەولی دارماندنی ئەم ئوممەتە و هەلمژینی خێروبێرەکەیدان، دەیانەوێ سامانەکانی بدزن و، پیاوەکانی زەبون کەن. ئوممەتی ئیسلامیش ملکەچ و زەبونە و، ئەو زۆریەی بە کەلکی نایە، چونکە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: وەك کەفی سەرئاوێ وان، لەبەر خۆشەویستی دونیا و رق بونەوە لە مردنێ.

## نهێنی لەم پەلاماردانە

یەکگرتن و دەستگرتنی ئەم ئوممەتە بە ئاینەکەی لەمپەرێکە لەبەردەم تەماع و چاوچنۆکی دوژمنانی. هەرچەندە فێلێ و تەلەکەی دوژمنان زۆربێ و بەهێزبن، تا ئەم ئوممەتە یەکگرتو بێ بەسەریدا زال نابن.

لە فەرمودەیەکدا کە ثەوبان دەیگێرتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة عامة، وأن لا يسلط عليهم عدواً من سوى أنفسهم، فيستبيح بيضتهم، وإن ربي قال: يا محمد، إني إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد وإني أعطيتك لأمتك أن لا أهلكهم بسنة عامة، وأن لا أسلط عليهم عدوا من سوى انفسهم يستبيح بيضتهم، ولو إجتمع عليهم من بأقطارها، حتى يكون بعضهم يهلك بعضاً، ويسبي بعضهم بعضاً: هەروەها لە پەروەردگارم پاڕامەوە ئوممەتەکەم بەقات و قڕیەکی گشتی لەناونەبا و، بێجگە لە خۆیان چ دوژمنێکیان بەسەردا زال نەکا تا مولکیان لێ بستێنی و کۆمەلیان پەرتەوازە بکا. جا پەروەردگارم فەرموی: ئەی موحەمەد، هەرگیز قەزای من گەڕانەوەی بۆ نیە. ئەوەت پێببەخشم کە ئوممەتەکەت بە قات و قڕی گشتی لەنێونەبەم و، بێجگە لە خۆیان چ دوژمنێکیان بەسەردا زال نەکەم تا مولکیان لێ بستێنێ و کۆمەلیان پەرتەوازە بکا، هەرچەندە لە ولاتانیش لێی کۆببنەوە، هەتاکو خۆبەخۆ یەکتر لەنێو دەبەن و، یەکتری دەکەنە کۆیلە و کەنیزەك)).[١]

جا لەم فەرمودە پیرۆزەڕا دیارە، یەکگرتنی ئوممەت مایەی پاراستنێتی لە چنگ دوژمنانی، بەلام ئەگەر تێکبەربون و ناکۆکی و ناتەبایی و لێکداپڕانیان تێکەوت،

[١] رواه مسلم في صحيحه، باب هلاك هذه الأمة بعضهم ببعض، (٢/٢٢١٥) حديث رقم (٢٢٨٩).

خـودا دوژمنـانی بەسـەردا زاڵ دەکـا. ئەمـەش دەرەنجـامێکی ئاسـاییە، چونکـە لـەم حاڵەتـەدا هێزەکـەی ئاڕاسـتەی دوژمنـان نـاکرێ، بـەڵکو لـە دژی خـۆی بـەکاردێ و هەربەخۆی خۆی دادەڕوخێنی و، دوژمنانیش چاوی تەماعی تێدەبڕن.

## جێباسی هەشتەم

## ئەو نغرۆکردن و بەردباران و بەسەگسار کردنەی کە خودا کۆمەڵانێکی ئەم ئوممەتەی پێ سزا دەدا

ئەم ئوممەتە دوچاری گەلێك بەڵایان دێ لە نغرۆبون و بەردباران و سەگساربون، بەهۆی گوناهکاری و تاوان و یاخیبونی ئاشکرا، وەك مەی خواردنەوە و ئاوریشم پۆشینی پیاوان و، داوێنپیسی و، سوخۆری و، گەندەڵی وا کە دەگاتە ڕادەی حەڵاڵ کردنی حەرام.

بەسەنەدێکی صەحیح لە موعجەمی گەورەی طەبەرانیدا هاتوە، لەسەهلی کوڕی سەعد، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((سيكون في آخر الزمان خسف وقذف ومسخ، إذا ظهرت المعازف والقينات، وإستحلت الخمر: لە ئاخیر زەماندا نغرۆبون و بەردباران و بونە سەگسار ڕودەدەن، ئەگەر ئامێری مۆسیقا و ئافرەتی گۆرانی بێژ دەرکەون و، مەی حەڵاڵ بکرێ)).[1]

ئیبنی ماجە بەم بێژەیە لە عەبدوڵڵای دەگێڕتەوە ((بين يدي الساعة مسخ و خسف و قذف: لەبەردەم ڕۆژی قیامەتێدا، بون بە سەگسار و نغرۆبون و بەردباران هەیە)).

جا ئەم فەرمودەیە گەلێك فەرمودەی دیکەشی پاڵپشتن، لەوانە ئەو فەرمودەی عائیشە کە تیرمذی دەیگێڕتەوە: ((يكون في هذه الامة خسف و مسخ و قذف:

[1] رواه الطبراني في معجمه (الكبير والأوسط) عن أبي سعيد، ورواه الترمذي عن عمران بن حصين، أنظر ←

ئەم ئوممەتە نغرۆبون و بونەسەگسار و بەردبارانی تێدا رودەدات))، عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لەنێودەچین لەکاتێکدا کە پیاوچاکانشیمان لە نێودایە؟! فەرموی: ((نعم، اذا ظهر الخبث: بەڵێ، ئەگەر پیسی دەرکەوت)).

هەروەها ئەو فەرمودەیەی عیمران کە لە فەرمودەکەی عائیشە نێزیکە، بەڵام ئەوەی تێدا هاتوە کە: (پیاوێك لە موسڵمانان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا کەینێ ئەمە رودەدا؟ فەرموی: ((اذا ظهرت القينات و المعازف، و شرب الخمور: ئەگەر ئافرەتی گۆرانی بێژ و ئامێرەکانی مۆسیقا دەرکەوتن و، مەی خوراوە)).[1]

ئەبو نوعەیم لە (اخبار اصبهان) دەگێڕتەوە بەسەنەدەکەی تا ئیبنی عەبباس، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ليبيتن أقوام من هذه الأمة على طعام وشراب ولهو، فيصبحوا قد مسخوا قردة وخنازير: کۆمەڵانێك لەم ئوممەتە لەسەر خواردن و خواردنەوە و رابواردن شەو بەسەردەبەن، سبەینەیان لێدادێ بونەتە سەگسار و وێنەی مەیمون و بەرازانیان وەرگرتوە)).[2]

بوخاری دەگێڕتەوە؛ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ليكونن من أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير والخمر والمعازف، ولينزلن أقوام الى جنب علم، يروح عليهم بسارحة لهم، يأتيهم لحاجة، فيقولون: إرجع إلينا غداً، فيبيتهم الله، ويضع العلم، ويمسخ آخرين قردة وخنازير إلى يوم القيامة: کۆمەڵانێك لە ئوممەتی من هەڵدەکەون کە مرۆڤی ئازاد و ئارموش و مەی و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن، کۆمەڵە قەومێکیش لەپاڵ ئالا هەڵدەدەن، گاوان و شوانیان بەڕانەوە بەسەردا دەگەڕێن، بۆ پێداویستیەك دێنە لایان، دەڵێن: سبەی وەرەوە لامان، جا خودا شەویان بەسەردادێنی و، ئالاکە دادەگرێ و، ئەوانی تریش تا رۆژی دوایی دەکاتە سەگسار و شێوەیان دەکاتە مەیمون و بەران)).[3]

---

(صحيح الجامع الصغير): (٣/٣١٦) حديث رقم (٣٥٥٩).

اخرجه الترمذي: أنظر الكلام على روايات الحديث في: سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٢٩٣) حديث رقم (١٧٨٧).

[2] أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/١٣٥)، حديث رقم (١٦٠٤).

[3] رواه البخاري تعليقاً عن ابي عامر وابي مالك، وقد وصل الحديث الطبراني والبيهقي وابن عساكر وغيرهم،

لەو ڕۆچون و نغرۆبونە گەورانەش کە لە نێزیك قیامەتێ ڕودەدەن: نغرۆبونی سوپایەکی تەواوە لە ئاخیرزەماندا، هەروەك لەو فەرمودەیەدا هاتوە کە ئەحمەد و حەمیدی لە بوقەیرەی خێزانی قەعقاعی ئیبنی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی دەیگێڕنەوە، دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرمو: ((یاهؤلاء، اذا سمعتم بجیش قد خسف به قریبا، فقد اظلت الساعة: هۆ خەڵکینە، ئەگەر بیستتان سوپایەك لەو نێزیکانە نغرۆ بوە، ئەوا قیامەت نزیك بۆتەوە و سێبەری کردوە)).[1] جا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ لەو نێزیکانە ڕەنگە مەبەستی ئەو سوپایە بێ کە لە نێزیك شاری مەدینە نغرۆ دەبێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی هەندێك شوێنی بۆ کردوین کە ڕۆچون و بەردبارن و بەڕموزن بونیان تێدا ڕودەدات.

لەسونەنی ئەبو داود بەسەنەدێکی صەحیح لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یا أنس، إن الناس یمصرون أمصارا، فإن مصراً یقال له: البصرة، فإن أنت مررت بها أو دخلتها، فإیاك وسباخها وكلأها ونخیلها وسوقها وباب أمرائها، وعلیك بضواحیها، فإنه یكون بها خسف وقذف ورجف، وقوم یبیتون ویصبحون قردة وخنازیر: هۆ ئەنەس، خەڵکی شار و وڵاتان ئاوەدان دەکەنەوە، شارێك دەبێ پێی دەڵێن: بەصرە، ئەگەر تو پێیدا تێپەڕی یا چویە ناوی، نەکەی لە بەیار و لێواری ئاوەکانی و لە دارخورما و لەبازاڕ و لەدەرگەی فەرمانڕەوای نێزیك ببیەوە، بەڵکو هەر لەدەوروبەریدا بە، چونکە نغرۆبون و بەردباران و لەرزینی تێدا ڕودەدا و، خەڵکانێك تێیدا شەو بەسەردەبەن، سبەینێ هەڵدەستن بونەتە مەیمون و بەراز)).[2]

---

وإسناده صحیح وقد أخطأ ابن حزم تضعیفه للحدیث؛ انظر سلسلة الأحادیث الصحیحة: (١/١٣٩)، حدیث رقم (٩١).

[1] سلسلة الأحادیث الصحیحة: (٣/٣٤٠)، حدیث رقم (١٣٥٥).

[2] مشکاة المصابیح: (٣/١٩) ورقم الحدیث: (٥٤٣٣).

## جێباسی نۆیەم

# زۆربونی ماڵ و سامان

زۆربونی پارەو ماڵ یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، تا دەگاتە ڕادەیەك پیاو سەد دیناری زێڕینی دەدرێتێ و هێشتا بەکەمی تێدەگا و، دەوڵەمەند و ساماندار بە دوای هەژارێکدا دەگەڕێ خێری لێ وەرگرێ کەس نابینێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ لەغەزای خەیبەر بەعەوف کوڕی مالکی فەرمو: ((اعدد ستا بین یدي الساعة: شەش شتان بژمێرە کە لە پێش هاتنی قیامەت ڕودەدەن)). یەکێك لەوانە: ((استفاضة المال، حتى يعطي الرجل مائة دينار فيظل ساخطا: زۆربونی پارە و سامان، تاکو وای لێدێ پیاو سەد دیناری دەدرێتێ هێشتا هەر ناڕازی و زویرە)).[1]

لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبو هورەیرە ؓ، لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە: ((لا تقوم الساعة حتى يكثر فيكم المال، فيفيض حتى يهم رب المال من يقبل منه صدقة، ويدعى إليه الرجل، فيقول لا إرب لي فيه: قیامەت هەڵناستێ هەتا ماڵتان زۆر دەبێ و هێند زیاد دەکات تا خاوەنی ماڵ خەمبار دەبێ داخوا کێ خێرێکی لێ قبوڵ دەکا، کە دەیداتە پیاوێك دەڵێ: هیچ پێویستیم پێ نیە)).[2]

حاریثەی کوڕی وەهەب دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم بیست دەیفەرمو: ((تصدقوا، فيوشك الرجل يمشي بصدقته، فيقول الذي أعطيها: لو جئتنا بالأمس قبلتها، فأما الآن، فلا حاجة لي بها، فلا يجد من يقبلها: خێربکەن، هێندەی نەماوە پیاو خێرەکەی بۆ یەکێك ببا، ئەویش پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتبای وەرم دەگرت، بەڵام ئێستا

---

[1] رواه البخاري في صحيحه في كتاب الجهاد، باب ما يحذر من الغدر؛ انظر جامع الأصول (١٠/٤١٢).

[2] رواه مسلم، كتاب الزكاة، باب الترغيب في الصدقة قبل ان لا يوجد من يقبلها، حديث رقم(١٠١٢)(٢/٧٠١).

پێویستم پێی نیە، ئیتر کەسی دەست ناکەوی لێی قبول کا)).[1]

وادیارە ئەمەش لە زیاتر لەسەردەم و کاتێکدا ڕودەدات، هەروەك لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ ڕویدا. یەعقوبی کوڕی سوفیان لە مێژوەکەیدا لە ڕێگەی عومەری کوڕی ئوسەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەطاب، دەڵێ: (سوێند بە خوا کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کۆچی دوایی کرد، گەیشتبوە رادەیەك پیاو هەبو ماڵ و سامانێکی زەبەندی دەهێنا و دەیگوت بەسەر هەژارانی دابەش کەن. هێندەی نەدەبرد دەبوا ماڵەکەی خۆی بباتەوە، بیری دەکەوتەوە بیانداتە کێ. بەلام نەیدەدیتنەوە و دەهاتەوە، بەڕاستی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خەڵکی دەوڵەمەند کرد).[2]

هەروەها لەباسی مەهدیدا، ئەوان فەرمودان دێنینەوە کە باسی خەلیفەیەك دەکەن، چنگ لە پارە دەدا و نایژمێرێ. لەکاتی باسکردنی عیساش ئەو فەرمودانە دێنینەوە کە لەوە دەدوێن پارە و سامان لەسەردەمی وی بەڕادەیەك زۆر دەبێ؛ کەس وەریناگرێ.

[1] هەمان سەرچاوە؛ حدیث رقم(١٠١١)(٢/٧٠٠)، ورواه البخاري؛ كتاب الفتن،؛ فتح الباري(١١/٨١)؛ واللفظ للمسلم.

[2] فتح الباري(١٣/٨٣)

جێباسی دەیەم

## سڵاوکردن لەکەسانێکی تایبەت
## بڵاوبوونەوەی بازرگانی
## پچڕاندنی پەیوەندی خزماتی

ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا بەسەنەدێکی صەحیح لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن بين يدي الساعة تسليم خاصة، وفشو التجارة، حتى تعين المرأة زوجها على التجارة، وقطع الأرحام، وشهادة الزور، وكتمان شهادة الحق، وظهور القلم: لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی سڵاو لە کەسانێکی تایبەت دەکرێ و، بازرگانی بڵاودەبێتەوە تا وای لێدێ ژن یارمەتی مێردەکەی دەدا لە بازرگانیدا و، پەیوەندی خزماتی دەپچڕێ و، شایەدی درۆدەدرێ و، شایەدی ڕاست و ڕەوا دەشاردرێتەوە و، پێنوسیش دەردەکەوێ)).[1]

مرازی پێغەمبەر ﷺیش بەوەی کە سڵاو لەکەسانێکی تایبەت دەکرێ ئەوەیە کە موسڵمان تەنیا سڵاو لەو کەسانە دەکا کە دەیانناسێ، هەروەك لە فەرمودەیەکی دیکەدا هاتوە. کە ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا هەر لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن من أشراط الساعة إذا كانت التحية على المعرفة: یەکێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە سڵاو تەنها لە ناسیاران بکرێ))، لەریوایەتێکی دیکەشدا هاتوە: ((أن يسلم الرجل على الرجل لا يسلم عليه إلا للمعرفة: کە پیاوێك دەگاتە پیاوێکی دیکە تەنیا لەبەر ناسیاری سڵاوی لێ دەکا))[2].. جا ئەمەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین هەموی پێشتر ڕوی دایە، لەم سەردەمەی ئێمەشدا دیاردەیەکی بینراو و بەرچاوە، ڕۆژ بە ڕۆژیش لە زێدە بوندایە، خودا هاریکارمان بێ.

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٢٥٠)، حديث رقم (٦٤٧).

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٢٥٢)، حديث رقم (٦٤٨).

## جیباسی یازدەم

# لاسەنگ بونی پێوەرەکان

پێغەمبەر ﷺ پێ ڕاگەیاندوین کە ئەو پێوەرانەی پیاوان هەڵدەسەنگێنن بەر لەهاتنی قیامەت لاسەنگ و شپرێو دەبن: جا درۆ بەراست وەردەگیرێ و راستیش بە درۆ دادەنرێ و ڕەت دەکرێتەوە، ماڵ و ناموس ئەسپاردەی ناپاك و دەستپڕان دەکرێ و، دەستپاك و راست کردارانیش بەناپاکی تۆمەتبار دەکرێن و، پیاوی نابوت و ناکەس قسان دەکەن کە بۆ هەمو خەڵکی گرنگن، ئەوجا بێجگە لە ڕاو بۆچونی پوچ هیچی دیکە نادەن و، بۆ رێچکەی خوار و خێچ نەبێ رێبەدی ناکەن.

ئەحمەدی پێشەوا و ئیبنی ماجە و حاکیم تەخریجیان کردوە لە ئەبو هورەیرە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((سيأتِ على الناس سنوات خداعات، يُصَدَّق فيها الكاذب، ويُكذَّب فيها الصادق، ويؤتمن فيها الخائن، ويخوَّن فيه الأمين، وينطق فيها الرويبضة: چەند ساڵێکی خەڵەتێن بەسەر خەڵکیدا دێن، تێیدا درۆزن بەراستگۆ دادەنرێت و، راستگۆش بە درۆزن دادەنرێ، ناپاك بەسەرڕاست و دەستپاك دادەنرێ و، پاك و راست کرداریش بە ناپاك دادەنرێ، بودەڵەش قسان دەکەن)).

گوتیان: بودەڵە (الرويبضة) چیە؟ فەرموی ((الرجل التافه، يتكلم في امر العامة: پیاوی سوك و نابوت کە قسە لە کاروباری گشتیدا دەکات)).[1]

جا هەرکەسێکی لەباری جیهانی ئەمڕۆمان ڕادەمێنێ، دەبینێ وا لەو سەردەمەیدا دەژین کە پێغەمبەر ﷺ باسی فەرموە، درۆی بێباوەڕان و هاوبەش دانەران کە ئاژانسی هەواڵ و رادیۆ و تەلەفزیۆنیان هەن، بەڕاست دادەنرێ و بڵاودەکرێتەوە. کەچی ڕاستگۆ و دادوەران وە درۆ دەخرێنەوە. ئوممەتی ئیسلامیش ماڵ و سامانی دەخاتە دەست ناپاکە بێبڕواکان و، کامەی نابوت و بودەڵەو هیچیشن بونەتە پیاوی مەیدان و قسان لەکاروباری دونیادا دەکەن و سەرکردایەتیش لە دەست ئەو ملهوڕانەیە و، جیهان بەرەو هەڵدێرێکی وا دەبەن هێندەی نەماوە سەرپاکی مرۆڤایەتی تێبچێ.

---

1 سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٥٠٨)، حديث رقم (١٨٨٧).

## جێباسی دوازدەم

### هەیتە( شرطة )ی ئاخیرزەمان کە بەقامچی لە خەڵکی دەدەن

لە ئاخیر زەماندا ستەم زۆر دەبێ، تەنانەت ئەو پیاوانەی کە ئاسایشیان ئەسپاردە دەکرێ تا رێ لەستەم بگرن، خۆیان گەند دەبن و، دەبنە ستەمکار کەوا بەقامچییەکانیان لەپشتی بەندەکان دەدەن. دیارە ئەمەش بۆتە دیاردەیەکی دیار لە جیهانی ئیسلامیدا.

ئەحمەد و حاکیم و طەبەرانی لەموعجەمی گەورەدا، بەسەنەدێکی صەحیح لە ئەبو ئومامە دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((يكون في آخر الزمان رجال معهم سياط كأذناب البقر، يغدون في سخط الله، ويروحون في غضبه: لەئاخیر زەماندا پیاوانێك پەیدا دەبن، قامچیان پێیە وەکو کلکی چێڵ وایە، کە دێن خودا لێیان زویرە و کە دەڕۆن لێیان تورەیە)).[1]

هەواڵ و چارەنوسی ئەمانەش لە صەحیحی موسلیمدا باس کراوە، ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((صنفان من أهل النار لم أرهما؛ قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس. ونساء كاسيات عاريات، مميلات، مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة، ولا يجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا: دو کۆمەڵ هەن لە دۆزەخیان من نەمدیتون؛ کۆمەڵێك قامچی وەکو کلکەچێڵیان لە دەستە، پێی لە خەڵکی دەدەن، لەگەڵ کۆمەڵە ژنێکی پۆشتەی ڕوت، کە خۆبادەدەن و سەرنجان بۆ لای خۆ وەردەسوڕێنن، سەریان وەك کۆپەرانی خواری حوشتر وایە، ناچنە بە هەشت و، بۆنیشی ناکەن، بۆنی بەهەشتیش لە دوری ئەوەندە و ئەوەندە ڕێیەوە دێ)).[2]

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٥١٧)، حديث رقم (١٨٩٣).

[2] صحيح مسلم: (٤/١٦٨٠) ورقم الحديث (٢١٢٨).

## بەندی چوارەم

# ئەو نیشانانەی هێشتا رویان نەداوە

## جێباسی یەکەم

### دورگەی عەرەبی ببێتەوە باخ و ڕوبار

ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة حتى يكثر المال ويفيض، حتى يخرج الرجل زكاة ماله، فلا يجد أحداً يقبلها، وحتى تعود أرض العرب جنات وأنهارا: قیامەت هەڵناستێ هەتا ماڵ زۆر دەبێ و لەڕادە دەردەچێ. تاوا ﷺ لێدێ پیاو زەکاتی ماڵەکەی دەرێنێ و یەکێك نابێ لێی وەرگرێ، هەتا خاکی عارەبان دەبتەوە باخ و روبار)).[1]

جا یا بەهۆی هەڵکەندنی بیر و ئاوەڕۆ و کشتوکاڵ کردنی دەبێتەوە باخ و ڕوبار، هەروەك ئێستا ڕودەدا، یان بەهۆی گۆڕانی کەش و هەوا، ئەگەر کەشی گەرمی ئەوێ ببتە کەشێکی خۆش و فێنك و، خوای وەدیهێنەر ڕوبار و کانیاوی تێدا بتەقێنتەوە و، لەوشکە خاکەوە بیکاتە زەویەکی بە پیت و ڕێژەن و، دەشتە ویشك و برینگەکانی بکاتە مێرگی گیاجاڕ و بە پیت و فەڕ، زێتریش وێدەچێ وابێ، چونکە فەرمودەکە باسی بارێك دەکا، دورگەکە دێتەوە سەرباری جارانی.

---

[1] رواه مسلم؛ مشكاة المصابيح: (٣\٢١) حديث رقم: (٥٤٤٠).

## جێباسی دووەم

# هەڵاوسانی مانگ

یەکێکی دی لە نیشانەکانی نێزیك بونەوەی قیامەت ئەوەیە، کە مانگ لەسەرەتای هەڵاتنی گەورە بێتە بەرچاوان و، لەساتی دەرکەوتنیدا وەکو مانگی دو شەوە و سێ شەوە بێت.

لە ئیبنی مەسعود ﷺ هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من إقــــتراب الســـاعة إنتفاخ الأهلة: هەڵاوسانی مانگ لە نیشانەکانی نزیك بونەوەی قیامەتە))[1].

لەئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((من إقتراب الساعة أن يرى الهلال قَبَــلاً، فيقال: لليلتين وأن تتخذ المساجد طرقا، وأن يظـــهر مـــوت الفجـــأة: نیشانەی نێزیك بونی قیامەتە ئەگەر مانگی نوێ وەکو دوشەوەی لێهات و، مزگەوت کرانە رێگە و، مردنی لەناکاو پەیدابو)).[2]

[1] أورده الشيخ ناصرالدين الألباني في صحيح الجامع الصغير (٥/٢١٣)، حديث رقم (٥٧٧٤)، وقال صحيح الإسناد. وعزاه الى الطبراني في معجمه الكبير، وأخرجه غيره من كتب السنة عن أبي هريرة.

[2] عزاه في صحيح الجامع (٥/٢١٤) حديث رقم (٥٧٧٥) إلى الطبراني في الأوسط، وقال: إسناده حسن.

## جیباسی سێیەم

# ئاخاوتنی دڕندە و بێگیان لەگەڵ مرۆڤ

**ئەحمەدی پێشەوا لە موسنەدەکەی لە ئەبو سەعیدی خودری، دەگێڕتەوە؛ گوتی:**

**(گورگێك لە ڕانەمەڕێکی داو، کاوڕێکی ڕفاند. شوانەکە دوای کەوت و، لێی ستاندەوە. گورگەکە لەسەر کلکی هەڵکوڕماو، گوتی: ئەدی لە خوای ناترسێی ئەو ڕۆزیەم لێدەستێنی کە خوا بۆی هەناردوم، شوانە گوتی: زۆر سەیرە، گورگێك لەسەر کلکی هەڵکوڕماوە و بەزمانی ئادەمیان دەمدوێنی. گورگەکە گوتی: شتێکی سەیرترت پێنەڵێم! موحەممەد ﷺ لە یەثریبەوە، هەواڵی ڕابردوان بەخەڵکی دەڵێ.**

**دەڵێ: جا شوانەکە مەڕەکەی خۆی بەپێش خۆیدا، تا هاتە نێو مەدینە و، لەپەڕگە(زاویە)کی خڕی کردنەوە، ئەوجا هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕاوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بانگ ڕادێرن، پاشان هاتە دەر و، بە شوانەکەی فەرمو: ((اخبرهم: بۆیان بگێڕەوە))، ئەویش بۆی گێڕانەوە. ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((صدق، والذي نفسي بيده لا تقوم الساعة حتى يكلم السباع الإنس، ويكلم الرجل عذبة سوطه، وشراك نعله، ويخبره فخذه بما حدث أهله بعده: **ڕاست دەکا. سوێند بەوەی گیانی منی وەدەستە قیامەت هەڵناستێ هەتا دڕندەکان مرۆڤ دەدوێنن و، دەسکی قامچی پیاو و قەیتانی پێڵاوی قسەی لەگەڵ دەکەن و، ڕانی خۆی پێی دەڵێماڵەکەی لە پاشەوی چیان کردوە)).**[1]

---

[1] إسناده صحيح، وأخرجه إبن حبان والحاكم مفرقاً، وقال: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي. وأخرج الترمذي منه قوله: ((والذي نفسي بيده...)) وقال: حديث حسن، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني، حديث رقم (١٢٢).

جا رەنگە ئەم هەواڵەی پێغەمبەر ﷺ شتێکی دەراسا(خارق للعادة) و، ناوازە بێ. هەروەك ئەندامەکانی مرۆڤ کە لە رۆژی قیامەتێدا شایەدی لێ دەدەن:

﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُون: ئەمڕۆ مۆر لە زاریان دەدەین و، دەستیان قسەمان لەگەڵدا دەکەن و قاچەکانیاز شایەدی دەدەن بەوەی کردویانە)).[1]

﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ: بە پێستی لەشیان دەڵێن: بۆچی شایەدیتان دژی ئێمەدا، ئەوانیش دەڵێن: ئەو خوایەی هەمو شتێك دێنێتە قسە، ئێمەی وەقسە هێنا﴾[2].

دەشبێ ئەم هەواڵە باسی ئەو ساتەبێ کە مرۆڤ لەزانست و داهێنان دەیگاتێ. بەشێویەك لە زمانی ئاژەڵان بگەن و بێگیان وەزمان بێنن. هەروەکو ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و کە شتی تازە داهاتون.

---

[1] سورة يس: ٦٥

[2] سورة فصلت: ٢١

# جێنباسی چوارەم

## دەرکەوتنی کێوێکی زێڕین لە ڕوباری فورات

بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیان دەگێڕنەوە، لە ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یوشك الفرات أن يحسر عن كنز من ذهب، فمن حضره فلا يأخذ منه شيئاً: هێندەی نەماوە فورات گەنجینەیەکی زێڕ دەربخات، جا ئەوی گەیشتە سەری با هیچی لێ نەبا)). لە گێڕانەوەیەکی تریشدا هاتوە ((يحسر عن جبل من ذهب: کێوێکی زێڕین دەربخا)).

لەگێڕانەوەکی لای موسلمیش: ((لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه، فيقتل من كل مائة تسعة وتسعون، ويقول كل رجل منهم لعلي أكون انا الذي أنجو: قیامەت دانایێ هەتا فورات کێوێکی زێڕ دەردەخا و خەڵکی شەڕی لەسەردەکەن و، لە هەر سەد کەسان نۆهەت و نۆ دەکوژرێن، هەر پیاوێکیش لەوانە دەڵێ: بەڵکو ئەو کەسی رزگاری دەبێ من بم)).[1]

هەروەها موسلیم، بەم بێژەیە لە ئوبەی کوڕی کەعب دەگێڕتەوە: ((یوشك الفرات أن يحسر عن جبل من ذهب فإذا سمع به الناس ساروا إليه، فيقول من عنده: لئن تركنا الناس يأخذون منه ليذهبن به كله، قال: فيقتتلون عليه، فيقتل من كل مائة تسعة وتسعون: نێزیك بوە فورات کێوێك لە زێڕ دەربخات. جا ئەگەر خەڵکی بیستیان، بۆوێ دەچن، ئەوانی لەلای کێوەکەشن، دەڵێن: ئەگەر واز لە خەڵکی بێنین، ئەوا هەموی دەبەن، فەرموی: جا لەسەری بەشەڕ دێن، لە هەر سەد کەس نۆهەت و نۆیان دەکوژرێن)).[2]

---

[1] رواه البخاري في كتاب الفتن، باب خروج النار، فتح الباري: (١٣/٧٨) ورواه مسلم في كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب: (٤/٢٢١٩)، حديث رقم (٢٨٩٤).

[2] أنظر صحيح مسلم: (٤/٢٢٢٠) حديث رقم (٢٢٩٥).

نەوەوی دەڵێ: مەبەست لە (انحسار: دەرخستن) ئەوەیە کە ئاوەکەی نامێنێ و دەردەکەوێ[1]. هەروەها ڕەنگە ئەمەش بەهۆی گۆڕانی ڕێڕەوەکەی بێ، چونکە ئەو گەنجینەیە یا ئەو چیایە لە خوڵێدا بزرە و نەدۆزراوەتەوە، جا ئەگەر بەهەر هۆیەك ڕێڕەوی ئاوەکە گۆڕا و بەلای ئەو چیایەدا تێپەڕی، دەری دەخا، خوداش زانا و شارەزاترە.

پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو ئاشوب و یەکدی کوشتن و خوێنڕشتنەی لە بردنی ئەو زێڕە دەکەوێتەوە. نەهی کردوە لەو کەسانەی لە دیاری ئامادە دەبن، شتێکی لێ هەڵگرن.

## جێباسی پێنجەم

## زەوی گەنجینە شاراوەکانی دەردەخا

موسلیم لەصەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرە دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((تقيء الأرض أفلاذ كبدها أمثال الأسطوان من الذهب والفضة، فيجيء القاتل، فيقول: في هذا قتلت! ويجيء القاطع، فيقول: في هذا قطعت رحمي، ويجيء السارق، فيقول: في هذا قطعت يدي! ثم يدعونه فلا يأخذون منه شيئاً: زەوی جگەرگۆشەکانی خۆی دەڕشێنتەوە، وەکو کۆڵەگەی زێڕ و زیو دەخاتە گۆڕێ، جا پیاوکوژ دێ، دەڵێ: لەپێناو ئەمەدا خەڵکم کوشت! یەکێکی دی دەڵێ: لەبەر ئەمە پەیوەندی خزمایەتیم بڕی، دزیش دێ دەڵێ: لەپێناو ئەمە دەستم بڕاوە! پاشان وازی لێ دێنن و کەسیان هیچی لێ نابەن)).[2]

---

[1] شرح النووي على مسلم: (١٨\٩)

[2] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الزكاة، باب الترغيب في الصدقة قبل أن لا يوجد من يقبلها، حديث رقم (١٠١٣) ٢/٧٠١.

ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی خودا، کە فەرمان دەداتە زەوی گەنجینەکانی دەرخا کە لە ناخیدا وەشێردرابون، پێغەمبەر ﷺ ئەوان گەنجینانی بە (افلاذ الکبد) ناوبردوە، کە لە بنەڕەتدا (بە مانای پارچەجەرگی حوشتر دێ. هێندێکیش دەڵێن: بریتیە لە پارچە گۆشت. مەبەستی فەرمودەکەش وێچواندنە، واتە ئەو پارچانە دەردەخا کە لەناخیدا شاردراوەنەتەوە و، لەبەر گەورەیی و زۆریشی بە کۆڵەگەی چواندون)[1]

جا کە خەڵکی ئەو زۆریەی زێڕ و زیو دەبینن لێی بێ نیاز دەبن و، ئێش و ئازار دەخۆن کە بۆ وەدەست هێنانی ئەو مایە پوچە گوناح و تاوانیان ئەنجام داوە.

## جێباسی شەشەم

## گەمارۆی موسڵمانان لە مەدینەدا

لە نیشانەکانی قیامەتیشە کە موسڵمانان بدۆڕێن و، سایەیان دابکشێ و، دوژمنانیان دەوریان بدەن و لەمەدینەی پیرۆز گەمارۆیان بدەن.

لە ئیبنی عومەر ﷺ هاتوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یوشك المسلمون أن يحاصروا الى المدينة، حتى يكون أبعد مسالحهم السلاح: نێزیك بوە موسڵمانان لە مەدینە گەمارۆ بدرێن، تاکو دورترین سەنگەری چاودێر و نۆبەتدارەکانیان چەك دەبێ)).[2]

---

[1] شرح النووي على مسلم: (١٨/٩٨).

[2] حديث صحيح رواه أبوداود والحاكم، صحيح الجامع: (٦/٣٦٣) ورقم الحديث: (٨٠٣٣).

## جێباسی حەوتەم

## جەهجاه پاشایەتی وەدەست دێنی

جەهجاه پیاوێکی قەحطانیە، موڵك دەگرێتە دەست و دەبێتە پاشا، گەلێك توند و سەرسەختە. لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە؛ لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة حتى يخرج رجل من قحطان يسوق الناس بعصاه: قیامەت دانایی هەتا پیاوێکی قەحطانی دەردەکەوێ و بەداردەستەکەی خەڵکی لێدەخوڕێ))[1].

لە گێڕانەوەیەکی موسلیمشیدا هاتوە: ((لا تذهب الأيام والليالي، حتى يملك رجل يقال له الجهجاه: رۆژ و شەو رەت نابن و نابڕێنەوە، هەتا پیاوێکی ناو جەهجاه موڵك دەگرێتە دەست)).[2]

رەنگە ئەو کەسەی ریوایەتی دوەم لەیەکەمیان جودابێ، چونکە لە سونەنی تیرمیذیدا بە صەحیحی لە ئەبو هورەیرە هاتوە، کە ئەو جەهجاهە بەندەیە و ئازاد دەکرێ. هەروەك لەوێ لە ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەر ﷺەوە هاتوە، فەرموی: ((لا يذهب الليل والنهار حتى يملك رجل من الموالي يقال له جهجاه: شەو و رۆژ تەواو نابن و تێناپەڕن هەتا پیاوێك لە بەندە ئازادکراوەکان دەبێتە پاشا کە پێی دەڵێن جەجهاه)).[3]

مەبەست لەوەی کە بەداردەستەکەی خەڵکی لێدەخوڕێ، ئەوەیە کە بەسەر خەڵکیدا زاڵ دەبێ، جا بۆی رام دەبن و گوێڕایەڵی دەکەن، بە دار لێخوڕینیش گوزارەکردنێکە لە روی توند و سەرسەختی بەکاردێ، جەهجاهیش لەبنەڕەتدا بە مانای هاوار دێ، هەروەك ئیبنوحەجەر دەڵێ، ئەمەش سیفەتێکە لەگەڵ داردەست

---

[1] رواه البخاري ومسلم.

[2] رواه البخاري في كتاب الفتن، باب تغير الزمان، فتح الباري: (١٣/٧٦).

[3] أنظر صحيح الجامع الصغير: (٦/٢٣٠) حديث رقم: (٧٥٦١).

ڕێك دەكەوێ[1] جا ئایا ئەم پیاوە خەڵكی بەرەو چاكە دەبا یا خراپە، پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بۆمان ڕون نەكردۆتەوە.

## جێباسی هەشتەم

## ئاشوبی ئەحلاس و
## ئاشـــــوبی دەهماء و
## ئاشـــــــوبی دهیماء

لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە هاتوە، دەڵێ: لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕۆنیشتبوین باسی ئاشوبانمان دەكرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی فەرمون، تا هاتە سەرباسی ئاشوبی ئەحلاس، یەكێك گوتی: ئاشوبی ئەحلاس چیە؟ فەرموی:

((هي فتنة هرب وحَرَب، ثم فتنة السراء، دخلها أو دخنها من تحت قدمي رجل من أهل بيتي، يزعم أنه مني، وليس مني، وإنما وليي المتقون، ثم يصطلح الناس على رجل كَوَرِك على ضِلَع، ثم فتنة الدهيماء، لا تدع أحداً من هذه الأمة إلا لطمته، فإذا قيل إنقطعت تمادت، يصبح الرجل فيها مؤمناً، ويمسي كافراً، حتى يصير الناس إلى فسطاطين؛ فسطاط إيمان لا نفاق فيه، وفسطاط نفاق لا إيمان فيه، إذا كان ذاكم فانتظروا الدجال من اليوم أو غد: بریتیە لە ئاشوبی هەڵاتن و لە دەستچونی ماڵ و منداڵ، پاشان ئاشوبی خۆشیان دێ، لەبن پێی پیاوێك هەڵدەستێ لە خانەوادەی من، دەڵێ گوایە لەمنە، بەڵام لەمن نیە، چونكە تەنها پارێزكاران دۆستی منن. ئەوجا خەڵكی لەدەوری پیاوێكی خوار و خێچ كۆدەبنەوە، پاشان ئاشوبی (دهیماء) دێ كەس لەم ئوممەتە نایەڵێ تێی هەڵنەدا، ئەگەر بڵێن وا بڕاوە، هێشتا درێژ دەبێتەوە، پیاو بە بڕواداری بەیانی

---

[1] فتح الباري: (١٣\٨٧)

دەكاتەوە و، بۆ شەوێ كافر دەبێ، تاكو خەڵك دەبنە دوبەش؛ كۆمەڵێكی بڕواداری دور لە دەغەڵی و كۆمەڵێكی دەغەڵ و دوڕوی دور لە بڕوا. جا ئەگەر ئەوە ڕویدا، لەو ڕۆژەی یا بۆ سبەی چاوەڕوانی دەجال بن)).[١]

ئەمە واتا گشتیەكەی فەرمودەكەیە..

(ئەحلاس)یش كۆی (حەلس)ە كە بە واتای ئەو جلە دێ كە دەخرێتە سەر پشتی حوشتر، بۆیەش ئاشوبەكەی وێ چوێنراوە چونكە چۆن ئەو جلە بە حوشترەوە دەنوسێ، ئاشوبەكەش ئاوا بە خەڵكەوە دەنوسێ. (خەطابی) دەڵێ ڕەنگە ئەو ئاشوبە لەبەر ڕەشی و تاریكی بە جلی حوشتر شوبهێنرابێ. وشەی (حَرَب)یش واتە لەدەستچونی ماڵ و كەسوكار.

(السراء) بریتیە لەو نیعمەتەی خەڵكی تێدا شاد و ئاسودە دەبن لەبەر زۆربونی ماڵ و سامان و كەوتنە خۆشی، بۆیەش بە فیتنەو ئاشوب داندراوە چونكە خەڵك بەهۆی ئەو خۆشیەی تێیدان توشی گوناح و تاوانان دێن.

كە دەشفەرموێ: (كورك علی ضلع) مەبەستی ئەوەیە سەقامگیر و چەسپاو نابێ، چونكە نێك لەسەر پەراسو جێگیر نابێ و ڕێك ناكەوێ.

(الدهیماء)یش ئەو كارەساتەی كە بەسەر خەڵك دادێ.

---

[١] حديث صحيح، رواه أبوداود والحاكم وأحمد، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني (٧٠٢/٢)، حديث رقم (٩٧٤).

# جێباسی نۆیەم

## دەرکەوتنی مەهدی

### خوازگەی یەکەم

### ئەو دەقانەی مەهدی دەناسێنن

لە فەرمودە صەحیحەکاندا هاتوە کە خودای بەرز و بێهاوتا لەئاخیرزەمانیٚ خەلیفەیەك دەنێریٚ، کە دەبێتە فەرمانڕەوایەکی دادوەر و کاروباری ئەم ئوممەتە دەگرێتە دەست، لە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺە و، لە نەوەی فاطیمەیە، ناوی خۆی وەك ناوی پێغەمبەر ﷺە، ناوی باوکیشی بریتیە لە نێوی بابی پێغەمبەرﷺ. فەرمودەکان وا وەسفی دەکەن کە نێوچاوانی فراوان و، لوتی کوڕە، زەوی پڕ داد دەکا، پاش ئەوەی پڕ جەوروستەم کراوە، لەو فەرمودانەی لەم بارەوە هاتون:

١- لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تذهب الدنيا حتى يملك العرب رجل من أهل بيتي، يواطئ إسمه إسمي: دونیا بەسەرناچیٚ تاکو پیاوێك لەخانەوادەی من دەبێتە شای عارەبان، ناوی دەگەڵ ناوی مندا کۆکە))[1].

لە ریوایەتێکی ئەبوداودیشدا هاتوە، کە دەفەرمویٚ: ((لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم، حتى يبعث الله فيه رجلاً مني-أو من أهل بيتي- يواطئ إسمه إسمي، وإسم أبيه إسم أبي، يملأ الأرض قسطاً وعدلاً، كما ملئت جوراً وظلماً: ئەگەر دنیا هەر تەنیا رۆژێکی مابیٚ، خودا ئەو رۆژەی درێژ دەکاتەوە، تاکو پیاوێکی لەمن -یان لەخانەوادەی من-

---

[1] رواه الترمذي وابوداود.

**دەنێرێ کە ناوی وەك ناوی منە و، ناوی باوکی وەك ناوی باوکمە، دونیا پڕ دادوەری دەکا، چۆن پێشتر پڕ جەور و ستەم کرابو)).**[1]

**٢- لە ئوم سەلەمەوە** (رەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((المهدي من عترتي من ولد فاطمة: **مەهدی لە رەچەڵەکی منە و لە نەوەی فاطیمەیە)).**[2]

**٣- لە عەلی‌ﷺەوە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((المهدي منا أهل البيت يصلحه الله في ليلة: **مەهدی لە ئێمەی ئالی بەیتە، خودا لە شەوێکدا دەیسازێنێ)).**[3]

**٤- لە عەلی‌ﷺەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لو لم يبق من الدهر إلا يوم، لبعث الله رجلاً من أهل بيتي، يملؤها عدلاً، كما ملئت جوراً: **ئەگەر رۆژگار تەنیا رۆژێکی مابێ، خودا پیاوێك لە خانەوادەی من دەنێرێ، پڕی بکا لە دادوەری، هەروەکو پڕ جەور کرابو)).**[4]

**٥- لە ئەبو سەعیدی خودری، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((المهدي مني، أجلى الجبهة، أقنى الأنف، يملأ الأرض قسطاً وعدلاً، كما ملئت جوراً وظلماً، يملك سبع سنين: **مەهدی لەمنە، نێوچاوانی فراوانە و، لوتی کورە، زەوی پڕ داد و دادوەری دەکا، هەروەك پڕ جەور و ستەم کرابو، حەفت ساڵان موڵك دەگرێتە دەست)).**[5]

**٦- لە ئەبو سەعیدی خودری، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لتملأن الأرض جورا وظلماً، فإذا ملئت جوراً وظلماً، بعث الله رجلاً مني، إسمه إسمي، فيملؤها قسطاً وعدلاً، كما ملئت جورا وظلماً: **روی زەوی پڕ دەبێت لەزۆر و ستەم، جا کە پڕ جەور و ستەم بو، خودا**

---

[1] مشكاة المصابيح: (٣/٢٤)، وقال محقق المشكاة: إسناده حسن ورمز لرواية أبي داود بالصحة في صحيح الجامع الصغير: (٦/٧٠) حديث رقم (٥١٨٠).

[2] رواه ابوداود وابن ماجة والحاكم: صحيح الجامع الصغير: (٦/٢٢) وقال الشيخ ناصر فيه: صحيح.

[3] رواه احمد وابن ماجة: صحيح الجامع: (٦/٢٢)، وقال فيه الشيخ ناصرالدين الألباني: صحيح.

[4] رواه احمد وابوداود: وهو حديث صحيح، أنظر صحيح الجامع الصغير: (٥/٧١)، حديث رقم (٥١٨١).

[5] رواه ابوداود: مشكاة المصابيح: (٣/٢٤) حديث رقم(٥٤٥٤)، وإسناده حسن كما قال محقق المشكاة.

پیاوێك دەنێرێ كە لە منە و، ناوی ناوی منە، دونیا پڕ لە داد و عەدالەت دەكات، هەروەكو پڕ زۆر و ستەم بو)).[1] هەروەها لە (الحلية)دا ئەبو نوعەیم لە ئەبو سەعیدەوە بە مەرفوعی بەم بێژەیە دەیگێڕتەوە: ((لا تقوم الساعة حتى تمتلأ الأرض ظلماً وجوراً وعدواناً، ثم يخرج رجل من عترتي، أو من أهل بيتي يملؤها قسطاً وعدلاً، كما ملئت جورا وظلماً: قیامەت دانایێ هەتا زەوی پڕ زۆر و ستەم و دوژمنكاری دەبێت. ئەوجا پیاوێك لە نەوەی من، یا لە خانەوادەی من دەردەكەوێت، ڕوی زەوی پڕ دەكات لە دادگەری، هەروەكو پڕ جەور و ستەم كرابو)).[2]

هەروەها حاكیم لە ئەبو سەعیدەوە بە مەرفوعی بەم بێژەیە دەیگێڕتەوە: ((يخرج في أمتي المهدي، يسقيه الله الغيث، وتخرج الأرض نباها، ويعطى المال صحاحاً، وتكثر الماشية، وتعظم الأمة، يعيش سبعاً أو ثمانياً يعني حججاً: مەهدی لە ئوممەتی من هەڵدەكەوێت، خودا بارانی بۆ دەبارێنێ و، زەوی ڕوەكی خۆی دەردەخا و، ماڵ دەبەخشێ و، ڕەشەوڵاخ زۆر دەبێ و، ئوممەت مەزن دەبێ: هەفت یا هەشت ساڵانیش دەژی)).[3]

هەروەها بەم شێوەیەش هاتوە: ((لو لم يبقى من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يبعث فيه رجلاً مني، أو من أهل بيتي، يواطئ إسمه إسمي، وإسم أبيه إسم أبي، يملأ الأرض عدلاً...: ئەگەر تەنیا ڕۆژێك لە دونیا مابێ، خودا ئەو ڕۆژە درێژ دەكاتەوە، تا پیاوێكی تێدا دەنێرێ، لەمن یا لە خانەوادەی من، ناوی لەگەڵ ناوی مندا كۆكە و، ناوی باوكی ناوی باوكمە، زەوی پڕ دادوەری دەكا...)).[4][5]

---

[1] اخرجه البزار وابن عدي في الكامل، وابونعيم في اخبار اصبهان، والحاكم، ورواه الإمام احمد، وابن حبان والحاكم.

[2] قال الحاكم في اسناد هذه الرواية:(صحيح على شرط الشيخين)، ووافقه الذهبي وأشار ابو نعيم الى تصحيحه.

[3] صححه الحاكم والذهبي وابن خلدون.

[4] رواه اصحاب السنن و كذا الطبراني في الاوسط الكبير، وصححه الترمذي و الحاكم و ابن حبان، اللفظ لابي داود.

[5] ئەم لێكۆڵینەوەیە پوختەیەكی كورتی قسەكانی (شێخ ناصرالدین البانی)یە، ئەگەر مەبەستت بو لە تەواوی قسەكانی ئاگادار بی بگەڕێوە بۆ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٨/٤)، حديث رقم (١٥٢٩). هەروەها بۆ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٣٦/٢)، حديث رقم (٧١١).

## خوازگەی دووەم

# پلەو پایەی فەرمودەکانی مەهدی لە روی ڕاستیەوە

پوختەی قسەکانی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی باز لەم بابەتە بەم شێوەیە:

(مەسەلەی مەهدی رون و ئاشکرایە، فەرمودەش لەم بارەیەوە گەلێك زۆرن، بەڵکو موتەواتیرن و یەکتر پتەو دەکەن. زیاتر لە زانایەکیش تەواتورەکەی گێڕاوەتەوە، دیارە تەواتوری ئەم فەرمودانە لەڕوی ماناوەیە، لەبەر زۆری ڕێگەکانی و، جیاوازی سەرچاوە و هاوەڵان و بگێڕەوەکانی و بێژەکانی، کە بەڕاستی بەڵگەیە بۆ هاتنی ئەو پیاوەی بەڵێنی هاتنی دراوە، جا مەسەلەکە سەلماوە و هاتن و دەرکەوتنیشی ڕەوایە، مەهدیش ناوی (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای عەلەویی حەسەنی)یە، لە نەوەی (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالیب ﷺ)ـە. هاتنی ئەو پێشەوایەش لە ئاخیرزەماندا لە بەزەیی و میهری خوداوەیە بۆ ئەم ئوممەتە، وەدەردەکەویٚ و هەق و دادگەری بەرپا دەکا و، زۆر و ستەم قەدەغە دەکا و، خودا بەهۆی وی بەیداخی خێر و چاکە هەڵدەکا و، بۆ ئوممەت دەبێتە هۆی دادوەرەی و ڕێنمونی و، پشتیوانی و ڕێبەریی خەڵکی بۆ سەرکەوتن.

منیش سەیری زۆر لە فەرمودەکانیم کردوە، جا هەروەکو شەوکانی و ئیبنیقەییم و غەیری وان دەڵێن: صەحیحی تێدایە و، حەسەنیشی تێدایە و زەعیفی پتەوکراو[1]ی تێدایە و، هەواڵی هەڵبەستراویشی تێدایە. بەڵام ئێمە لەم بابەتە ئەوانەمان بەسە کە سەنەدەکەی ڕاستە، جا بۆ خۆی صەحیح بیٚ یا بەغەیری خۆی، یا بۆ خۆی حەسەن بیٚ یا بەغەیری خۆی، فەرمودەی زەعیفی پتەوکراویش هەر بەم شێوەیە، ئەگەر هەندێك هەندێکیان پتەو کرد، لەلای ئەهلی علیم دەبێتە حوججەت... جەماوەرێکی

---

[1] پتەو کراو: منجبر.

زۆری زانایـان – بـەڵکو بـەڕادەی یـەکدەنگی– کۆکـن لەسـەر سـەلماندنی مەسـەلەی مەهدی، کە هەقە و، لە ئاخیرزەماندا وەدەردەکەوێ. بەڵام ئەو کەسـەی لـەم بابەتـە لـە ئەهلی عیلمیش ریزپەڕ دەبێ قسەکانی پشت گوێ دەخرێ.)[1]

هـەروەها شـێخ عەبدولموحسین کوڕی حەمەدئەلعباد، ئامارێکی بۆ ئەو هاوەڵانـە کردوە کە فەرمودەکانی مەهدی دەگێڕنـەوە و گەیشتونەتە بیسـت و شـەش هـاوەڵ. هەروەها ئامارێکی بۆ کتێبەکانی فەرمودە کردوە کە فـەرمودەکانیان تـەخریج کـردوە، جا گەیشتونەتە سی و شەش کتێب، چونکە خاوەنی هەر چوار سونەن و، ئەحمـەد لـە موسنەدەکەی و، ئیبنـی حیبـان لـە صەحیحەکـەی و، حـاکیم لـە موسـتەدرەکەکەی و غەیری ئەوانەش تەخریجیان کردوە.)[2]

گەلێك زاناش ئەم فەرمودانـەیان لە کتێبی تایبەتیدا کۆکردۆتـەوە و، رێگـەکانیان رون کردۆتەوە و، لەبارەی سەنەدەکان قسەیان کردوە، لەوانە ئەبوبـەکری کـوڕی ئـەبو خەیثەمە زوهەیری کوڕی حەرب، هەروەك ئیبنی خەلدون ناوی بردوە. هـەروەها ئـەبو نەعیمی حافیز و، سیوطی حـافیزیش لـە کتێبی ((العرف الـوردي في اخبـار المـهدي)) قسەکانی ئـەبو نـەعیمی پوخـت کردۆتـەوە و بـۆی زیـاد کـردوە، جـا لـە پـاڵ کتێبێکـی بەنێوی (الحـاوي للفتـاوي) لـە چاپ دراوە. هـەروەها ئیبنـی کەثیری حـافیز بەشـێکی بەتــەنێی بـۆ باسـی مــەهدی تــەرخان کـردوە، هــەروەك لــە کتێــبی ئاشــوبەکاندا (الفتن والملاحـم) باسـی کـردوە. هـەروەها ئیبنـی حەجـەری مەککـەیی کـە کتێبێکـی داناوە بەنێوی: ((القول المختصـر في علامات المهدي المنتظر))، هـەروەها ئەلموتتـەقی هیندی خاوەن کتێبی (کنز العمال) و، مـەلا عـەلی قاری و ناویشـی لـە کتێبەکـەی نـاوە (المشـرب الـوردي في مذهـب المـهدي))، هـەروەها مـەرعی کـوڕی یوسـفی حەنبـەلی و، و صەنعانی و غەیری وانیش.[3]

---

[1] وتەکانی شێخ لە کتێبی (الرد على من كذب بالأحاديث الصحيحة الواردة في المهدي لعبد المحسن بن حمد العباد، ص١٥٧) تۆمار کراوە.

[2] عقيدة أهل السنة والأثر في المهدي المنتظر لعبد المحسن بن حمد العباد وهو مطبوع مع الكتاب السابق ذكره: ص١٦٦-١٦٨.

[3] سەرچاوەی پێشو ص١٦٨.

هەروەها گەلێك زانای پێشەواو رەخنەسازانی فەرمودەناسی بڕیاریان لەسەر فەرمودەكانی مەهدی داوە، لەوانە: حاكیم و، ذەهەبی و، ئەبو نەعیم و، ئیبنیعەرەبی مالیكی و، قورطوبی و، ئیبنی تەیمیەی شێخیئیسلام و، ئیبنیقەییمی جەوزەیە و، ئیبنی حەجەری عەسقەلانی حافیز و، سیوطی و غەیری ئەوان.[1] بۆیە گوێ نادرێتە ئەو كەسانەی ئەم فەرمودانەیان بەزەعیف داناوە، یا باوەڕیان پێنەبوە و بەدرۆیان خستونەتەوە، لەوانی كە سوارچاكی ئەم مەیدانە نین.

## خوازگەی سێیەم

## بیروباوەڕی تاقمە ئیسلامیەكان لەبارەی مەهدی

١- هەرچی بیروباوەڕی ئەهلی سونەت و جەماعەتە، دەگەڵ ئەو فەرمودە صەحیحانەدا كۆكە كە هێناومانە، كە مەهدی فەرمانڕەوایەكی چاك و رێنمایە، خودا بۆ نوێكردنەوەی ئەم دینە رەوانی دەكا و، لەسەر دەستی وی ئەم دینە بەرز دەكاتەوە.

ئیبنی خەلدون دەڵێ: (هەمو ئەهلی ئیسلام بەدرێژایی چاخ و سەردەمان وایان لەناودا بڵاوە، كە لەئاخیر زەماندا پیاوێك لە ئالی بەیت دەردەكەوێ پشتگیری ئەم دینە دەكا و، دادگەری سەردەخا و، موسڵمانان شوێنی دەكەون و، دەست بەسەر وڵاتە ئیسلامیەكان دادەگرێ و، ناویشی مەهدیە و، دەركەوتنی دەجال و نیشانەكانی تری قیامەت كە بەصەحیحی هاتون، لە پاش وی دێن و، عیساش لە پاش ئەو بۆ كوشتنی دەجال دادەبەزێ، یا لەگەڵ وی دادەبەزێ تا لە كوشتنی یاریدەی بدا و، مەهدیش دەكاتە ئیمامی نوێژ بۆخۆی).[2]

---

[1] تەماشای سلسلة الأحادیث الصحیحة: (٤/٤٠-٤١) بكە.

[2] المقدمة، ابن خلدون: ص٥٥٥، چاكتر وایە لێرەدا ئەوە رون كەینەوە كە ئیبنو خەلدون زۆربەی ئەو فەرمودانەی بەڵگەن بۆ هەبونی مەهدی بەزەعیف دادەنێت و، بۆچونەكەشی راست نیە، بەڵام دروست نیە بگوترێ ئیبنی خەلدون بونی مەهدی رەت دەكاتەوە، چونكە هەندێك لەو فەرمودانەی بە صەحیح داناوە. چونكە پاش هێنانەوەی فەرمودەكان و وتوێژ لەسەریان لە ل٥٧٤دا دەڵێ: (وەك دەبینی زۆر كەم نەبێ لە رەخنە دەرباز نەبوە) جا ئەو كەمە بۆ سەلماندنی باوەڕ پێ بونی بەسە.

٢- بیروباوەڕی شیعەی ئیمامی، کە بیروباوەڕیان وایە مەهدی دوا ئیمامی ئەوانە و. بریتیە لە ئیمامی دوازدەمین و ناوی (موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری)یە و، بەبۆچونی ئەوان لە نەوەی (حوسەینی کوڕی عەلی)یە، نەك لە نەوەی حەسەن. بیروباوەڕیان وایە کەزیاتر لە هەزار و سەد ساڵ بەر لە ئێستا لەتەمەنی پێنج ساڵیدا چۆتە نێو ژێرزەمینی سامەڕرا، بڕواشیان وایە کە ئامادەیە لەشاران و، بڕوە لەچاوان و، بریتیە لەو مەهدیەی کە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکەن، بەڵام ئەم قسەی ئەوانە چ دەلیل و بەڵگەیەکی عەقڵی یا نەقلی لەسەر نیە و، پێچەوانەی سونەتی خوایە لەنێو مرۆڤدا و. دەگەڵ ژیری عاقڵاندا ناگونجێ، پاشان ئەگەر زیندوە پیواریو نەدیوبونی سودی چیە، بەڵکو ئەرکی وابو کە بێتە دەرێ و، فەرمان بە چاکە بکا و بەرهەڵستی خراپە بکا.

٣- ئەوانەی بونی مەهدی وەدرۆ دەخەنەوە؛ ئەمانەش چەند تاکێکن لەوانەی دەدرێنە پاڵ ئەهلی سوننەت و، شارەزایی و ئەزمونێکی زۆریان نیە لە لێکۆڵینەوەی دەقەکان و. دەرخستنی سەنەدەکان، جا گەلێك لە زانایان و ئەهلی عیلم لە کتێبی سەربەخۆدا گومانەکانیان پوچ کردونەتەوە، دوا کتێبیش بەرچاوی ئێمە کەوتبێ، ئەوەیانە کە شێخ عەبدولموحسین ئەلعباد لە کتێبی (الرد علی من کذب بالاحادیث الصحیحة الواردة في المهدي)[1] نوسیویەتی، هەروەها کتێبی (الاحتجاج بالأثر علی من انکر المهدي المنتظر)[2] کە شێخ حەمودی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەمەدی تویجەری نوسیویەتی.

٤- هەندێك لە فەرمانڕەواکانی پێشو، بەخۆیان یا قەومەکانیان بۆیان هەڵبەستاوە کە مەهدین. هەندێکیشیان هەن پیاوی چاك بون و ناسناویان بۆتە مەهدی، نەك بەمەبەستی ئەو مەهدیەی پێغەمبەر ﷺ باسی فەرموە، بەڵکو وەك گەشبینیەك بەوەی کە لە ڕیزی پێشەوا مەهدیەکاندا بێ. کە واتای ڕێنماکراو دەگەیەنێ و ئەوانەن کە

---

[1] لە چاپخانەی (الرشید) لە مەدینەی پیرۆز چاپکراوە.

[2] لەلایەن (الرئاسة العامة لادارات البحوث العلمیة والافتاء والدعوة والارشاد — السعودیة) بڵاوکراوەتەوە.

هەق دەڵێن و حوکمی پێدەکەن؛ لەوانەش مەهدی خەلیفەی عەبباسیان.

هەندێکیش لەو فەرمانڕەوایانەی بانگەشەی مەهدیاتیان کردوە یا قەومەکەی بۆیان هەڵبەستون، لەوانە، خوانەناس (عوبەیدوڵلای کوڕی مەیمونی قەداح) کە بێدینێك بو لەساڵی ٢٥٩ی کۆچی لەدایك بوە و لە ٣٢٢ی کۆچی مردوە، باپیریشی جولەکەیەك بو سەر بە بنەماڵەیەکی ئاگرپەرست، بە درۆ و بوختان هەڵی بەستابو کە لە خانەوادەی پێغەمبەرﷺە و، بانگەوازی دەکرد گوایە ئەو مەهدیەیە کە پێغەمبەر ﷺ موژدەی راگەیاندوە، جا بوە پاشا و زاڵ بو و، کارەکەی دەستی ستاند و فراوان بو و، نەوەکانی دەستیان بەسەر وڵاتانی مەغریب و، میسر و، حیجاز و شام داگرت و، بەهۆی ئەوانەوە میحنەت و کارەسات و نامۆیی موسڵمانان زۆر پەرەی سەند و، تەنانەت بانگەوازی خوایەتیان دەکرد و، دەیانگوت شەریعەت دیار و پەنهانی هەیە.

ئەوانەش بریتی بون لە پاشاکانی قەرامیطە کە دوژمنی سەرسەختی دین بون خۆیان بەعەبای رافیزە داپۆشیبو، وایان هەڵدەبەستا گوایە لە ئالی بەیتی پێغەمبەرﷺن، بێدینی و بێبڕواییان رەواج پێدەدا، هەر لە گوڕێ دابون هەتا خودای گەورە ئوممەتی ئیسلامی بە صەلاحەددینی ئەییوبی رزگار کرد، و کە ئوممەتی لەبەردەستان دەرێنان و بنبڕی کردن. لەوانەش (موحەممەدی کوڕی تومەرت) کە مەهدی مەغریبیان بو لە ٤٨٥ی کۆچی لەدایك ببو، لە ٥٢٤ی کۆچیش مرد، پیاوێکی درۆزنی ستەمکاری دەسڕۆیشتو بو، بانگەشەی دەکرد کە مەهدیە و، کۆمەڵێکی لە هاوەڵانی خۆی لە نێو گۆڕان دەنا و، فەرمانی دەدانێ کە بەخەڵکی بڵێن ئەوە مەهدیە، پاشانیش بە شەو گۆڕەکانی بەسەردا دەڕوخاندن، تا کارەکەی ئاشکرا نەبێ.[١]

٥- مەهدی ئەو تاقمەی بە (کیسانی) ناودەبرێن، ئەوانە دەڵێن مەهدی (موحەممەدی کوڕی حەنەفی)یە و، ئێستا زیندوە و لە کێوی (رضوی) نیشتەجێیە و، لەنێوان دو شێراندایە کە دەیپارێزن، دو کانیاوی هەن کە ئاو و هەنگوینیان لێ

[١] المنار المنيف في الصحيح والضعيف لإبن القيم: ص١٥٣.

هەڵدەقوڵێ. دەڵێن گوایە کاتی خۆی دەگەڵ چل کەس لە هاوەڵانی بۆ ئەوێ چون و، چیدی هەواڵیان نەبوە، دەشڵێن: تا ئێستا ماون و زیندون و، پاش ئەو پەنهان بونەش دەگەڕێتەوەو، زەوی پڕ داد دەکا هەروەك پڕ جەور بوە، دەڵێن: بۆیە بەم زیندانە سزا دراوە. چونکە لەبەر فەرمانی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، یا یەزیدی کوڕی موعاویە دەرچوە. کوثەیری عەززەش ئاماژەی بەو بیروباوەڕە کردوە کە دەڵێ:

وسبط لا يذوق الموت حتى يقود الخيل يقدمها اللواء

تغيب لا يرى فيهم زمانا برضوى عنده عسل وماء

واتە: ئەو نەوەیەی تامی مردن ناچێژی تاکو پێشڕەوایەتی کۆمەڵە سوارێك دەکات بەیداخێکیان لەپێشە. پەنهان بوە و ماوەیەك تێیاندا نابینرێ لە (رضوی)یە و هەنگوین و ئاوی لەلایە.

سەییدی حیمیەریش لەسەر ئەم راڕەوە بوە، ئەویش دەڵێ:

ألا قل للإمام فدتك نفسي أطلت بذلك الجبل المقاما[1]

واتە:

ئەرێ بە پێشەوا بڵێ، گیانم فیداتە لەمێژە ئەو کێوە جێگە و ڕێگاتە

ئای عەقڵی وانە چەند گچکەیە و، تێگەیشتنیان چەند کەمە، باوەڕ بە شتانێك دەکەن نە بەڵگەی عەقلی نە نەقلیان لەسەر نیە.

---

[1] لوامع الأنوار البهية للسفاريني: (٢-٨٥).

## خوازگەی چوارەم

# کاتی وەدەرکەوتنی

شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی باز دەڵێ: (ئیبنی کەثیر لە (الفتن والملاحم)دا دەڵێ:

وا گومان دەبەم دەرکەوتنی مەهدی لەکاتی دابەزینی مەسیح بێ و، ئەو فەرمودەی کە حاریثی کوڕی ئەبو ئوسامەش دەیگێڕتەوە ئاماژە بەوە دەکات و بەڵگەیەتی، چونکە دەڵێ کە ئەمیری وان لەو کاتیدا مەهدیە، ئەمەش وادەگەیەنێ کە لەسەردەمی دابەزینی (عیسای کوڕی مەریەم)دا بێ[1].. هەندێك گێڕانەوەی موسلیمیش ئەمە دەگەیەنن. لەگەڵ هەندێ ریوایەتی دیکە، بەڵام نەك بەراشکاوی، جا ئەم بۆچونە راستتر و دیار ترە، بەڵام مەرج نیە یەکجارەکی و بڕەڕ بێ).[2]

موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئوم سەلەمەو حەفصە و عائیشەی دایکانی ئیمانداران دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندوە؛ لەشکرێك ڕاوەدوی یەکێك دەنێن کە پەنای بە ماڵی خودا بردوە، جا خودا ئەو لەشکرە لە خاکێکی دەشتاییدا نغرۆ دەکا.

لە ریوایەتی ئوم سەلەمە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((یعوذ عائذ بالبیت، فیبعث إلیه بعث، فـإذا کـانوا ببیـداء مـن الأرض خسـف بهـم: یەکێك پەنا دەباتە بەر ماڵی خوا، نێردەیەکی بەدوادا دەنێرن، کە دەگەنە دەشتایی نغرۆ دەبن و لەزەویدا رۆدەچن)). گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی ئەو کەسەی

---

[1] دەقی فەرمودەکەی جابیر وایە ((ینزل عیسی بن مریم، فیقول أمیرهم المهدي: تعال صل بنا، فیقـول لا، إن بعضکم أمیر بعض تکرمة الله لهذه الأمة: عیسای کوری مەریەم دادەبەزی، جا مەهدی پێشەوایان دەڵێ: وەرە نوێژمان پێ بکە (بە ئیمامان) دەفەرمێ: نەخێر، ئێوە خۆتانن پێشەوای خۆتانن و ئەمەش بڕیکە لە ریزی خودای گەورە بۆ ئەم ئومەتە. قال ابن القیم بعد أن أورده في المنار المنیف: وهذا اسناد جید.

[2] الرد علی من کذب بالأحادیث الصحیحة الواردة في المهدي: ص١٦٠.

ـەزۆر بەگەڵ لەشکرەکە خرابیٚ؟ فەرموی: ((يخسف به معهم، ولكنه يبعث يوم القيامة علـــى نيتـــه: لەگەڵـەواندا نغرۆ دەبـیٚ، بـەڵام لـە رۆژی دواییـدا لەسـەر نیـەتی خـۆی زینـدو دەکریٚتەوە)).[1]

لەگێڕانــەوەی حەفصەشـــدا، دەڵـــێ: گوێـــم لـــە پێغەمبـــەر ﷺ بـــو دەیفـــەرمو: ((ليؤمن هذا البيت جيش يغزونه، حتى إذا كانوا ببيداء من الأرض يخســـف بأوســـطهم، وينادي أولهم آخرهم، ثم يخسف بهم، فـــلا يبقـــى إلا الشـــريد، الـــذى يخـــبر عنـــهم: سـوپایەك رودەکاتـە ئـەم مـاڵی خودایـە، تـا دەگەنـە خـاکێکی دەشـتایی و ئـەوانی ناوەڕاسـتیان نغـرۆ دەبـن و رۆدەچـن، سـەرەتاکەیان بـانگی دواییـنیـان دەکـا، پاشـان ئەوانیش نغـرۆ دەبن، جا هـەر تـاك تـاکێکی پەرتـەوازەیان لیٚ دەمیٚـنیٚ، کـە هـەواڵیان بگێڕتەوە)).

لەگێڕانەوەیەکی دیکەشدا هاتوە: ((سيعوذ بهذا البيت قوم ليست لهم منعة ولا عـــدد، ولا عـــدّة..: قەومێك پەنا دەبەنە بەر ئەم ماڵی خودایە، نە پشتەوانیان هەیە و نە ژمارەو نەچەك و تفاق)).[2]

لە ریوایەتی عائیشەدا هاتوە کە پێغەمبـەر ﷺ لـە خـەودا پەشـۆکا، عائیشـە دەڵـیٚ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، لەکاتی نوستنتدا شتی وات کرد کە پێشتر نـەتکردون، فەرموی: ((العجب أن ناساً من أمتي يؤمون البيت برجل من قريش، قد لجأ بـــالبيت، حـــتى إذا كانوا بالبيداء خسف بهم: سەیرە، کۆمەڵێك لەئوممەتی من غەزای ماڵی خودا دەکەن، بۆ پیاوێك لە قورەیش کە پەنای بە کەعبە بردوە، تا دەگەنـە دەشـتاییەك و هـەمویان لـە خـاك رۆدەچـن و نغـرۆ دەبـن.)) گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، رەنگـە رێبـوار و خـەڵکێکی لایـدە لەگـەڵ ئـەو لەشـکرە لەسـەر هـەمان ریٚدا کۆبنـەوە؟ فـەرموی: ((نعم، فيهم المستبصر والمجبور وابن السبيل، يهلكون مهلكاً واحداً، ويصدرون مصـــادر شـــتى:

[1] رواه مسلم في صحيحه (٤/٢٢٠٨) حديث رقم (٢٨٨٢).
[2] رواه مسلم في صحيحه (٤/٢٢٠٩) حديث رقم (٢٨٨٣).

**بەڵێ، هەی وایان تێدایە رێ پیشاندەدات و ئەوانەی تێدان کە بەزۆر براون و رێبواریش. پێکەوە بەهیلاك دەچن و بەجیاجیا زیندو دەکرێنەوە)).[1]**

**جا ئایا ئەوەی دێتە دەر و پەنا دەباتە بەر ماڵی خودا و خودا بە سەرخستنی خۆی پاڵپشتی دەکا و، ئەوان کەسان لەنێو دەبا کە دەیانەوێ ئازاری بدەن، ئایا ئەمە ئەو مەهدیەیە کە لە فەرمودەکاندا باسی کراوە؟ بەڵگەیەکی ڕاشکاومان بۆ ئەمە لە دەستدا نیە، خوداش زاناترە.**

## خوازگەی پێنجەم

## ئایا مەهدی ئەو خەلیفەیە کە گۆلم لە پارە دەدا

**هەروەها لە فەرمودەاندا باسی خەلیفەیەك کراوە کە لەسەردەمی وی پارە و ماڵ زۆر دەبێ، تا وای لێدێ گۆلم لە پارەی دەدا و نایژمێرێ. جا ئایا مەهدیە یا یەکێکی دیکە؟ خودا بە حەقیقەتەکەی زاناترە.**

**موسلیم لە صەحیحەکەیدا، لە جابیر کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((یکون في اخر امتي خلیفة یحثي المال حثـــوا: **لە دواییـنی ئوممەتی مندا خەلیفەیەك هەڵدەکەوێ گۆلم لە پارەی دەدا)).[2]**

**هەروەها لە ئەبو سەعیدیش دەگێڕتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((من خلفائکم خلیفة یحثو المال حثیا، لا یعده عـــــداً: **یەکێك لە خەلیفەکانی ئێوە گۆلم لە پارەی دەدا و، بە ژماردن نایژمێرێ)).[3]**

---

[1] رواه مسلم في صحيحه (٤\٢٢١٠) حديث رقم (٢٨٨٤). ئەو فەرمودەیەی کە دایکانی بڕواداران بە بێژەی نێك نزیك دەیگێڕنەوە لە گەلێك کتێبی فەرمودەدا هاتون وەك: موسنەدی ئەحمەد و، موسنەدی ئەبویەعلا و، موستەدرەکی حاکیم و، ئیبنو ماجە و تەرموذی و طەبەرانی لەناوەنجی و غەیری ئەوانەش.

[2] رواه مسلم في صحيحه (٤/٢٢٣٤) حديث رقم (٢٩١٣).

[3] رواه مسلم في صحيحه (٤/٢٢٣٥) حديث رقم (٢٩١٤).

## بەندی پێنجەم

# نیشانە گەورەکان

**ڕێخۆشەکی: ریزکردنی نیشانە گەورەکانی بەگوێرەی ڕودانیان:**

هێندیك نیشانەی گەورە هەن، بەڵگەی نێزیك بونەوەی هاتنی رۆژی دوایین، جا ئەگەر دەرکەوتن قیامەتیان بە دوا دادیٚ، لە صەحیحی موسلیمدا لە حوذەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری هاتوە، دەڵێ: ئێمە خەریکی یاداوەری بوین، پێغەمبەر ﷺ سەرێکی پێداگرتین[1]، جا فەرموی: ((ماتذاکرون؟: یادی چی دەکەنەوە))، گوتیان: یادی قیامەتێ. فەرموی: ((إنها لن تقوم حتى تروا قبلها عشر آیات: قیامەت دانایێ هەتا لە پێشدا دە نیشانان دەبینن)).

جا باسی دوکەڵ و، دەجال و، ئاژەڵەکە(دابة) و، هەڵاتنی رۆژ لە رۆژئاوا و، دابەزینی عیسای کوڕی مەریم ﷺ و، یاجوج و ماجوج و، سێ نغروبونی کرد؛ یەکێك لە رۆژهەڵات و، یەکێك لە رۆژئاوا و، یەکێك لە دورگەی عەرەبی و، دوای هەموانیش ئاگرێك کە لە یەمەندا دەردەکەوێ و خەڵکی بۆ حەشرگەیان وەدەردەنێ.[2]

نیشانە گەورەکان یەك لە دوای یەك ڕودەدەن و، بەدوای یەك داهاتنیان وەکو دەنکەکانی رشتەیەکی پچڕاوە، چۆن دەنکی یەکەمی دەکەوێ جا یەك یەکە و بێ دواکەوتن ئەوانی دیکەی بەدوادا دێن.

حاکیم بە ئیسنادێکی ڕاست لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕتەوە، دەڵێ:

---

[1] بۆیە پێغەمبەر ﷺ سەري پێداگرتون چونکە لە ژورێکی سەرەوەي ئەواندا بوە، هەروەك لە گێڕانەوەیەکی دیکەی موسیلمدا رونکراوەتەوە.

[2] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٢٢٢٥/٤) حديث رقم (٢٩٠١)، وعزاه في جامع الأصول إلى أبي داود والترمذي أيضاً.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((الأمارات خرزات منظومات في سلك، فإن يقطع السلك يتبع بعضها بعضاً: نیشانەکان مۆروی بەداوێك هەڵبەستراون، جا کە داوەکە پچڕا یەك بەدوای یەکدا دێن)).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندوە کە ئەو جەنگە گەورەی لەنێوان موسڵمانان و رۆمدا بەرپا دەبێ و بە داستان ناوی بردوە، یەکەم نیشانە دەبێ و، پاشان موسڵمانان قوستەنتینیە رزگار دەکەن، ئەوجا دەجال وەدەردەکەوێ.

مەعاذی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((عمران بيت المقدس خراب يثرب، وخراب يثرب خروج الملحمة، وخروج الملحمة فتح القسطنطينية، وفتح القسطنطينية خروج الدجال: بنیات و ئاوەدان کردنەوەی بەیتولمەقدیس، کاول بونی یەثریبە و، کاول بونی یەثریبیش وەدەرکەوتنی داستانەکەیە، وەدەرکەوتنی داستانەکەش رزگارکردنی قوستەنتینیەیە، و رزگارکردنی قوستەنتینیە دەرکەوتنی دەجالە)).[2]

مرازی پێغەمبەرﷺیش ئەوەیە کە ئەو روداوانە بەدوای یەکدا دێن، خوێنەر کە لەم کتێبەمان ڕادەمێنێ، بۆی دەردەکەوێ چۆن لەو زەمانیدا موسڵمانان لە شەڕێکی گەورە دەگەڵ ڕۆمدا تێك گیر دەبن، کە پێغەمبەرﷺ بە داستان ناوی بردوە. جا پاش سەرکەوتنی موسڵمانان قوستەنتینیە رزگار دەکەن و، پاشان دەجال وەدەردەکەوێ.

پاش دەرکەوتنی دەجالیش عیسا دادەبەزێ و دەیکوژێ، ئنجا لەسەردەمی عیسادا یاجوج و ماجوج وەدەردەکەون و، هەر لەسەردەمی ویشدا خودا لەناویان دەبا. ریزکردنەکەش تا ئێرە ئاشکرا و دیارە.

هەرچی نیشانەکانی تریشن، ریزکردنیان تەواو دیار نیە، بێگومان رۆژهەڵاتن لە

---

[1] وقال الحاكم: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي وقال الألباني: وهو كما قالا. سلسلة الأحاديث الصحيحة (٤/٣٦١)، رقم الحديث: (١٧٦٢).

[2] رواه ابوداود؛ مشكاة المصابيح: (٣/١٧)، ورقم الحديث: (٥٤٢٥)، وإسناده حسن كما قال محقق المشكاة.

ڕۆژاوا و، دەرکـەوتنی ئاژەڵەکـە و، کەوتنـەوەی ئـەو ئـاگرەی خـەڵکی کۆدەکاتـەوە، دەکەونـە دوای وەدەرکـەوتنی دەجـال و دابـەزینی عیسـا و دەرکـەوتنی یـاجوج و ماجوج. بەڵام ئەم نیشانانە کامەیان پێش کامە دەکەوێت، ئەمە ڕون نیە.

ئەو فەرمودەیـەی کـە موسـلیم لـە صەحیحەکـەیدا لـە حوذەیفـەی دەگێڕێتـەوە، بەڕاشکاوی ڕایگـەیاندوە، کەوتنـەوەی ئەو ئاگرەی خـەڵکی کۆدەکاتـەوە لـە یەمـەندا دوایین نیشانەیە. کە پێغەمبـەر ﷺ هـەر دە نیشـانە گەورەکـەی ژمـاردون، لـە دەیـەمدا باسی ئاگرەکەی فەرمو: ((واخر ذلك نار تخرج من اليمـن، تطـرد النـاس الى محشـرهم: دوای هـەموانیش ئاگرێکـە لـە یەمـەندا دەکەوێتـەوە، خـەڵکی بـۆ حەشـرگەکەیان وەدەردەنێ))[1].

جا شەش نیشانە دەمێنن: هـەڵاتنی ڕۆژ لـە ڕۆژئاواوە و، دەرکەوتنی ئاژەڵەکە و، دوکەڵ، هـەر سێ ڕۆچونەکە؛ ئەو ڕۆچونـەی لـە ڕۆژهەڵاتـە و، ئـەوی لـە ڕۆژئاوایـە و، سێیەمیشیان کە لە دورگەی عەرەبی دایە، هەرچی ڕۆژهەڵاتن لە ڕۆژئاوا و دەرکەوتنی ئاژەڵەکەیـە، لـەپاش دابـەزینی عیسـا و کوشـتنی دەجـال و، لـەنێوچونی یـاجوج و مـاجوج لەسـەردەمی ویـدا دەبێ، وە دەکەونـە پاش گـەندەڵ بونـی خـەڵك و گومبونـی ئیسلام و، پێش دەرکـەوتنی ئـەو ئـاگرەی خـەڵکی کۆدەکاتـەوە، بـەڵام کامـەیان پێشـتر دێن: ڕۆژهەڵاتنەکە، یا دەرکـەوتنی ئاژەڵەکـە؟ نـاتوانین ئەمـە یەکلاکەینـەوە چونکـە پێغەمبـەر ﷺ یەکلای نەکردۆتەوە، هـەروەك لـە فـەرمودەی عـەبدوڵڵای کـوڕی عـەمر رضي الله عنه هاتوە، کە لە پێغەمبەرﷺی بیست فەرموی:

((إن أول الآيات خروجاً طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابة على الناس ضحى، وأيهما كانت قبل صاحبتها، فالأخرى على إثرها قريبـاً: یەکـەمینی ئـەو نیشـانانە لـە دەرکـەوتندا هـەڵاتنی ڕۆژە لـە ڕۆژاوا و، دەرکـەوتنی ئاژەڵەکەیـە لـەنێو خـەڵکی لـەکاتی چێشتەنگاودا، جا کێهەیان پێش ئەوی تریان هات، ئەوی دیکە زو بەدوای دادێ))[2].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، (٤/٢٢٢٥)، ورقمه: (٢٩٠١).

[2] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب في خروج الدجال، (٤/٢٢٦٠)، ورقم الحديث (٢٩٤١).

لەبەر هاتنی واژەی (یەکەمینی ئەو نیشانانە لە دەرکەوتندا... تاد.) لە فەرمودەکەدا دروست نیە ئەم فەرمودەیە بکرێتە بەڵگەی ئەوەی کە هەڵاتنی رۆژ پێش هاتنی دەجال و دابەزینی عیسا و دەرکەوتنی یاجوج و ماجوج دەبێ، چونکە (لەتێکڕای هەواڵەکان ئەوە دەردەکەوێ کە دەرکەوتنی دەجال یەکەمین نیشانەی گەورەیە کە گۆڕانی باری گشتی زۆربەی سەر زەوی ڕادەگەیەنێ و ئەمەش بە مردنی عیسای کوڕی مەریەم هەموی کۆتا دێ، هەڵاتنی خۆریش لە خۆرئاواوە یەکەمین نیشانەی گەورەیە کە گۆڕانی باری جیهانی باڵا ڕادەگەیەنێ و، ئەمەشیان بە ڕودانی قیامەت کۆتادێ، رەنگە هاتنی ئاژەڵەکە بکەوێتە هەمان ئەو رۆژی کە خۆر لە خۆراواوە هەڵدێ).[1]

(ئەبو عەبدوڵڵای حاکیم دەڵێ: وا دەردەکەوێ رۆژهەڵاتنەکە پێش دەرکەوتنی ئاژەڵەکە بکەوێ، پاشان هەر لەو رۆژ یان لە رۆژێکی نێزیکدا ئاژەڵەکە دەربکەوێ).[2]

هەرچی نیشانەکانی تریشە، کە بریتین لە هەر سێ نغرۆبونٍ و، دوکەڵەکە. ئێمە نازانین ریزبونیان لەمیانەی نیشانە گەورەکاندا چۆنە، هیچ دەقێکی راستمان وەبەر چاوان نەکەوتوە کە ئەوە دیاربکەن، خودای مەزن بە حەقیقەتەکەی زاناترە.

---

[1] فتح الباري: (١١/٣٥٣)

[2] فتح الباري: (١١/٣٥٣)

## جێباسی یەکەم

### دوکـــــەڵ

دوکەڵ یەکێکە لەو نیشانە گەورانەی کەمێك پێش قیامەتێ ڕودەدەن، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ، يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَــذَابٌ أَلِيــمٌ: چاوەڕوانی ڕۆژێك بن کە ئاسمان بە ئاشکرا دوکەڵ دێنی، هەمو خەڵك دادەگرێ، ئەمە سزایەکی ژاندار و دەرداویە﴾.[1]

بەڵگـەی ڕاشـکاوی ئـەوەش کـەوا دوکـەڵ لەنیشـانە گـەورەکانی قیامەتـە؛ ئـەو فەرمودەیە کە موسلیم لە حوذەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری دەگێڕتەوە، دەڵێ: ئێمە خـەریکی یـاداوەری بویـن، پێغەمبـەر ﷺ سـەری پێـدا گرتـین و فـەرموی: ((مــاتذاکرون؟: یـاداوەری چـی دەکـەن؟)) گوتمان: یـادی قیامـەتێ دەکـەین فـەرموی: ((إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات، فذكر الدخان، والدجال، والدابة، وطلوع الشـــمس مــن مغربها، ونزول عيسى بن مريم عليه السلام، ويأجوج ومأجوج، وثلاث خسوف؛ خسف بالمشـــرق، وخســـف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نار تخـــرج مـــن اليمـــن تطـــرد النـــاس إلى محشـــرهم: قیامـەت دانـایێ هـەتا پێشـتر دە نیشـانان دەبینـن، جـا باسـی دوکـەڵ و، دەجـال و، ئاژەڵەکە و، ڕۆژهەڵاتن لە ڕۆژاوا و، دابەزینی عیسـای کـوڕی مـەریم عليه السلام و، یـاجوج و ماجوج و، سێ نغرۆبونی کرد؛ یەکێکیان لە ڕۆژهەڵات و، ئـەوی دی لـە ڕۆژاوا و، ئـەوی دیکەش لە دورگـەی عـەرەب، دوای هـەمو ئەوانـەش ئاگرێکـە لـە یەمـەن دەکەوێتـەوە و ڕەو بە خەڵکی دەکا بۆ حەشرگەیان)).[2]

ئیبنی مەسعودیش رضي الله عنه ڕای وایە ئەم نیشانەیە بەسەرچوە و تێپەڕیوە، موسلیم لە

---

[1] الدخان: ٩، ١٠.

[2] رواه مسلم: (٤/٢٢٢٥) حديث رقم: (٢٩٠١).

صەحیحەکەیدا لە مەسروق دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەلای عەبدوڵڵا دانیشتبوین، ئەویش لەنێوانماندا ڕاکشابو، پیاوێك هاتە لای و گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕەحمان، حیکایەتخوانێك لەبەر دەرگەکانی کیندە دانیشتوە و باسی هاتنی نیشانەی دوکەڵەکە دەکا کە گیانی کافران دەکێشێ و، بڕوادارانیش توشی پەسیو(هەڵامەت)ێك دەکا، عەبدوڵڵا بەتوڕەیی دانیشت و گوتی: هۆ خەڵکینە، لەخوا بترسێن و پارێزکاربن. هەریەك لەئێوە شتێکی زانی، بابیڵێ، ئەوی نەشیزانی بابڵێ: خودا زاناترە، زانایی هەریەکێکتان لەوەدایە کە شتێکی نەزانی، بڵێ: خودا زاناترە، چونکە خودا بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرموە: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنْ الْمُتَكَلِّفِينَ: ئەی پێغەمبەر بڵێ: لەبەرامبەر ڕاگەیاندنی قورئان و دینی خوا شتێك لەئێوە ناخوازم و لەوان کەسانیش نیم کە بە درۆ شتێك بەخۆیانەوە دەنێن.﴾[1]

پێغەمبەر ﷺ کە دیتی خەڵك پشتی تێدەکەن، فەرموی: ((اللهم سبع كسبع يوسف: خودایە توشی هەفتساڵی وەك هەفت ساڵەکەی یوسفیان بکەی)). دەڵێ: جا توشی قات و قڕیەکی واهاتن هەمو شتێکی بنبڕ کرد، تا وایان لێهات لە برسان پێستە و مرداریان دەخوارد، کە یەکێکیشیان لە ئاسمانی دەڕوانی، شتێکی وەك دوکەڵی دەهاتە بەرچاو، جا ئەبو سوفیان هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد، تۆ هانی فەرمان بە تاعەتی خودا و پەیوەندی خزمایەتی دەکەی، وا هۆزەکەت فەوتان، دە بۆیان لەخودا بپاڕێوە، خودای بەرز فەرموی:

﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ، يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ، رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ، أَنَّى لَهُمْ الذِّكْرَى وَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مُبِينٌ، ثُمَّ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَجْنُونٌ، إِنَّا كَاشِفُوا الْعَذَابِ قَلِيلاً إِنَّكُمْ عَائِدُونَ: چاوەڕوانی ڕۆژێك بن کە ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرا دێنێ، هەمو خەڵکی دادەگرێ و سزایەکی پڕ ژان و دەردە. پەروەردگارا، سزامان لێ لادەی ئێمە بڕواداریـن. بە چ شێوەیەك پەند وەردەگرن لەکاتێکدا پێغەمبەرێکی ڕونکەرەوەیان بۆ هاتوە، پاشان ڕویان لێ وەرسوڕاندو گوتیان شێتێکەو ئەم شتانەی فێرکراوە. ئێمە کەمە ئازارێك

---

[1] سورة ص: ٨٦

**هەڵدەگرین و ئێوەش دەگەڕێنەوە سەر ئاینەکەتان﴾[١]**

**گوتی: ئایا سزای دوایین هەڵدەستێ؟!** ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنتَقِمُونَ: **ڕۆژێك ئەوانە بە ئەشکەنجەی سەخت دەگرین، بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەستێنین.﴾[٢]**

**جا مەبەست لەم ڕۆژە ڕۆژی بەدرە، نیشانەی دوکەڵ و سزای سەخت و ئایەتی (لیزام)[٣] و ئایەتی (ڕوم)[٤] بەسەرچون.[٥]**

**ئیبنی مەسعود ڕای وایە تێپەڕیوە و رویداوە، بەڵگەشی ئەوەیە کە ئەو سزایەی لە ڕۆژی دواییدا کافران دوچاری دەبن، لەسەریان هەڵناستێ. دەقی ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ خودا کەمێك ئەشکەنجەی لێ بەرز کردنەوە. کۆمەڵێك لە پێشینانیش هەمان ڕاو بۆچونی ئیبنی مەسعودیان هەیە، وەکو موجاهید و ئەبولعالیە و، ئیبراهیمی نەخەعی و، ضەحجاك و، عەطیەی عەوفی، هەروەها ئیبنی جەریریش هەمان بۆچونی هەڵبژاردوە.[٦]**

**ئیبنی کەثیریش ڕای وا بوە کە هێشتا نیشانەی دوکەڵ نەهاتوە و، فەرمودەی ئەبو مالیکی ئەشعەری هێناوەتەوە، کە دەڵێ:**

**پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((إن ربكم أنذركم ثلاثاً: الدخان يأخذ المؤمن كالزكمة، ويأخذ الكافر فينتفخ حتى يخرج من كل مسمع منه، والثانية: الدابة. والثالثة: الدجال: **پەروەردگارتان لە سێ شتان ئاگاداری ئێوەی کردۆتەوە؛ ئەو دوکەڵەی کە بڕوادار دەگرێ و توشی پەسیو(هەڵامەت)ێکی دەکات و، کافریش دەگرێ و هەوا دەخوا هەتا لە هەمو کونەکانیەوە دەردەچێ، دوەمیش، ئاژەڵەکەیە و، سێیەم: دەجالە)).[٧]**

---

[١] الدخان: ١٠ — ١٥

[٢] الدخان: ١٦

[٣] مەبەست لەم ئایەتەیە ﴿فقد كذبتم فسوف يكون لزاماً﴾.

[٤] مەبەست ﴿الم، غُلِبَتْ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ﴾

[٥] رواه مسلم: (٤/٢١٥٧)، حديث رقم (٢٧٩٨)، وقال ابن كثير في تفسيره (٦/٢٤٦) هذا الحديث مخرج من الصحيحين، ورواه احمد وهو عند الترمذي والنسائي في تفسيريهما.

[٦] تفسير ابن كثير: (٦/٢٤٧).

[٧] رواه ابن جرير، ورواه الطبراني واسناده جيد.

ئیبنی کەثیر باسی ئەوەی کردوە کە ئەو ڕایەی دەڵێ: هێشتا دوکەڵەکە نەهاتوە. گوتەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، ئەبو سەعیدی خودری و، ئیبنی عەبباس و. حەسەنی بەصریە[1]، هەندێك مەسەلەشی کردۆتە بەڵگەی ڕاو بۆچونەکە:

١- ئەو فەرمودە صەحیح و حەسەنانەی کە لەم بابەتەوە هاتون و بەڵگەی ئەوەن کە نیشانەکە هێشتا نەهاتوە.

٢- کە خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ واتە: دوکەڵەکە دیار و ئاشکرایە و، ئەندێشە و خەیاڵ نیە وەکو ئیبنی مەسعود بۆی چوە.

٣- کە خودا دەفەرموێ: ﴿ يَغْشَى النَّاسَ ﴾ مەبەست هەمو خەڵکە. جا ئەگەر مەسەلەکە خەیاڵی بوایە و، تایبەت بایە بەموشریکانی مەککە، نەیدەفەرمو ﴿يَغْشَى النَّاسَ﴾.[2]

نەوەوی لە ڕاڤەی موسلیمدا لەبارەی فەرمودەی ((لن تقوم حتى تروا قبلها عشر ايات. فذكر الدخان...)) دەڵێ: (ئەم فەرمودەیە پاڵپشتی قسەی ئەوانەیە کە دەڵێن: دوکەڵەکە گیانی بێبڕوایان دەستێنێ و، بڕواداران توشی شتێکی وەك هەڵامەت دەکا و، هێشتاکە نەهاتوە و، بەڵکو لە نێزیك قیامەت ڕودەدا، پێشتریش باسی ئەوە کراوە کە ئیبنی مەسعود ڕەتی کردۆتەوە، ئەوەی ڕوشی داوە بریتی بوە لەو قات و قڕیەی توشی قورەیش بوە، تا وایان لێهاتوە لەنێوان خۆیان و ئاسمانێدا شتێکی وەکو دوکەڵێکیان هاتۆتە بەر چاوان. کۆمەڵێکیش هەمان ڕای ئیبنی مەسعودیان هەبوە. ڕایەکەی تریش گۆتەی حوذەیفە و ئیبنی عومەر و حەسەن بوە و، حوذەیفەش لە پێغەمبەرﷺی گێڕاوەتەوە کە چل ڕۆژان لە زەویدا دەمێنێ، جا بۆ کۆکردنەوەی ئەم دو شوێنەوارە، ئەوە هەڵدەگرێ کە دو دوکەڵ بن).[3]

---

[1] تفسير ابن كثير: (٦\٢٤٨)

[2] تفسير ابن كثير: (٦\٢٤٧)

[3] شرح النووي على مسلم: (١٨/٢٧)

## جێباسی دووەم

# ئاشوبی دەجال

## خوازگەی یەکەم

## گەورەترین ئاشوبە لە مێژوی مرۆڤدا

**ئاشوبی دەجال لە ئاخیرزەماندا ڕودەدا و، یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی قیامەت و لە گەورەترین ئەو ئاشوبانەیە کە بەدرێژایی مێژو مرۆڤایەتی دوچاریان بوە، لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبو دەهماء و ئەبو قەتادە هاتوە، دەڵێن: بەلای هیشامی کوڕی عامیردا تێپەڕ دەبوین و، بۆ لای عیمرانی کوڕی حوصەین دەچوین، ڕۆژێك گوتی: ئێوە بەلای مندا ڕەت دەبن و دەچنە لای پیاوانێك لەمن زێتر ئامادەی لای پێغەمبەر ﷺ نەبون و، لەمن شارەزاتر نەبون بە فەرمودەکانی، گوێم لێبو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرمو:**

((ما بين خلق ادم الى قيام الساعة خلق اكبر من الدجال –وفي رواية– أمر اكبر من الدجال: **لەنێوان وەدیهاتنی ئادەم و داهاتنی قیامەت هیچ مەسەلەیەکی لە دەجال گەورەتر نیە))**.[1]

**بۆیە هەمو پێغەمبەرەکان نەتەوەکانی خۆیان لەو ئاشوبە ئاگادار کردۆتەوە و، پێغەمبەرمانﷺ لەهەمویان زیاتر نەتەوەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە.**

**لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ، گوتی: پێغەمبەرﷺ لەنێو خەڵکی هەستاوە پێ و، بەوەی شیاو و شایستەیە ستایشی خودای فەرمو، پاشان باسی دەجالی کرد و، فەرموی:**

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في بقية من أحاديث الدجال، (٢٢٦٦/٤)، حديث رقم: (٢٩٤٦).

[1] ((إني لأنذركموه، وما من نبي إلا أنذره قومه، ولكني سأقول لكم فيه قولا لم يقله نبي لقومه. إنه أعور وإن الله ليس بأعور: من له دهجال ئاگادارتان دهكهمهوه و، هيچ پێغهمبهرێكيش نهبوه قهومهكهی لێ ئاگادار نهكردبێتهوه. بهڵام من شتێكتان لهبارهی وی پێ دهڵێم. هيچ پێغهمبهرێك به قهومهكهی خۆی نهگوتوه، دهجال يهچكاوه و خودای بهرز يهكچاو نيه)).

له ههردو صهحيحی بوخاری و موسلميشدا له ئهنهسی كوڕی ماليك هاتوه، دهڵێ: پێغهمبهر ﷺ فهرموی: ((ما بعث نبي إلا أنذر أمته الأعور الكذاب، ألا إنه أعور وإن ربكم ليس بأعور، وإن بين عينيه مكتوب كافر: ههر پێغهمبهرێك هاتبێ ئوممهتهكهی لهيهكچاوی درۆزن ئاگاداركردۆتهوه، بزانن كه ئهو يهكچاوه و پهروهردگارتان يهكچاو نيه، لهنێوان ههردو چاويشی نوسراوه كافر)).[2]

لهسونهنی تيرميذی و سونهنی ئهبو داود، له ئيبنی عومهر هاتوه كه پێغهمبهر ﷺ لهبارهی دهجال فهرموی: ((إني لأنذركموه، وما من نبي إلا أنذره قومه، ولقد أنذره نوح قومه، ولكني سأقول فيه قولا لم يقله نبي لقومه، تعلمون أنه أعور، وأن الله ليس بأعور: من له دهجال ئاگادارتان دهكهمهوه، ههر پێغهمبهرێكيش هاتبێ قهومهكهی خۆی لێ ئاگادار كردۆتهوه، نوحيش قهومهكهی خۆی لێ ئاگادار كردۆتهوه، بهڵام من قسهيهكتان لهبارهی وی پێدهڵێم، هيچ پێغهمبهرێكی دی به قهومهكهی نهگوتوه: بزانن يهكچاوه و، خودا يهكچاو نيه)).[3]

له سونهنی ئيبنی ماجه و صهحيحی ئيبنی خوذهيمه و موستهدرهكی حاكيمدا، له ئهبو ئومامه هاتوه، له پێغهمبهر ﷺهوه، فهرموی: ((يا أيها الناس، إنها لم تكن فتنة على وجه الأرض، منذ ذرأ الله ذرية آدم أعظم فتنة من الدجال، وإن الله ﷻ لم يبعث نبياً إلا حذر أمته من الدجال، وأنا آخر الأنبياء، وأنتم آخر الأمم، وهو خارج فيكم لا محالة:

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩٠).

[2] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩١)، ورواه مسلم في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال وصفة ما معه: (٤/٢٢٤٨)، حديث رقم: (٢٩٣٣).

[3] أنظر جامع الأصول: (١٠/٣٥٦)، حديث رقم: (٢٨٤٨)، والسياق للترمذي.

هۆ خەڵكینە، لەوەتەی خودا نەوەی لە ئادەم خستۆتەوە، هیچ ئاشوبێك لە سەر ڕوی زەوی نەبوە لە ئاشوبی دەجال مەزنتربێ، خودای گەورەش هەر پێغەمبەرێكی هەناردبێ ئوممەتەكەی خۆی لە دەجال ئاگادار كردۆتەوە، منیش دوایینی پێغەمبەرانم و، ئێوەش دوایینی ئوممەتانن، دەجال هەر لەنێو ئێوەدا دەردەكەویۆ هیچ بوارێكی دیكە نیە)).[1]

## خوازگەی دوەم

## نهێنی ناونانی بە مەسیحی دەجال

ئیبنیئەثیر دەڵێ: (دەجال بە مەسیح نێونراوە، چونكە چاوێكی داپۆشراوە و سڕاوەتەوە، مەسیح بەو كەسە دەڵێن كە لا ڕویەكی داپۆشرابێ، نەچاوی هەبێ نەبرۆ. لێرەدا مەسیح بە مانای بەركار(مفعول) هاتوە بە پێچەوانەی مەسیح كاتێك بۆ عیسای كوڕی مەریەم بەكاردێ و بەمانای كارا(فاعل) دێ، بۆیەش عیسا وا ناونراوە، چونكە دەستی بەسەر نەخۆشدا دەهێنا و بەئیزنی خودا چا دەبۆوە، دەجالیش درۆزنە).[2]

ئیبنی حەجەر دەڵێ: (بۆیە ناونراوە دەجال چونكە بە ناڕەواكەی هەق دادەپۆشێ. لە عەرەبیدا ئەگەر بڵێن (دجل البعیر بقطران) واتە: وشترەكەی بە قەتران داپۆشی، یا (دجل الاناء بذهب) واتە: دەفرەكەی بە زێڕ داپۆشی... ئیبنی دورەید دەڵێ: بەدەجال ناونراوە، چونكە هەق بە درۆ دادەپۆشێ، دەشڵێن چونكە بە ڕوی زەویدا دەگەڕێ،.... دەشڵێن چونكی زەوی دادەگرێ).[3]

---

[1] صحيح الجامع الصغير (٢٧٣/٦)، ورقمه (٧٧٥٢) وإسناده صحيح.

[2] جامع الأصول، لإبن الأثير: (٢٠٤/٤)، وانظر (لسان العرب) مادة: مسح.

[3] فتح الباري: (١١\٩١).

## خوازگەی سێیەم

## باری موسڵمانان لەو سەردەمەی دەجالی لێ دەردەکەوێ

بەر لەدەرکەوتنی دەجال، باری موسڵمانان زۆرباش دەبێ‌و، هێزێکی مەزنیان دەبێ‌و. وا دیارده وەدەرکەوتنی دەجالیش بۆ لەنێوبردنی ئەو هێزەیە، لەو سەردەمیدا نێوانی موسڵمانان و رۆم خۆش دەبێ‌و، هەردوك پێکەوە شەڕی دوژمنێکی هاوبەش دەکەن و بەسەریدا سەردەکەون، ئەوجا شەڕ لەنێوان موسڵمانان و خاچیەکان بەرپا دەبێ.

لە سونەنی ئەبو داود لە ذیمیخبەر هاتوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرمو:

((ستصالحون الروم صلحاً آمناً، فتغزون أنتم وهم عدواً من ورائكم، فتنصرون وتغنمون وتسلمون، ثم ترجعون، حتى تنزلوا بمرج ذي تلول، فيرفع رجل من أهل النصرانية الصليب، فيقول: غلب الصليب، فيغضب رجل من المسلمين فيدقه، فعند ذلك تغدر الروم وتجمع للملحمة: لەگەڵ رۆمدا ئاشتەواییەکی پڕ ئاسایش بەرپا دەکەن. ئێوە و ئەوان پێکەوە دژی دوژمنێکی پشتەخۆتان دەجەنگن، جا سەردەکەون و غەنیمەت دەگرن و سەلامەت دەبن، پاشان دەگەڕێنەوەو لە دەشتی (ذی تەلول) نیشتەجێ دەبن، جا یەکێك لە گاوران خاچ بەرزدەکاتەوە و دەڵێ: خاچ سەرکەوت، پیاوێك لە موسڵمانانیش تورە دەبێ‌و خاچەکە دەشکێنێ، ئەوجا رۆم غەدر دەکەن و خۆیان بۆ داستانەکە کۆدەکەنەوە))، هەندێکیشیان ئەم زیادەیان لە فەرمودەکە گێڕاوەتەوە: ((فيثور المسلمون إلى أسلحتهم، فيقتتلون فيكرم الله تلك العصابة بالشهادة: ئەوجا موسڵمانان پڕدەدەنە چەکەکانیان و دەچەنگن، جا خودا بە شەهیدبون رێز لەو کۆمەڵە دەنێ)).

---

مشكاة المصابيح: (٣/١٨)، حديث رقم: (٥٤٢٨)، وقال محقق المشكاة الشيخ ناصرالدين الألباني: إسناده صحيح.

گەر ورد بیەوە، دەبینی موسڵمانان ئەو کات چەند بەهێزن، بەشێوەیەك غەزایێ دەکەن و، غەنیمەت دەگرن و بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە و، دەشبینی تا چ ڕادەیەك دەستیان بەدینەکەیانەوە گرتوە، کاتێك ئەو گاورە خاچ بەرز دەکاتەوە، گوایە ئەو سەرکەوتنەی موسڵمانان لە وەدەست هێنانی بەشداربون بۆ خاچە، موسڵمانێکی بەغیرەت ڕاست دەبێتەوە و ئەو خاچە دەکوتێ و دەیشکێنێ، جا ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی لەو ناوچەدا دەبن دەست دەدەنە چەکەکانیان و لەگەڵ کەمی ژمارەشیان لەوێدا، بەگژ ڕۆمەکان دادەچن، پێغەمبەرﷺیش شایەدیان بۆ دەدا کە شەهیدن و خودا ئەو ڕێزەی لێناون. جا ئەو غەدرەی ڕۆمەکان و، ڕوداوەکانی دوای ئەوە، دەبنە هۆی ڕودانی داستانەکە.

## داستانەکەو رزگارکردنی قوستەنتینیە

ئەو داستانە بریتیە لە جەنگێکی گەورە و فراوان لەنێوان موسڵمانان و خاچییان بەرپادەبێ . هۆیەکەشی هەمان ئەو هۆیەیە کە لەفەرمودەی رابردو باس کراوە. زێتر لە فەرمودەیەکیش باسی ئەو جەنگە و ترسناکیەکانی دەکەن و لە بارەی ئارامی موسڵمانان تێیدا دەدوێن. پاشان بەسەر دوژمنانیان سەردەکەون، جێی سەرنجە کە ژمارەیەکی زۆر گاوری موسڵمان بوی چاك لە ریزی لەشکری موسڵمانان دادەبن.

لە صەحیحی موسلمیدا لە ئەبو هورەیرە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((لا تقوم الساعة حتى ينـزل الروم بالأعماق، أو بدابق، فيخرج لهم جيش من المدينة، من خيارُ أهل الأرض يومئذ، فإذا تصافوا قالت الروم: خلوا بيننا وبين الذين سبوا منا نقاتلهم، فيقول المسلمون: لا، والله لا نخلي بينكم وبين إخواننا، فيقاتلونهم، فيهزم ثلث لا يتوب الله عليهم أبداً، ويقتل ثلث أفضل الشهداء عند الله، ويفتتح الثلث، لا يفتنون أبداً، فيفتتحون قسطنطينية، فبينما

---

[١] فەرمودەکانی پێغەمبەر وا دەردەخات کە رۆمەکان لە ئاخیری زەماندا لەهەمو خەڵك زۆرتر دەبن، وەك لە موسنەدی ئەحمەد و صەحیحی موسیمدا لە (مستورد) هاتوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((لا تقوم الساعة والروم أكثر الناس عدداً: قیامەت دادێت لەو کاتەی کە رۆم زۆرترینی خەڵکن لە ژمارەدا))صحيح الجامع الصغير(٣/٥١).

هم يقتسمون الغنائم، قد علقوا سيوفهم بالزيتون، إذ صاح فيهم الشيطان: إن المسيح قد خلفكم في أهليكم. فيخرجون وذلك باطل، فإذا جاؤوا الشأم خرج، فبينما هم يعدُّون للقتال، يسوون الصفوف، إذ أقيمت الصلاة، فينزل عيسى بن مريم عليه السلام فأمّهم، فإذا رآه عدو الله ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله الله بيده، فيريهم دمه في حربته:

**قیامەت دانایێ هەتا رۆمەکان لە (ئەعماق) یا لە (دابیق)[1] نیشتەجێ دەبن، ئەوجا سوپایەکیان لەمەدینە بۆ دەردەچێ، لەچاکترین زەوی نشینی ئەوسەردەمی، کە دەگەنە بەرامبەر یەك، رۆمی دەڵێن: لێمان گەرێن با لەگەڵ ئەوانە بەشەر بێین کە لەخۆمان دیلکراون و موسڵمان بون، موسڵمانان دەڵێن: نەخێر، سوێند بە خوا رێتان نادەین بەتەنێ لەگەڵ برایەکانمان بجەنگێن. ئەوجا لەگەڵیان دەجەنگێن و، سێیەکی موسڵمانان هەڵدێن و هەرگیز خوا تۆبەیان لێ قبوڵ ناکا، سێیەکیشیان دەکوژرێن و دەبنە چاکترین شەهیدانی لای خودا، سێیەکیش سەردەکەون و هەرگیز جارێکی دیکە توشی ئاشوب نابنەوە، ئەوجا قوستەنتینیە رزگار دەکەن،[2] لەو کاتەی خەریکی دابەش کردنی غەنیمەت دەبن و، شمشێرەکانیان بەزەیتونان هەڵدەواسن، شەیتان لەنێویاندا هاوار دەکا: مەسیح (دەجال) هاتۆتە نێو ماڵ و منداڵتان، جا ئەوانیش وەدەردەکەون و قسەکەش راست نیە، کە دەگەنە شام دەجال دەردەکەوێ و، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکەن و، ریزی خۆیان رێك دەخەن، کە قامەتی نوێژ دەکرێ، عیسای کوری مەریم عليه السلام دادەبەزێ و پێشنوێژیان بۆ دەکا. جا هەر کە دەجالی دوژمنی خوا چاوی پێدەکەوێ وەکو خوێی ناو ئاوێ دەتاوێتەوە، ئەگەر وازی لێبینێ هەر دەتاوێتەوە تا لەنێو دەچێ، بەلام بە ویستی خودا بەدەستی خۆی دەیکوژێ و، جا حەزرەتی عیسا خوێنەکەیان پێشان دەدا کە بەسەری نێزەکەیەوەیە)).[3]**

**دیسان لە فەرمودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ باسی ترسناکیەکانی ئەو جەنگەی**

[1] دو شوێنن لە شام دا لەنزیك حەلەب.

[2] ئەم رزگار کردنە جودایە لەوەی لەسەردەستی موحەممەدی فاتیح هاتەدی.

[3] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب فتح القسطنطينية (٤/٢٢٢١) رقم الحديث (٢٨٩٧).

بۆكردوین، دەگەڵ ئەو پێشمەرگاتیەی لەرێزی موسڵمانان دادەبێت، تەنانەت كۆمەڵ كۆمەڵ موسڵمانان پەیمان دەدەنە یەك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەسەریەك بجەنگێن، یا سەركەوتن وەدەست بێنن، یا بمرن. واش پێدەچێ ئەو كاتی ژمارەی موسڵمانان كەم بێ، بەو بەڵگەی كە موسڵمانان ئەوكاتە سەردەكەون كە ئەوەندە موسڵمانەی ماون دێنە فریاو هاریكاریان.

لە صەحیحی موسلیمدا لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعود هاتوە، دەڵێ:

(قیامەت دانایێ هەتا وای لێدێ میرات بەش ناكرێ و، بە غەنیمەت شادبون نامێنێ. پاشان بەدەستی خۆی ئاماژەی بۆ لای شام كرد و، گوتی: دوژمنانێك بۆ ئەهلی ئیسلام كۆ دەبنەوەو، موسڵمانانیش بۆیان كۆدەبنەوە.[1] گوتم[2]: مەبەستت ڕۆمە؟ گوتی: بەڵێ، جا لەكاتی ئەو شەڕەیدا بەگژیەكداچونێكی توند ڕودەدا، موسڵمانانیش كۆمەڵێك هەڵدەبژێرن كە مەرج دەكەن تا مردن نەگەڕێنەوە بە سەركەوتویی نەبێ، جا شەڕ دەكەن هەتا شەو لێكیان دادەبڕێ‌و، هەر دولا دەگەڕێنەوە، كەسیش سەرنەكەوتوە و، مەرجەكەش بەسەر دەچێ، ئەوجا كۆمەڵێك لە موسڵمانان هەڵدەبژێرن كە مەرجی مردنێ دەكەن، بەسەركەوتویی نەبێ نەگەڕێنەوە، دەجەنگێن هەتا شەو لێكیان دادەبڕێ‌و، هەردولا دەگەڕێنەوە، كەسیشیان سەرنەكەوتون و ئەو مەرجەش بەسەر دەچێ، ئەوجا كۆمەڵێك لە موسڵمانان مەرجی مردنێ دەكەن، بەسەركەوتویی نەبێ نەگەڕێنەوە، جا هەتا ئێوارە دادێ دەجەنگێن، هەردو لاش دەگەڕێنەوە، بێئەوەی چ لایەك سەركەوتوبن. ئەو مەرجەش هەر بەسەر دەچێ، كە ڕۆژی چارەم دادێ، ئەو موسڵمانانەی ماون دێنە هانا و، خودا كۆتاییەكەی بەوان دێنێ‌و، شەڕێك دەكەن شەڕی وا نەدیتراوە و نادیترێ. تەنانەت كە باڵندەیەكیان بەناودا ڕەت دەبێ ناگاتە دواییینیان كوژراوە، هەر باوكێك سەد كوڕیشی هەبن تەنها یەكێكیان بەزیندویی دەبینێتەوە، جا بە چ غەنیمەتێك شادبێ؟ و چ میراتێك بەش بكا؟ كە بەهەندێ خەریكن هەواڵی كارەساتێكی گەورەتریان پێدەگا،

[1] واتە بۆ شەڕخۆ تەیار دەكەن. ئەمەش پاش غەدری ڕۆم دەبێ. هەروەك لە فەرمودەی پێشو ئاماژەی بۆ كرا.
[2] مەبەست یوسەیری كوڕی جابیرە كە بگێڕەوەی فەرمودەیەكە لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعود.

هاوارێکیان بۆ دێ کە دەجال چۆتە نێو منداڵەکانیان، ئەوی لەدەستیاندا جێی دێڵن و دەگەڕێنەوە، لە پێشدا دە سواران دەنێرن، ئیبنی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إني لأعرف أسماءهم، وأسماء آبائهم، وألوان خيولهم، هم خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ، أو من خير فوارس على ظهر الأرض يومئذ: ئەمن ناویان دەزانم و، ناوی باببیشیان دەزانم و، دەزانم ڕەنگی هەسپەکانیان چۆنە، ئەوان چاکترین سواری ئەو کاتی سەر ڕوی زەوین، یا لە چاکترین سوارەکانی ئەوکاتی سەر ڕوی زەوین)).[1]

ئەو ڕزگارکردنەی قوستەنتینیە کە لە یەکەم فەرمودەی داستانەکەی هاوردمانەوە باسی هاتوە، بەشێوەیەکی وردتر لە فەرمودەی موسلیمدا هاتوە کە هەر ئەبو هورەیرە دەیگێڕتەوە و، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((سمعتم بمدينة جانب منها في البر، وجانب منها في البحر، قالوا: نعم، يا رسول الله، قال: لاتقوم الساعة حتى يغزوها سبعون ألفاً من بني إسحاق، فإذا جاؤوها نزلوا، فلم يقاتلوا بسلاح، ولم يرموا بسهم، قالوا: لا إله إلا الله، والله أكبر، فيسقط أحد جانبيها: گوێتان لەو شارەی بوە کە لایەکی دەکەوێتە وشکانی و لایەکی لە دەریایە[2]، گوتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: قیامەت دانایی هەتا هەفتا هەزار لە نەوەی ئیسحاق[3] بەسەریدا دەدەن، کە دەگەنە ئەو شارە، دادەبەزن و بە چەك شەڕێ ناکەن و تیرێکیش ناهاوێن، دەڵێن: لا إله إلا الله، والله اكبر، لایەکی شارەکە دەکەوێتە دەستیان)).

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب إقبال الروم في كثرة القتل، (٤/٢٢٢٣) ورقمه: (٢٨٩٩).

[2] زاناکان وای بۆچون ئەو شارە قوستەنتینیە بێ، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەرﷺ ناوی نەهێناوە، منیش وام بەبیردا هات ئەو شارە ڤینیسیا(بندقية) بێ لە ئیتالیا، چونکە بەشێکی زۆر لە ماڵەکانی لەسەر دەریا بنیات نراون و بەشێکی لە وشکانیە، لەکاتی سەردانی هەریەك لەو شارانەش تێم ڕوانیون و، وام دیوە کە ڤینیسیا لە مرازی فەرمودەکە نێزیکترە. خوداش زاناترە.

[3] نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا (٤٤\١٨) دەڵێ: (قازی دەڵێ: لە هەمو بنەڕەتەکانی صەحیحی موسلیمدا واهاتوە کە نەوەی ئیسحاقن، هەندێکیش دەڵێن: (ناسراوە و چاکەکانی نەوەی ئیسماعیلن، فەرمودەکەش ئەوە دەگەیەنێ و، مەبەستیش عەرەبە....)، منیش دەڵێم هیچ گرفتێك لێرەدا نیە. چونکە دین هی هەمو خەڵکە. کێ خوداش بیەوێ مولکی دەداتێ، موحەممەدی فاتیح زیاتر لە سێسەد ساڵ پاش نەوەوی غەزای قوستەنتینیەی کرد، زۆرینەی سەربازەکانیشی غەیرە عەرەب بون، دوریش نیە دوبارە شتێکی وا ڕوبداتەوە. فەرمودەی داستانەکەی پێشتر باس کرا بەڵگەیە لەسەری؛ ڕۆمەکان بە موسڵمانەکان دەڵێن لێمان گەڕێن لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگێین کە لە خۆمانن و موسڵمان بون.

**ثەور[1] دەڵێ هەروام زانیوە کە فەرموی:**

((الذي في البحر، ثم يقولون الثانية: لا إله إلا الله والله أكبر، فيسقط جانبها الآخر، ثم يقولون الثالثة: لا إله إلا الله والله أكبر، فيفرج لهم، فيدخلوها، فيغنموا، فبينما هم يقتسمون الغنائم، إذ جاءهم الصريخ، فقال: إن الدجال قد خرج، فيتركون كل شيء ويرجعون:

**ئەو لایەی کە لە دەریایە، پاشان دوبارە دەڵێن: لا إله إلا الله والله أكبر، دیوەکەی دیکەشی دەکەوتە دەستیان، پاشان بو سێیەم جار دەڵێن: لا إله إلا الله و الله أكبر، بۆیان دەکرێتەوە و، دەچنە ناوی و، غەنیمەتەکەی دەگرن، کە بەدابەشکردنی غەنیمەت خەریك دەبن هاوارێك دێ و، دەڵێ: دەجال وەدەرکەوتوە، ئەوانیش هەمو شتێك جێ دێڵن و دەگەڕێنەوە.))[2]**

## خوازگەی چوارەم

## قاتوقڕی و برسیەتی پێش دەرکەوتنی دەجال

**لەپێش هاتنی دەجالدا خەڵکی بەڵایەکی توند و سەختیان بەسەردێ، ئاسمان باران دەگرێتەوە و، زەوی ڕوەك ناڕوێنێ.**

**لەسونەنی ئیبنی ماجە و، صەحیحی ئیبنی خوزەیمە و، موستەدرەکی حاکیمدا لە ئەبو ئومامە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إن قبل خروج الدجال ثلاث سنوات شداد، يصيب الناس فيها جوع شديد، يأمر الله السماء في السنة الأولى أن تحبس ثلث مطرها، ويأمر الأرض أن تحبس ثلث نباتها، ثم يأمر السماء في السنة الثانية فتحبس ثلثي مطرها، ويأمر الأرض فتحبس ثلثي نباتها، ثم يأمر السماء في السنة الثالثة فتحبس مطرها كله، فلا تقطر قطرة، ويأمر الأرض فتحبس نباتها كله، فلا تنبت خضراء، فلا يبقى ذات ظلف، إلا هلكت إلا ما شاء الله. قيل: فما يعيش الناس في ذلك الزمان؟ قال: التهليل، والتكبير، والتحميد، ويجزيء ذلك عليهم مجزأة الطعام:

---

[1] ثەوری کوری زەیدی دەیلی، یەکێك لە بگێرەوەکانی فەرمودەکە.

[2] راوه مسلم، كتاب الفتن، (٤\٢٢٣٨)، و رقمة: (٢٩٢٠).

پێش هاتنی دەجال سێ ساڵی سەخت هەن، خەڵکی تێیاندا توشی برسێتی توند دەبن؛ لە ساڵی یەکەمدا خودا فەرمان دەداتە ئاسمان سێیەکی بارانەکەی بگرێتەوە و، فەرمانیش بە خاك دەدات سێیەکی روەکەکانی بەندکا. پاشان لە ساڵی دوەمدا فەرمان بە ئاسمان دەدا دو سێیەکی بارانەکەی بگرێتەوەو، فەرمانیش بە زەوی دەدا دو سێیەکی روەکەکانی بەندکا. پاشان لە ساڵی سێیەمدا فەرمان بە ئاسمان دەدا هەمو بارانەکەی بگرێتەوە و، دڵۆپی لێ نەتکێ، فەرمانیش دەداتە زەوی هەمو ڕوەکەکانی بەندکا و پنجکی لێ نەڕوێ، جا هیچ ئاژەڵێکی سمدار نامێنێ و هەموی تێدەچێ، بێجگە لەوانەی خودا ویستی لەسەرە. گوتیان: ئەدی چی خەڵکی لەو سەردەمی دەژیێنێ؟ فەرموی: گوتنی، لاإلە إلا الله، الله أکبر ، و الحمد لله، ئەوانەش جێی خواردنیان بۆ دەگرنەوە)).[1]

## خوازگەی پێنجەم

## سیفەت و نیشانەکانی دەجال

دەجال بانگەشەی پەروەردگارێتی دەکا، کاری دەراسای واش ئەنجام دەدا ڕەواج بە ناڕەواکەی دەدا. دەگاتە ڕادەیەك پیاو هەیە دێتە لای، وادەزانێ مەسەلەکەی لێ تێکەڵ نابێ و فڕوفێڵەکانی بەسەردا تێپەڕنابێ و، ناڕەواکەی ڕەواجی لەلای نابێ، بەڵام کاتێك دێتە لای و کارە دەراساکانی دەبینێ، شوێنی دەکەوێ.

لە سونەنی ئەبو داود، بە سەنەدێکی صەحیح لە عیمرانی کوڕی حوصەین هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من سمع بالدجال فلينأ عنه، فوالله إن الرجل ليأتيه وهو يحسب أنه مؤمن، فيتبعه، مما يبعث به من الشبهات، أو لما يبعث به من الشبهات: ئەو کەسەی گوێی لە هەواڵی دەجال بو با لێی وەدورکەوێ، سوێند بەخوا پیاو هەیە دێتە لای و خۆی بەبڕوادار دەژمێرێ، کەچی بەهۆی ئەو گومانانەی دەیهێنێتە ئارا شوێنی دەکەوێ.))[2]

---

[1] صحيح الجامع: (٦/٢٢٧) ورقمه: (٧٧٥٢).

[2] الجامع الأصول: (١٠/٣٥٤) ورقمه: (٧٨٤٦).

ئەو کەسەی ژیرانە چاو بداتە مەسەلەی دەجال یەقینێکی تەواوی لا پەیدا دەبێ کە بانگەوازەکەی بەتاڵە، سیفەتەکانی پەروەردگارێتی لێ وەدی نایەن و، مرۆڤێکی کەنەفت و بەستەزمانە، سەرەڕای ئەو کارانەی لەسەر دەستیشی ڕودەدەن، دەخوا و دەخواتەوە و دەنوێ، میز و پیسایی دەکات، هەر کەسێکیش ئەمە حاڵی بێ چۆن دەبێتە خودایەکی پەرستراو و، پەروەردگاری بونەوەران لە کاتێکدا کە بۆ خۆی پێویستی بەوانە!!

سەرەڕای ڕون و ئاشکرایی، پێغەمبەر ﷺ باسی زۆران سیفات و حاڵی وی بۆ کردوین، تا ئەگەر لە هەر سەردەمێکدا وەدەرکەوت، بڕواداران بیناسنەوە و، هەتا بتوانن روبەڕوی ببنەوە و بە ناڕەواکەی فریونەدرێن.

## سیفەتە گشتیەکان

پێغەمبەر ﷺ وەسفێکی وای دەجالی کردوە، کەسێتیەکەی دەردەخا و وێنەی شێوەی جەستەی دەکێشێ. لە صەحیحی بوخاریدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ لەخەونێ دەجالی دیت و بەم شێوەیە وەسفی فەرمو:

((رجل جسيم، أحمر، جعد الرأس، أعور العين، كأن عينه عنبة طافية،... أقرب الناس به شبها إبن قطن من خزاعة: پیاوێکی بەخۆوەیە، سورەیە، پرچی بەگروازەیە، چاوێکی کوێرە، چاوی وەك دەنکە ترێی دەرپەڕیوە،... نێزیکترین کەسێك بەوی بچێ کوڕی قوطنە لە خوزاعە))[1].

لە موسنەدی ئەحمەد و سونەنی ئەبو داود بەسەنەدێکی صەحیح هاتوە لە عوبادەی کوڕی صامیت، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إني حدثتكم عن الدجال حتى خشيت أن لا تعقلوا، إن المسيح الدجال رجل قصير، أفحج، جعد، أعور، مطموس العين، ليست بناتئة ولا حجراء، فإن ألبس عليكم، فاعلموا أن ربكم ليس

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩٠).

بأعور، وأنكم لن تروا ربكم: هێندەم باسی دەجال بوکردن، ترسی ئەوەم هەیە عەقڵتان نەیبڕێ. مەسیحی دەجال پیاوێکی کورتە باڵایە، شەلەیە بەشێوەیەك سینگەپێی لێك نزیك و پاشپانیەکانی لێك دورن، پرچ گروازەیە، چاوی داپۆشراوە، نەدەرپەڕیوە، نەبەقوڵدا چوە. ئەگەر لێتان تێکەڵ بو بزانن پەروەردگارتان کوێر نیە، ئێوەش پەروەردگارتان نابینن)).[1]

هەمدیس لە صەحیحی ئیبنی حیبان و موسنەدی ئەحمەددا هاتوە، لە ئیبنی عەبباسەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((الدجال أعور، هجان أزهر، كأن رأسه أصلة، أشبه الناس بعبد العزي بن قطن، فإمّا هَلَكَ الهُلَّك، فإن ربكم ليس بأعور: دەجال کوێرە، سپی و سوورە، سەری وەك مارێکی زل وایە، زۆر بەعەبدولعوززای کوری قوطن دەچێ، جا ئەگەر نەزان و گومڕا و فەوتاوان بەهۆی دەجالەوە فەوتان، بزانن خودای پەروەردگارتان کوێر نیە)).[2]

## کوێری دەجال

پێغەمبەر ﷺ زۆر وەسفی چاوانی دەجالی فەرموە، چونکە دەجال هەرچەندە سیفەتەکانی دیکەی بشارێتەوە و خۆیان لێ دەربازکا، ناتوانێ خۆی لە چاوانی دەربازکا و لێیان رزگاربێ. پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی رونکردۆتەوە کە دەجال کوێرە، لەهەندێك فەرمودانیش داهاتوە کە چاوی ڕاستەی کوێرە هەندێك فەرمودەی تریش دەڵێن چاوی چەپیەتی، راستریش وایە ڕاستەی کوێربێ، چونکە فەرمودەکانی بوخاری و موسلیم دەیگرنەوە. پێغەمبەریش ﷺ ئەو چاوی بە دەنکە ترێی دەرپەڕیو شوبهاندوە. لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتوە، کە چاوی راستەی کوێرە و دەرپۆقیوە و ناشاردرێتەوە و، وەکو بەڵغەمی سەر دیوارێکی سپیکراو وایە.

---

[1] صحيح الجامع الصغير: (٢/٣١٨)، ورقمه (٢٤٥٥).

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣/١٩٠) ورقم الحديث (١١٩٣)، وقال الشيخ ناصر فيه: (صحيح على شرط مسلم).

**له صه‌حیحی بوخاری له عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر هاتوه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ له باره‌ی ده‌جال فه‌رموی:** ((اعور العين اليمنى، كأنها عنبة طافيــة: **چاوی ڕاسته‌ی کوێره و، ده‌نێی ده‌نکه ترێی ده‌رپه‌ڕیوه)).**[1]

**له‌لای ئه‌حمه‌دیش، له فه‌رموده‌ی ئه‌بو سه‌عید هاتوه:** ((وعينه اليمنى عوراء جاحظة لا تخفى، كأنها نخاعة في حائط مجصص، وعينه اليسرى كأنها كوكب دري: **چاوی ڕاسته‌ی کوێره و ده‌رپۆقیوه و ناشاردرێته‌وه، ده‌ڵێی بەڵغه‌مه له‌سه‌ر دیوارێکی سپیکراو، چاوی چه‌په‌شی وه‌کو ئه‌ستێره وایه)).**[2]

**له‌گه‌ڵ هه‌ندێشدا چاوی سڕاوه‌ته‌وه و داپۆشراوه، له صه‌حیحی موسلیمدا هاتوه:** ((الدجال ممسوح العين: **ده‌جال چاوی داپۆشراوه)).**[3]

**ئه‌وه‌ی ئاڕاسته‌ی گێڕانه‌وه‌کانی به‌ره‌و لایه‌کی دی بردوه، وا‌ده‌بینێ که هه‌مو ئه‌و گێڕانه‌وانه‌ی هه‌ردو چاوانی به (عوراء) وه‌سفی ده‌که‌ن ڕاستن، ئه‌م وشه‌یه‌ش لێره‌دا له پێی زمانی عه‌ره‌بی به واتای عه‌یب دێ، هه‌ردو چاوی ده‌جالیش عه‌یبدارن، ئه‌م وه‌سفه‌ش دراوه‌ته پاڵ چاوی ڕاست و دراوه‌ته پاڵ چاوی چه‌پیش. هه‌روه‌ها وشه‌ی (طافية) بۆ یه‌کێکیان به‌کارهاتوه، واته کوژاوه‌ته‌وه و دامرکاوه و ڕوناکی لێبڕاوه. بۆ ئه‌وی تریش (طافية) به‌کارهاتوه، واته: ده‌رپه‌ڕیوه و به‌رجه‌سته‌یه. جابه‌پێی تۆژینه‌وه‌ی ئه‌وه‌وی، چاوێکی نابینێ چونکه ڕوناکی تێدا نه‌ماوه، ئه‌مه‌شیان داپۆشراوه و نه‌ده‌رپه‌ڕیوه و نه‌به‌قوڵداچوه، به‌ڵام چاوه‌که‌ی دی کوێر و بێ ڕوناکی نیه، به‌ڵکو نه‌نگی و عه‌یبێکی تری هه‌یه، که ده‌رپه‌ڕین و به‌رجه‌سته‌ییه.[4] له گێڕانه‌وه‌یه‌کی لای موسلیمیشدا هاتوه که چاوه داپۆشراوه‌که‌ی تانه‌یه‌کی ئه‌ستوری**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩٠)، ورواه مسلم في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، (٤/٢٢٤٧).

[2] فتح الباري: (١٣/٩٨).

[3] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٤٨)، ورقمه (٢٩٣٣).

[4] بگەڕێوه بۆ: شرح النووي على مسلم: (١٨\٦١)

لەسەرە: ((ان الدجال ممسوح العين، عليها ظفــرة غليظــة)). (ظفرة) بەواتای تانە دێ کە پێستەیەکە چاو دادەپۆشێ. ئەلئەصمەعیش دەڵێ: بریتیە لە پارچە گۆشتێك لەلای پیڵوانەوە دەڕوێ. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەو چاوی بۆ وەسف کردوین کە پێی دەبینێ، دەفەرموێ: ((الدجال عينه خضراء كالزجاجة: چاوی دەجال سەوزە و دەڵێی شوشەیە)).[1]

## لەنێوچاوانی نوسراوە کافر

نیشانەیەکی دیکەش هەیە خودای مەزن دەجالی پێ مۆرکردوە، تەنیا بڕواداران دەجالی پێ دەناسنەوە، نەك ئەو بێبڕوایانەی خودا چاوی دڵی کوێر کردون. ئەم نیشانەیەش بریتیە لە نوسینی هەر سێ پیتی (ك ف ر) یا وشەی (کافر) لەنێوچاوانی.

لە صەحیحی بوخاریدا لە ئەنەس هاتوە، لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ما بعث نبي إلا أنذر أمته الأعور الكذاب، ألا إنه أعور، وإن ربكم ليس بأعور، وإن بين عينيه مكتــوب كــافر: هەر پێغەمبەرێك ڕەوان کرابێ، ئوممەتەکەی خۆی لە یەکچاوی درۆزن ئاگادار کردۆتەوە، بزانن ئەو کوێرە و، پەروەردگارتان کوێر نیە، لەنێوچاوانیشی نوسراوە کافر)).[2]

لە صەحیحی موسلیمیشدا وەکو گێڕانەوەی بوخاری هەیە، بەڵام لەوێدا دەڵێ: ((مكتــوب بــين عينيــه: "ك ف ر": لەنێوچاوانی نوسراوە "ك ف ر")).[3]

لە صەحیحی ئیبنی خوزەیمە و سونەنی ئیبنی ماجە و موستەدرەکی حاکیم بە ئیسنادێکی صەحیح لە ئەبو ئومامە هاتوە: ((وانه مكتوب بين عينيه كافر، يقــرؤه كــل مؤمن كــاتب او غــير كــاتب: دەجال لەنێوچاوانی نوسراوە: کافر، هەمو بڕوادارێك

[1] رواه احمد و ابو نعيم باسناد صحيح، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٤٧٧) ورقم الحديث (١٨٦٣).
[2] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩٠).
[3] رواه مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٤٨)، ورقم الحديث (٢٩٣٣).

دەیخوێنێتەوە، خوێندەوار بێ یان نەخوێندەوار)).[1] لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە: ((انه مكتوب بين عينيه كافر، يقرؤه من كره عمله، او يقرؤه كل مؤمن: لەنێوچاوانی نوسراوە كافر، هەركەسێكی رقی لە كردەوەكانی ببێتەوە، دەیخوێنێتەوە، یا هەمو بڕوادارێك دەیخوێنێتەوە)).[2]

نەوەوی (بەرمیهری خودا كەوێ) دەڵێ:

ئەو راستیەی تۆژەروان لەسەرینەشوەیە، كە ئەم نوسینە ئاشكرا و دیارە و نوسینی راستەقانیە. خودای مەزن كردیتیە یەكێك لە نیشانە و بەڵگە بڕەڕەكانی كە دەجال بە بێبڕوا و درۆزن و ناڕەوا دادەنێن. جا خودای گەورە بۆ موسڵمانی خوێندەوار و نەخوێندەواری دەردەخا و، لەو كەسەشی دەشارتەوە، كەشیاوی ناشادی ماڵ وێرانیە. عیاضی قازی باسی جیاڕاییەكی كردوە؛ كە هەندێك دەڵێن نوسینەكە راستەقینەیە، هەروەك باسمان كردن، هەندێكیش دەڵێن مەجازە و ئاماژەیە بۆ سیما دیارەكانی، ئەوەشی كردۆتەوە بەڵگە و بیانو كە دەفەرمێ هەمو بڕوادارێكی خوێندەوار و نەخوێندەوار دەیخوێنێتەوە. بەڵام ئەم بۆچونە لاوازە)[3].

## وەچەی لێ ناكەوێتەوە

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین كە دەجال ((عقيم لايولد لە: نەزۆكە و منداڵی لێ ناكەوێتەوە)).[4]

---

[1] صحيح الجامع: (٦/٢٧٤) ورقمه (٧٧٥٢).

[2] رواه مسلم،كتاب الفتن، باب ذكر ابن صياد، (٤/٢٢٤٥).

[3] شرح النووي على مسلم: (١٨\٦٠).

[4] رواه مسلم في صحيحه، صحيح مسلم: (٤/٢٢٤٢-٢٢٤٣).

## خوازگەی شەشەم

# پوچەڵی بانگەشەکەی بۆ پەروەردگارێتی

ئەگەر ئەوانە سیفەتی دەجال بن، کە بێگومان گەلێك ناتەواوی و کەموکوڕی گەورەیان تێدایە، چۆن ڕاستە ئەو ئافەریدە(مخلوق) لاوازە بانگەشەی پەروەردگارێتی بکا. دەڵێ من پەروەردگاری خەڵکیم، دیارە پەروەردگاریش لە دنیایێ نادیترێ. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تعلموا أنه لن يرى أحد منكم ربه حتى يموت: فێر بن کە هیچ یەکێك لە ئێوە تا نەمرێ، پەروەردگاری خۆی نابینی))[1]؛ پاشان دەجال شێوەی ناڕێك و ناتەواوە، نەنگی وای تێدایە ناشاردرێتەوە، وەکو کوێریەکەی. پێغەمبەرﷺیش لەم بارەوە دەفەرموێ: ((إن الله لا يخفى عليكم، إن الله ليس بأعور، وأشار بيده إلى عينيه–وإن المسيح الدجال أعور عين اليمنى، كأن عينه عنبة طافية: خودا لێتان بزر نابێ، خودا کوێرە نیە، –بەدەستی ئاماژەشی بۆ چاوانی خۆی کرد– بەڵام مەسیحی دەجال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی وەك بۆڵە ترێ دەرپۆقیوە)).[2]

یەکێکی دی لە نەنگیە دیارەکانی دەجال قاچ چوێڕیەکەیەتی، (کە مانای لێك دوری ڕان و قاچەکانیەتی، دەشڵێن بریتیە لە لێك نزیکی سینگەپێیەکانی و، لێك دوری پاشیانیەکانی، هەروەها دەڵێن بریتیە لە خواروخێچی قاچەکان).[3]

ئیبنیعەرەبی ڕاست دەکا کە دەڵێ: (دەرخستن و خستنەڕوی سیفەت و کەموکوڕیە جیاجیاکانی دەجال ئەوە دەگەیەنێ کە ناتوانێ کەموکوڕی خۆی چارەبکا هەر چۆنێك بێ، لە خودی خۆیدا حوکمی بەسەردا بڕاوە).[4] مرازی ئەوەیە، ئەگەر

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، (٤/٢٢٤٥).

[2] صحيح البخاري، كتاب التوحيد، باب قول الله ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ فتح الباري: (٣٨٩/١٣).

[3] فتح الباري: (١٣\٩٧).

[4] فتح الباري: (١٣\٩٨).

دەجال پەروەردگار بایە، ئەو کەم وکورتیانەی لادەبرد کە لە خۆیدا هەن، کە لایان نابا. بەڵگەی ئەوەیە بەندەیەکی لاوازی دەستەوسانە و، ناتوانێ خۆ لەنەنگیەکانی دەرباز بکا.

پێغەمبەرﷺیش بۆیە جەختی کردۆتە سەر کوێریەکەی (چونکە کوێریی شوێنەوار و نیشانەیەکی دیارە، زاناو رەشۆکی خەڵکی هەستی پێ دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کە پەی بە بەڵگەی عەقڵی نابەن). دەنا زانایان دەرکی پێ دەکەن و دەگەنە حەقیقەتی بانگەشەکەی.[1]

## خوازگەی هەفتەم

## توانستەکانی دەجال کە مایەی ئاشوب نانەوەن

دەجال داوای خوداوەندێتی دەکا، توانستی واش دەردەخا سەراسان(مذهل) و، خەڵك توشی ئاشوب و ئاقیکردنەوەی گەورە دەکەن، لەوانەش:

١- خێرایی گوزەرکردن(انتقال)ی بەزەویدا:

لەبارەی خێرایی دەجال لە زەویدا، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرموی: ((کالغیث استدبرته الریـــح...: وەکو بارانێکە بایەکی توندی بە دواوەبێ))[2] هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە دەجال بە هەمو وڵاتانی زەویدا دەگەڕێ و، لە مەککە و مەدینـــە بـــترازێ دەچێتـــە هـــەمو شـــارێك، هـــەروەك دەفـــەرموێ: ((لیس من بلد الا سیطؤه الدجال الا مکة و المدینة: دەجال پێ دەنێتە هەمو شارێك بێجگە لەمەککە و مەدینە))[3].

هەروەها دەفەرموێ: ((وانه لا یبقی شيء من الأرض الا وطئه وظـــهر علیـــه، الا مکـــة والمدینـــة، ولا یأتیـــهما مـــن نقـــب مـــن أنقابهـــا الاّ لقیتـــه الملائکـــة بالســـیوف صلتـــه:

---

[1] فتح الباري: (١٣\٩٦)

[2] حدیث النواس بن سمعان في صحیح مسلم. صحیح مسلم، کتاب الفتن، باب ذکر الدجال: (٤/٢٢٥٢)، ورقمه (٢٩٣٧).

[3] حدیث انس في الصحیحین. صحیح الجامع الصغیر، (٥/٩٩)، ورقم الحدیث (٥٣٠٩).

هیچ خاکێك نامێنی پێ لێ نەنێ و، بەسەریدا سەرنەکەوێ، جگە لەمەککە و مەدینە. لەهەر دەرگەیەك لە دەرگەکانیەوە بۆیان بێ، فریشتە بە شمشێری هەڵکێشراوەوە ڕوبەڕوی دەبنەوە)).[1]

٢- بەهەشت و دۆزەخەکەی:

لەو شتانەی دەجال خەڵکی پێ تاقیدەکرێتەوە، ئەوەیە کە وەکو بەهەشت و دۆزەخی پێیە؛ یاوەکو ڕوبارە ئاوێك و، ڕوبارە ئاگرێك، لە ڕاستیشدا ئەو دو ڕوبارە وانین کە لەخەڵکی دیارن، بەڵکو ئەوی بە ئاگری تێدەگەن ئاوێکی ساردە و، ئەوی بە ئاوی ساردیشی تێدەگەن ئاگرە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((معه –أي الدجال– جنة ونار، فناره جنةُ، وجنته نار: دەجال بەهەشت و دۆزەخی لەگەڵە، جا دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەی دۆزەخ)).[2]

هەروەها لەبارەی دەجال دەفەرموێ: ((ان معه ماءً و ناراً، فناره ماء بارد، و ماءه نار، فلا تهلكوا: دەجال ئاو و ئاگری لەگەڵدایە، ئاگرەکەی ئاوێکی ساردە و، ئاوەکەشی ئاگرە، جا بە هیلاك مەچن)).[3]

لە صەحیحی موسلیمیشدا لە حوذەیفە هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لأنا أعلم بما مع الدجال منه، معه نهران يجريان، أحدهما، رأى العين ماء أبيض، والآخر، رأى العين نار تأجج، فإمّا أدركنّ أحد، فليأت الذي يراه ناراً وليغمض، ثم ليطأطيء رأسه فيشرب منه، فإنه ماء بارد: من لە خودی دەجالیش زیاتر دەزانم چی لەگەڵدایە، دو ڕوباری ڕێکردوی لەگەڵدایە، یەکێکیان لەبەر چاواندا ئاوێکی سپیە و، ئەوی دیکەش لەبەرچاوان ئاگرێکی هەڵایساوە، ئەگەر هەر یەکێکی گەیشتێ، با بچێتە سەر ئەوی بە ئاگری دەبینێ و چاوی بنوقێنێ، ئەوجا سەری دانەوێنێ و لێی بخواتەوە، چونکە ئەوە ئاوێکی

---

[1] حديث اب امامة عند ابن ماجة و ابن خزيمة و الحاكم. صحيح الجامع الصغير، (٦/٢٧٥)، ورقمه (٧٧٥٢).

[2] في صحيح مسلم عن حذيفة. رواه مسلم في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٤٨)، ورقم الحديث (٢٩٣٤).

[3] صحيحي البخاري و مسلم عن حذيفة عن النبي. رواه البخاري في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، فتح الباري: (١٣/٩٠)، ورواه مسلم في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٤٩)، ورقم الحديث (٢٩٣٤).

**سارده)).**[1]

**لــه ریوایــەتێکی دیکــەی موســلیمدا، هــەر لــه حوذەیفــەوە، دەفــەرموێ:** ((إن الدجال يخرج، وإن معه ماءً ونارا، فأما الذي يراه الناس ماء فنار تحرق، وأمّا الذي يـــراه النـــاس نارا، فماء بارد عذب، فمن أدرك ذلك منكم فليقع في الذي يراه نـــاراً، فإنـــه مـــاء عـــذب طيـــب: **دەجال کە دەردەکەوێ و، ئاوێك و ئاگرێکی لەگەڵدایە، ئەوی خەڵك بە ئاوی دەبینن، ئاگرێکی سوتێنەرە، ئەوەی بە ئاگریشی دەبینن، ئاوێکی ساردی سازگارە، هەریەکێك لە ئێوە بەو شتانە گەیشت با بکەوێتە سەر ئەوەی بە ئاگری دەبینی، چونکە ئەویان ئاویکی ساز و بەتامە)).**[2]

**لەم دەقانەدا دەردەکەوێ خەڵك ناگەنە حەقیقەتی ئەو شتانەی لەگەڵ دەجال دایە، ئەوی دەشیبینن ڕاستەقانی نیە بەشکو پێچەوانەیەتی، بۆیە لە هەندێك فەرمودان لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە:** ((وإنه يجيء معه مثل الجنة والنار، فالتي يقول: إنها الجنة هي النـــار: **دەجال دێ و، وەکو بەهەشت و دۆزەخی لەگەڵە، ئەوی دەڵێ: ئەوەیان بەهەشتە ئەوە دۆزەخە)).**[3]

**٣- کۆمەکخوازتنی لە شەیتانان:**

**گومـان لـەوەیدا نیـە کـە دەجـال کۆمـەك لـە شـەیتانان دەخـوازێ و، ئاشکراشـە شەیتانەکان خزمەتی کەسێك ناکەن مەگەر لەوپەڕی گومڕایی دابێ و، بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((وإن من فتنته أن يقول للأعـــرابي: أرأيـــت إن بعثت لك أباك وأمك، أتشهد أني ربك؟ فيقول: نعم، فيتمثل له الشيطان في صورة أبيـــه وأمـــه، فيقولان: يا بني اتبعه، فإنه ربــك: **یـەك لـە ئاشوبەکانی دەجـال ئەوەیـە کـە بـە دەشتەکیەك دەڵـێ: ئـەدی ئەگـەر بـاوکت و دایکتـم بـۆ ژیاندیـەوە، شـایەدی دەدەی کـەمن پەروەردگاری تۆم؟ دەڵێ: بەڵێ، جا شەیتان خۆی بەوێنەی باوك و دایکی وی پیشان**

[1] رواه مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٤٩)، ورقم الحديث (٢٩٣٤).
[2] رواه مسلم، كتاب الفتن، (٤/٢٢٥٠)، ورقم الحديث (٢٩٣٥).
[3] رواه مسلم، كتاب الفتن، حديث رقم (٢٩٣٦).

دەدات و. پێی دەڵێن: کوڕەکەم شوێنی کەوە، ئەوە پەروەردگارتە)).[1]

٤- بەرئەمربون(استجابة)ی بێگیان و گیانەوەران بۆ دەجال:

ئاشوبێکی دیکەی دەجال کە خودا بەندەکانی خۆی پێ تاقیدەکاتەوە، ئەوەیە کە فەرمان بە ئاسمان دەکا و ئەویش دەبارێنی و، فەرمان بە زەوی دەدا، دەڕوێنێ، بانگی ئاژەڵان دەکاو شوێنی دەکەون، فەرمان بە کاولگەکان دەکا تا گەنجینە شاردراوەکانیان دەربخەن، ئەوانیش بۆی دەردەخەن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((فيأتي على القوم فيدعوهم، فيؤمنون به، ويستجيبون له، فيأمر السماء فتمطر، والأرض فتنبت، فتروح عليهم سارحتهم، أطول ما كانت ذرا، وأصبغه ضروعاً، وأمده خواصر، ثم يأتي القوم، فيدعوهم، فيردون عليه قوله، فينصرف عنهم، فيصبحون ممحلين، ليس بأمرهم شيء من أموالهم، ويمر بالخربة فيقول لها: أخرجي كنوزك، فتتبعه كنوزها كيعاسيب النحل: دێتە لای قەومێك و بانگیان دەکا، ئەوانیش بڕوای پێ دێن، جا فەرمان بە ئاسمان دەدا و دەبارێ، فەرمان بە زەوی دەدا و شین دەبێ، ماڵاتیان ئێواری بۆ ماڵێ دەگەڕێتەوە بەرز و گوان پڕ، کەڵەکە هەڵاوساو. پاشان بەلای قەومێکی دیکەدا دەڕوا و بانگیان دەکا، ئەوانیش گوێ نادەنە قسەی، ئەویش وازیان لێدێنێ، جا هەمو هەژار دەبن لەماڵ و موڵکی خۆیان هیچیان لەدەست نامێنی. بەلای کەلاوەدا ڕەتدەبێ پێی دەڵێ: گەنجینەکانت وەدەرخە، جا گەنجینەکەی وەك پورەی هەنگ شوێنی دەکەوێ)).[2]

٥- کوشتن و زیندو کردنەوەی ئەو جحێڵە لەلایەن دەجالەوە:

ئاشوبێکی دیکەشی ئەوەیە، کە وا بۆ خەڵکی دەردەخا ئەو گەنجە بڕوادارە دەکوژێ و. پاشانیش بانگەشە دەکا کە زیندوی کردۆتەوە. لەصەحیحی بوخاریدا لە ئەبوسەعیدەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەدرێژی باسی دەجالی بۆ فەرموین،

---

[1] سنن ابن ماجة و صحيح ابن خزيمة و مستدرك حاكم باسناد صحيح عن ابي امامة. صحيح الجامع الصغير، (٢٧٤/٦)، ورقمه(٧٧٥٢).

[2] في صحيح مسلم عن النواس بن سمعان. صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٢٢٥٢/٤)، ورقمه (٢٩٣٧).

**لەمیانەی ئەو فەرمودەیەدا فەرموی:**

((يأتي الدجال-وهو محرم عليه أن يدخل نقاب المدينة- فينـــزل بعض السباخ التي تلي المدينة، فيخرج إليه يومئذ رجل هو خير الناس، أو من خيار الناس، فيقول: أشهد أنك الدجال الذي حدثنا رسول الله ﷺ حديثه، فيقول الدجال: أرأيتم إن قتلت هــذا ثمّ أحييته، هل تشكون في الأمر؟ فيقولون: لا، فيقتله، ثم يحييه، فيقول: والله ما كنـت فيك أشد بصيرة مني اليـــوم، فـيريد الدجـال أن يقتلـه، فـلا يسـلط عليـه: **دەجال دێ و، لێشی حەرامە بچێتە ڕێچکە و کەلەبەرەکانی مەدینە، بەڵام لە ئاقاری مەدینەی هەڵدەدا، پیاوێکی بۆ دەردەکەوێ، ئەو کاتی چاترینی خەڵکیە، یا لە چاترینی خەڵکیە، دەڵێ: شایەدی دەدەم تۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەر ﷺ باسی بۆ فەرموین، دەجال دەڵێ: ئەگەر من لەبەر چاوی ئێوە ئەوەم کوشت و پاشان زیندوم کردەوە، گومانتان لە مەسەلەکەدا دەمێنی؟ دەڵێن: نەخێر. جا دەیکوژێ و پاشان زیندوی دەکاتەوە. گەنجەکەش دەڵێ: سوێند بە خوا پێشتر هێندی ئەمڕۆ لە ئاست تۆ دڵڕون(بصيرة) نەبوم، ئەوجا دەجال دەکەوێتە هەوڵی کوشتنی، بەڵام بەسەریدا زاڵ نابێ)).**[1]

**موسلیمیش لە ئەبو سەعیدی خودری، بەم بێژەیە دەیگێڕتەوە:**

((يخرج الدجال، فيتوجه قبله رجل من المؤمنين، فتلقاه المسالح: مسالح الدجال: فيقولون لــه: أين تعمد؟ فيقول: أعمد إلى هذا الذي خرج. قال: فيقول له: أو ما تؤمن بربنا؟ فيقول: ما بربنــا خفاء، فيقولون: أقتلوه، فيقول بعضهم لبعض: أليس قد نهاكم أن تقتلــوا أحــداً دونــه؟ قــال: فينطلقون به إلى الدجال، فإذا رآه المؤمن، قال: يا أيها الناس، هذا المسيح الدجال الــذي ذكــر رسول الله ﷺ، قال: فيأمر به الدجال فيشبح، فيقول: خذوه وشجوه، فيوسع ظهره وبطنه ضرباً، قال: فيقول: أوما تؤمن بي؟ قال: فيقول: أنت المسيح الكذاب، قال: فيؤمر به فيؤشر بالمنشار مــن مفرقه حتى يفرق بين رجليه. قال: ثم يمشي الدجال بين القطعتين، ثم يقول له: قم، فيستوي قائمــاً، قال: ثم يقول له: أتؤمن بي؟ فيقول: ما أزددت فيك إلا بصيرة، قال: ثم يقول: يا أيها الناس، إنــه

[1] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب: لا يدخل الدجال المدينة، فتح الباري: (١٣/١٠١)، ورواه مســلم في كتاب الفتن، باب صفة الدجال، (٤/٢٢٥٦)، ورقم الحديث (٢٩٣٨) ولفظ الحديث للبخاري.

لا يفعل بعدي بأحد من الناس. قال: فيأخذه الدجال ليذبحه، فيجعل ما بين رقبته إلى ترقوته نحاساً، فلا يستطيع إليه سبيلاً. قال: فيأخذ بيديه ورجليه، فيقذف به، فيحسب الناس أنما قذفه إلى النار، وإنما ألقي في الجنة. قال: فقال رسول الله ﷺ "هذا أعظم الناس شهادة عند رب العالمين":

دەجال دەردەکەوێ. پیاوێك لە بڕواداران بەرەو ڕوی دەچێ، چاودێر و نۆبەتداران(خفر)ی دەجال دەیگرن و پێی دەڵێن: بۆ کوێ؟ دەڵێ: بۆ لای ئەو کەسەی دەرکەوتوە. دەڵێ: جا پێی دەڵێن: ئەی بڕوا بە پەروەردگاری ئێمە ناهێنی؟ دەڵێ: پەروەردگاری ئێمە دیارە و پەنهان نیە. دەڵێن بیکوژن. هەندێك بە هەندێك دەڵێن: ئەدی دەجال نەهی لێ نەکردن کەسی بێ وی نەکوژن؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: جا دەیبەنە لای دەجال. کە بڕوادارەکە چاوی بەدەجال دەکەوێ، دەڵێ: هۆ خەڵکینە ئەمە ئەو دەجالەیە کە پێغەمبەر ﷺ باسی فەرموە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: جا دەجال فەرمان دەدا: بیگرن و لەسەر زگ رایکێشن. کە ڕایانکێشا تێر تێر لەبەرویشتی ئەو پیاوە موسڵمانە دەدرێ. دەجال پێی دەڵێ: هێشتا بڕوام پێ ناهێنی، دەڵێ: تۆ مەسیحی درۆزنی. فەرموی: جا فەرمان دەدا بە مشار دابهێنرێ، لەتەپڵی سەریەوە تا ناولنگی لێك جوێ دەکرێتەوە. فەرموی: دەجال بەنێوان هەردو کەرتەکەیدا دەڕوا. ئنجا دەجال پێی دەڵێ: هەستە، هەڵدەستێتەوە سەرپێ. فەرموی: ئەوجا پێی دەڵێ: وام لێکردی و هێشتا بڕوام پێ ناهێنی؟ دەڵێ: بەوەی کردت لە دڵڕونی و یەقینێکی پتر بەوەی کەتۆ دەجالی چی دیکەم زێدە نەبوە. ئەوجا دەڵێ: هۆ خەڵکینە لەپاش ئەوەی لەگەڵمنی کرد، ناتوانی هیچی دی بە خەڵکی بکا. فەرموی: دەجال دەیگرێ هەتا سەری ببڕێ، نێوان ژێر چەناگە و چالایی ملی دەکرێتە مس و ناتوانی سەری ببڕێ، فەرموی: دەجال هەردو دەستی و هەردو پێی دەگرێ و فرێی دەدا،خەڵك وادەزانن هەڵیداوەتە نێو ئاگر. کەچی هەڵیداوەتە ناو بە هەشت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەم پیاوە مەزنترین شەهیدە لەلای پەروەردگاری جیهانیان))[1].

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب صفة الدجال، (٤/٢٢٥٦)، ورقم الحديث (٢٩٣٨).

## خوازگەی هەشتەم

## شوێنی دەرکەوتنی

دەجال لە ڕۆژهەڵات وەدەردەکەوێ، لە وڵاتێکی فارسی کە پێی دەڵێن: خوراسان هەروەك لە ئەبوبەکری صیدیق هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرمو: ((إن الدجال يخرج من أرض بالشرق، يقال لها: خراسان، يتبعه أقوام كأن وجوههم المجان المطرّقة: دەجال لە خاکێکی ڕۆژهەڵات دەردەکەوێ کە پێی دەڵێن: خوراسان، چەند هۆزێك وەدوای دەکەون ڕویان وەك قەڵغانی پێستەپۆشە)).[1]

بەڵام ئەو کاتە مەسەلەکەی بۆ موسڵمانان ئاشکرا دەبێ کە دەگاتە نێوان عێراق و شام، لە فەرمودەیەکی کە لە صەحیحی موسلیم داهاتوە کە بەمەرفوعی لە نواسی کوڕی سەمعانەوە هاتوە:

((إنه خارج خلة بين الشام والعراق، فعاث يمينا وعاث شمالا، يا عباد الله فاثبتوا: دەجال لەمیانەی نێوان شام وعێراق دەردەکەوێ و، بەرەو ڕاست و چەپ مل دەنێ تێکی دەدا، هۆ بەندەکانی خوا خۆتان ڕاگرن.))[2]

## خوازگەی نۆیەم

## ماوەی مانەوەی لە زەویدا

هاوەڵان لەبارەی مانەوەی دەجال لەسەر زەویدا لە پێغەمبەر ﷺیان پرسی و، گوتیان: چەند لە زەویدا دەمێنێتەوە؟ فەرمویـ:

((اربعون يوما، يوم كسنة، و يوم كشهر، و يوم كجمعة، و سائر ايامه كايامكم:

---

[1] الحديث يرويه الترمذي و ابن ماجة و الحاكم و الضياء في المختارة. سلسلة الأحاديث الصحيحة (١٢٢/٤) ورقم الحديث، وقال الشيخ ناصر: وقال الحاكم صحيح الإسناد، وافقه الذهبي، وهو كما قالا.

[2] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٢٢٥٢/٤)، ورقمه (٢٩٣٧).

چل رۆژان دەمینێتـەوە: رۆژێكـی هێنـدی سـاڵێكە، رۆژێكـی بەقـەدەر مانگێكـە و، رۆژێكی وەك هەفتەیەكە و، رۆژەكانی تریشی وەكو رۆژانـی ئاسایین)). گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ؛ لـەو رۆژەی هێنـدەی سـاڵێكە، نوێـژی رۆژێـك بـەشمان دەكـا؟ فەرموی: ((لا اقدروا له قدره: نەخێر، له قەدەر خۆی بۆ بخەملێنن)).[1]

وەرامی پێغەمبەر ﷺ بۆ پرسیارەكەی هاوەڵان، كە ئایا پێنج نوێژیان بەسە بۆ ئـەو رۆژانەی بەقەدەر ساڵێك یا مانگێك یا هەفتەیەكن. بەڵگەی ئەوەیە كە ئـەو رۆژانـە بە راستی درێـژ دەبنـەوە و هێنـدی ساڵێك یـا مـانگێك یـا هەفتەیـەكیان لێـدێ، نـەك بـە مەجازی.

## خوازگەی دەیەم

## شوێنكەوتوانی دەجال

مەسیحی دەجالی كوێری درۆزن ئەو پاشایەیە كە جولەكە چاوەڕوانی دەركەوتنین، تـا لەسـەردەمی ویـدا فـەرمانڕەوایی دنیا بكـەن، لـە موسـنـەدی ئەحمـەددا لـە عوسمـانی كـوڕی ئەبولعاص ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اكثر اتباع الدجـــال اليـــهود و النســـاء: زۆربەی شوێنكەوتەی دەجال جولەكە و ئافرەتن)).[2] لە فەرمودەیەكیش كە موسلیم لـە صەحیحەكـەیدا لــە ئەنەسـی كـوڕی مـالیك دەیگێڕتـەوە، پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: ((يتبـــع الدجـــال مـــن يـــــهود اصبـــــهان ســـــبعون الفـــــا، عليـــــهم الطيالســـــة: هەفتا هەزار لە جولەكەی ئەسفەهان شوێن دەجال دەكەون، كەتەیلەسانیان لەبەرە)).[3]

ئـەبو نوعـەیم باسـی یـەكێك لـە گوندەكـانی سـەر بـە ئەسـفەهان دەكـا كـە نێـوی

---

[1] اخرجه في صحيحه و ابو داود في سننه، عن النواس بن سمعان. جامع الأصول: (١٠/٣٥٤)/ رقـم الحديـث: (٧٨٣٩)، وهو في مسلم في كتاب الفتن: (٤/٢٢٥٢)، ورقمه (٢١٣٧).

[2] مسند احمد: (٤\٢١٦-٢١٧).

[3] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب في بقية من أحاديث الدجال: (٤/٢٢٦٦)، ورقم الحديث (٢٩٤٤). تەیلەسـان پۆشـاكێكە بەسـەرشـان دا دەدرێ و لەش داناپۆشێ، بۆكردنە بەر دەچنرێ و، بڕیار و دو رمانی تێدانیە.

(جولەکاوە—اليهودية) بو، چونکە تايبەت بو بە دانيشتوانی جولەکە و، تا سەردەمی ئەيوبی کوڕی زيادی ئەميری ميصر هەروا مابو، لەسەردەمی مەهدی کوڕی مەنصوری عەبباسی، ئەوجا موسڵمانان تێيدا نيشتەجێ بون و هەر بەشێکی بۆ جولەکان مايەوە.[1]

دەجاليش لەلای جولەکان نێوی مەسيحی کوڕی داودە و، دەڵێن گوايە لە ئاخير زەمان دەردەکەوێ و، دەسەڵاتی دەگاتە دەريا و وشکانی و، روبارەکان لەتەکی دەڕۆن و، دەڵێن گوايە يەکێکە لە نيشانەکانی خودا، موڵکيش بۆ وان دەگێڕتەوە.[2] بەڵام لە گريمانەکانيان درۆيان کردوە، چونکە دەجال مەسيحی گومڕايی و درۆزنە. مەسيحی رێنمونيش کە عيسای کوڕی مەريەمە، دەجالی مەسيحی گومڕايی دەکوژێ، هەروەك جولەکە شوێنکەوتەکانيشی دەکوژێ.

## خوازگەى يازدەم

## پاسکردنی مەدينە و مەککە لە دەجال

دەجال ڕودەکاتە مەدينەی پيرۆز و، ناتوانێ بچێتە ناوی، چونکە خودا مەککە و مەدينەی لە دەجال و لە تاعون پاسکردوە و، ئەرکی پارازتنەکەشی بەفريشتان ڕاسپاردوە.

لە صەحيحی بوخاريدا بەمەرفوعی لە ئەبو هورەيرە، هاتوە: ((على انقاب المدينة ملائكة لايدخلها الطاعون و لا الدجال: فريشتە بەسەر کوچە و کۆڵانەکانی مەدينەوەن، نە تاعون و نە دەجال ناچنە نێوی)).[3]

بوخاريش بەمەرفوعی لە ئەنەسەوە دەيگێڕتەوە:

((لايدخل المدينة رعب المسيح، لها يومئذ سبعة ابواب على كل باب ملكان:

---

[1] لوامع الانوار البهية: (٢ \ ١١٢).

[2] لوامع الانوار البهية: (٢\١٠٧).

[3] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الفتن، باب: لا يدخل الدجال المدينة، فتح الباري: (١٣/١٠١).

ترسـی مەسـیحی دەجـال ناچێتـە مەدینـە، ئـەو ڕۆژی حـەفت دەرگـەی هەیـە و هــەر دەرگەیەك دو فریشتەی لەسەرە)).[1]

لــە سـونەنی تــیرمیذی و موســنەدی ئەحمــەد، لــە ئــەبو هورەیــرەوە هــاتوە: ((يأتي المسيح من قبل المشرق، وهمته المدينة، حتى إذا جاء دبر أحد تلقته الملائكة، فضربت وجهــه قبل الشام، هنالك يــهلك، هنــالك يــهلك: مەسیح لـەلای ڕۆژهەڵاتـەوە دێ و، مەبەسـتی مەدینەیـە، کـە دەگاتـە پشــت کێـوی ئوحـود، فریشـتە روبـەڕوی دەبنـەوە و، لـە ڕوی هەڵدەدەن بەرەو لای شام، جا لەوێ بە هیلاك دەچێ و دەفەوتێ)).[2]

هەمدیس پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((ليس من بلد إلا سيطؤه الدجال، إلا مكة والمدينــــة، وليس نقب من أنقابها إلا عليه الملائكة حافين، تحرسها، فينـــزل بالسبخة، فترجف المدينة بأهلـــها ثلاث رجفات، يخرج إليه منها كل كافر ومنـافق: هـەر شـارێکی هەیـە دەجال پێـی لێدەنـێ، بێجگـە لەمەککە و مەدینـە، هـەر ڕێچکـەك لـە ڕێچکەکان فریشـتە دەوریـان داوە پاسـی دەکەن. جا لە ئاقارێکی زەویەکی لماوی مەدینە هەڵدەدا و بارگە دەخا، پاشـان شـاری مەدینـە سێ جاران بـە خەڵکەکەی دەلـەرزێ و، هـەرچی کـافر و مونـافیقی تێدایـە بـۆ دەجالی وەدەردەنێ)).[3]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموی: ((وإنه لا يبقى شيء من الأرض إلا وطئــــه وظـــهر عليه، إلا مكة والمدينة، لا يأتيهما من نقب من أنقابهما إلا لقيته الملائكة بالســـيوف، صلتـــه، حتى ينـــزل عند الضريب الأحمر، عند منقطع السبخة، فترجف المدينة بأهلها ثلاث رجفـــات، فلا يبقى فيها منافق ولا منافقة إلا خرج إليه، فتنفي الخبيث منها، كما ينفـــي الكـــير خبـــث الحديد، ويدعى ذلك اليوم الخلاص، قيل فأين العرب يومئذ؟ قـــال: هـــم يومئـــذ قليـــل...: ئـەوجا هیچ شـوێنێك لـە زەویـدا نـامێنێ دەجـال پێـی لێ نـەنێ و بەسـەریدا زاڵ نـەبێ، جگە لەمەککە و مەدینە. لەهەر کوچە وکولانێکیانەوە بۆیان بێ، فریشتەگەلێك دەست

---

[1] رواه البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: فتح الباري: (١٣/٩٠).

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٧٢/٤)، ورقمه (١٧٧١)، وقال المحقق: وإسناده على شرط مسلم، وقـد أخرجه مسلم مفرقاً في موضعين.

[3] في صحيحي البخاري و مسلم عن انيس؛ صحيح الجامع: (٩٩/٥)، ورقمه (٥٣٠٦).

بە شمشێری ڕوەوە ڕوبەڕوی دەبنەوە و لەلای سورەڕێ کە زەویە لماویەکە دەبڕێتەوە، لەوێ هەڵدەدا و دادەبەزێ. جا مەدینە سێ جاران بە خەڵکی خۆی دەلەرزێ و هەرچی مونافیقێکی پیاو یا ژنی تێدابێ بۆ لای دەجال دەردەچێ و، چۆن کورە و موشەدەمە ئاسنی پاك دەکەنەوە، مەدینەش وا پاك دەبێتەوە و، ئەو ڕۆژەش بە ڕۆژی ڕزگاری ناوزەد دەکرێ، گوتیان: ئەدی ئەو ڕۆژی عەرەب لەکوێن؟ فەرموی: ئەو ڕۆژی ئەوان کەمن...))[1]

## خوازگەی دوازدەم

## ڕێگای ڕزگاربون لە دەجال

پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە بەر لەدەرکەوتنی دەجال موسڵمانان هێزێکی گەورەیان هەیە و، شەڕی گەورە گەورە دەکەن و، تێیاندا سەردەکەون، جا دەجال دێ تا ئەو هێزە ئیسلامیە لەناوببا کە بەهێزترین دەوڵەتی ئەو سەردەمی دوچاری شکست و دۆڕان کردوە کە ڕۆمەکانن، لەوکاتی موسڵمانان قوستەنتینیەیان وەدەست هێناوەتەوەو ڕزگاریان کردوە، کە شەیتان لەناویاندا دەقیژێنێ گوایە دەجال بۆتە جێنیشین بەسەرماڵ و منداڵیانەوە و چۆتە نێویان، ئەوجا موسڵمانان غەنیمەت جێ دێڵن و، بەرەو هەوارگەی خۆیان دەکەونە ڕێ، پاشان دەجال دەردەکەوێ، جا موسڵمانان چەك دانانێن، بۆیە کە عیسا دادەبەزێ دەبینێ وا موسڵمانان ((يعدون العدة للقتال، ويسوون الصفوف: خۆیان بۆ جەنگ ساز و ئامادە دەکەن و، ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن)).[2] گومانیش لەوەدا نیە کە لەو سەردەمیدا ئەرکی هەمو موسڵمانێکە وەگەڵ هێزی موسڵمانان کەوێ و بچێتە پاڵیان، کە بەیداخی جیهاد لەڕێی خودایان بەرزکردۆتەوە، هەروەك پێویستە موسڵمان لەسەر هەق جێگیر و

---

[1] في سنن ابن ماجة، وصحيح ابن خزيمة، ومستدرك الحاكم عن ابي امامة. صحيح الجامع الصغير: (٦/٢٧٥) ورقمه (٧٧٥٢).

[2] رواه مسلم، (٤/٢٢٢١)، ورقم الحديث (٢٨٩٧).

چەسپیو بێ هەرچەندە کارەسات و تاقیکردنەوەکان توندتر بن، ئەمەش ئامۆژگاری و وەسیەتی پێغەمبەرمانە ﷺ بۆ ئێمە، کاتێك لەبارەی دەرکەوتنی دەجال بۆمان باس دەکات و، دەفەرموێ: ((انه خارج خَلّة بين الشام و العراق، فعاث يمينا وعاث شمالا، يا عباد الله اثبتوا: دەجال لەنێوان شام و عێراق دەردەکەوێ، جا بە لای راست و لای چەپدا دەگەڕێ، هۆ بەندانی خوا سەقامگیربن)).[1]

دروستیش نیە موسڵمان بێتە لای دەجال، هەرچەند متمانەشی بەخۆی هەبێ. چونکە وێچون(شبهات)ی وای لەلا هەن ئیمان دەلەرزێنن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((من سمع بالدجال فلينأ عنه، فوالله إن الرجل ليأتيه وهو يحسب أنه مؤمن، فيتبعه، مما يبعث به من الشبهات، أو لما يبعث به من الشبهات: ئەوەی گوێی لە هەواڵی دەرکەوتنی دەجال بو، با لێی وەدورکەوێ. سوێند بە خوا پیاو هەیە دێتە لای وخۆی بە بڕوادار تێدەگا، کەچی شوێنی دەکەوێ، لەبەر ئەو وێچونانەی کە لەلای هەن)).[2]

هیچیشی تێدا نیە ئەگەر ئەو کەسانەی توانای بەرگری کردنی دەجالیان نیە، لە رێگەی هەڵێن و، خەڵکی ئەو سەردەمیش زۆربەیان وادەکەن، لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئوم شورەیکەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم بیست دەیفەرمو: ((ليفرّن الناس من الدجال في الجبال: خەڵکی لە دەست دەجال بۆ کێوان هەڵدێن)).[3]

ئەگەر بڕوادار ناچاریش بو ڕوبەڕوی بێتەوە، دەبێ بە ئەرکەکەی هەستێ و هەق ڕونکاتەوە و، بیانوبڕیەکی چاکی بکا، هەروەك لە فەرمودەدا هاتوە: ((إن يخرج وأنا فيكم، فأنا حجيجه دونكم، وإن يخرج ولست فيكم، فامرؤ حجيج نفسه، والله خليفتي على كل مسلم: ئەگەر من لەناوتاندا بم کە دەجال دەردەکەوێ، لەباتی ئێوە بیانوبڕی دەکەم، ئەگەر دەریش کەوت و من لەنێوتاندا نەبوم، هەریەکە و بۆ خۆی بەرپرسە و، خوداش ئاگەدار و چاودێری هەمو موسڵمانێکە)).

---

[1] رواه مسلم، (٤/٢٢٥٢)، ورقم الحديث (٢٩٣٧).

[2] في سنن ابي داود باسناد صحيح عن عمران بن حصين؛ جامع الأصول: (١٠/٣٥٤)، ورقم الحديث (٧٨٤٦).

[3] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في بقية من أحاديث الدجال: (٤/٢٢٦٦)، ورقم الحديث (٢٩٤٤).

پێغەمبەریش ﷺ هێندە زانستەی بۆمان جێهێشتوە کە چاو و دڵمان لەئاست دەجال ڕون کاتەوە و بیناسینەوە، کە بریتیە لە تەنێکی دیتراو، دەخواو دەخواتەوە، خوداش لە دنیایێ نابینرێ و، خودا پاکە لە خواردن و خواردنەوە، هەروەها دەجال چاوی عەیبدارن، هەروەکو لە فەرمودەدا هاتوە ((انه شاب قطط، عينه طافئة، كأني مشبهه بعبد العزي بن قطن: دەجال گەنجێکی موگرژو لولە، چاوی پوکاوەتەوە، بە عەبدولعوززای کوڕی قطن دەچێ)).[1] هەرچی ئاواش بێ، گومان لە بەتاڵی بانگەشەکردنی بۆ خواوەندێتی و پەروەردگارێتی نامێنێ و، دیارە هەڵبەستە و درۆیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە، هەر کەسێکی بە دەجال ڕابگا با سەرەتاکانی سورەتی کەهفی بەسەردا بخوێنێ ((فمن ادركه منكم فليقرأ فواتح سورة الكهف: هەریەك لەئێوە پێی گەیشت، باسەرەتاکانی سورەتی کەهفی لەسەر بخوێنێ)).[2]

لە فەرمودەی ئەبو ئومامەش داهاتوە: ((وإن من فتنته أن معه جنة ونارا، فناره جنة، وجنته نار، فمن ابتلي بناره فليستغث بالله، وليقرأ فواتح الكهف...: لە ئاشوبەکانی ئەوەیە کە بەهەشتێك و دۆزەخێکی لەگەڵە، دۆزەخەکەی بەهەشتە و، بەهەشتەکەی دۆزەخ، ئەوی بە ئاگرەکەی تاقیکراوەبا هانا وەبەر خوای بباو، سەرەتاکانی سورەتی کەهف بخوێنێ)).[3]

لە فەرمودەگەلێکی صەحیحیشدا هاتوە ((من حفظ عشر أيات من سورة الكهف عصم من فتنة الدجال: هەر کەسێکی دە ئایەتی لە سورەتی کەهف لەبەر بێ لە فیتنەی دەجال پارێزراو دەبێ)).[4]

جا لە هەندێك فەرمودان هاتوە کە لە سەرەتای سورەتی کەهفە و، لە هەندێکیش کۆتاییەکانی.

---

[1] رواه مسلم في صحيحه في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٥٢)، ورقمه (٢٩٣٧).
[2] هەمان سەرچاوە.
[3] رواه ابن ماجة والترمذي والحاكم إسناد صحيح، صحيح الجامع: (٦/٢٧٤)، ورقمه (٧٧٥٢).
[4] النهاية لإبن كثير: (١/١٥٤) وبعض هذه في السنن، وبعضها في الصحاح.

ڕەنگە بگوترێ: بۆ سەرەتاکان و کۆتاییەکانی سورەتی کەهف مایەی دەربازبونن لە دەست دەجال؟

هێندێك دەڵێن: چونکە خودای گەورە لە پێشەوەی ئەم سورەتە ڕایگەیاندوە، کە خودا ئەو کومەڵە گەنجەی لە دەست ئەو ستەمکارە لە سنور بەدەرە دەربازکرد، کە هەوڵی داو لەنێویان ببا، بۆیە دەگونجێ هەر کەسێکی ئەو ئایەتانە بخوێنێ و، لە حاڵەتێکی وەکو هی ئەوان دابێ، خودای بەرز وەکو ئەوان ڕزگاری کا.

هەروەها گوتراوە: چونکە نیشانە و سەراسا و سەرسوڕهێنەر لە سەرەتاکانی سورەتی کەهفدا هەن، هەر کەسێکی بیانخوێنێ، دڵی جێگیر دەبێ و بە دەجال تاقیناکرێتەوە و سەریشی ناسوڕمێ بەوان شتانی دەجال هێناونی و پێیان ناخافڵێ و، کاری تێناکەن.

هەروەها ئەگەر موسڵمان پەنای بردە بەر یەك لە هەردو حەرەمان؛ مەککە بێ یا مەدینە، لە دەجال پارێزراو دەبێ، چونکە لە دەجال حەرامە بچێتە ئەو دو شوێنە.

پێغەمبەریش ﷺ باسی ئەوەی بۆ فەرموین، چۆن پیاوە صاڵحەکە ڕوبەڕوی دەجال دەبێتەوە و، هەقی بەڕوی دادەدا و، چۆن نەرمی لە بەرامبەر نانوێنێ. هەروەك لەو فەرمودانەدا هاتوە کە ڕاستەقانی ئەو بەهەشت و دۆزەخە دەردەخەن کە لەگەڵی دان.

هەروەها ئەوی بەندە ڕزگار دەکا لە دەجال، پەنابردنە بەر و خۆدانە پاڵ خودایە لەدەجال و ئاشوبەکانی. دەقەکانیش لە پێغەمبەر ﷺ هاتون، فەرمان دەدەنە موسڵمان، بە خودا خۆی پەنابگرێ لە فیتنە و ئاشوبی دەجال، هەروەك لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) هاتوە، دەڵێ: (لە پێغەمبەری خودا ﷺم گوێ لێبو لە نوێژەکانیدا، خۆی لە ئاشوبی دەجال پەنا دەدا)[1]

پێغەمبەر ﷺ هەمو دەمێ لەپاش تەحیات خوێندن، خۆی لە ئاشوبی دەجال پەنا دەدا و، دەیفەرمو: ((اللهم إنا نعوذ بك من عذاب جهنم، ومن عذاب القبر، ومن فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدجال: خودایە، ئێمە خۆمان بە تۆ پەنا دەگرین لە

[1] صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: فتح الباري: (١٣/ ٩٠).

ئەشکەنجەی دۆزەخ و، لە ئەشکەنجەی گۆڕ و، لە ئاشوبی ژین و مردن و، لە ئاشوبی مەسیحی دەجال)).[1]

## خوازگەی سێزدەم

## لەنێوچونی دەجال و دوابڕانی ئاشوبەکەی لەگەڵ تیاچونی جولەکە شوێنکەوتوەکانی

پێشتر تەواوی ئەو فەرمودەمان هێنایەوە کە کە موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە دەیگێڕتەوە. لەکۆتاییەکەیدا وای تێدا هاتوە کە لەنێوچونی دەجال لەسەردەستی عیسای کوڕی مەریەم(عليه السلام) دەبێ:

((فبينما هم يعدُّون للقتال، يسوّون الصفوف، إذ أقيمت الصلاة، فينـزل عيسى بن مريم(عليه السلام) فأمهم، فإذا رآه عدو الله ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله الله بيده، فيريهم دمه: جا کاتێك سوپا و لەشکری موسڵمانان خۆ بۆ جەنگ ساز دەدەن و، ریزەکانیان ڕێك دەخەن، کە قامەتی نوێژ دەکرێ، عیسای کوڕی مەریەم(عليه السلام) دادەبەزێتە نێویان و پێشنوێژیان بۆ دەکا، کە دوژمنی خوا دەیبینێ وەکو خوێی ناو ئاو دەتاوێتەوە، ئەگەر وازی لێبێنێ هەر دەتاوێتەوە تا لەنێو دەچێ، بەڵام خودا بە دەستی عیسا دەیکوژێ و خوێنەکەی بە موسڵمانان پێشان دەدا)).[2]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((وإمامهم رجل صالح، فبينا إمامهم قد تقدم يصلي بهم الصبح، إذ نزل عليهم عيسى بن مريم الصبح، فرجع ذلك الإمام ينكص، يمشي القهقري ليتقدم عيسى، فيضع عيسى يده بين كتفيه، ثم يقول له: تقدم فصلِّ، فإنها لك أقيمت، فيصلي بهم إمامهم، فإذا إنصرف، قال عيسى: إفتحوا الباب، فيفتحون ووراءه الدجال، معه سبعون ألف يهودي، كلهم ذو سيف محلى وساج[3]، فإذا نظر إليه الدجال ذاب كما يذوب الملح في الماء،

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب التعوذ بالله من عذاب القبر: ورواه مسلم في صحيحه، في باب ما يستعاذ منه في الصلاة.

[2] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٢٢٢١/٤) ورقم الحديث (٢٨٩٧).

[3] ساج: جۆرە تەیلەسانێکی فراوان و بازنەییە جولەکە دەیکەنە سەریان.

فينطلق هارباً.. فيدركه عند باب لد الشرقي، فيقتله، فيهزم الله اليهود، فلا يبقى شيء مما خلق الله ﷻ يتواقى به اليهودي، إلا أنطق الله ذلك الشيء، لا حجر، ولا شجر، ولا حائط، ولا دابة- إلا الغرقدة، فإنها من شجرهم لا تنطق- إلا قال: يا عبدالله المسلم، هذا يهودي، فتعال فاقتله:
**پێشەوای ئەو موسڵمانانەی خۆ بۆ شەڕی دەجال سازدەدەن، پیاوێکی صاڵحە، جا کە پێشەواکەیان بۆ نوێژی سبەینێ وەپێشیان دەکەوێ، لەو سبەینەیەدا عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێتە نێویان، ئەو پێشەوایە لە پێشنوێژیەکەی پشتاوپشت دەگەڕێتەوە، تا عیسا پێشکەوێ، بەڵام عیسا دەستی لەنێوان شانەکانی دادەنێ و، پاشان پێی دەڵێ: پێشکەوە و نوێژەکەت بکە، قامەتەکە بۆ تۆ کراوە. جا پێشەواکەیان نوێژیان پێ دەکا، جا کە بەڕێ کەوت[1]، عیسا فەرموی: دەرگاکە بکەنەوە، دەیکەنەوە و دەجالی لە پشتە، هەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵە، هەمویان خاوەن شمشێری رازاوەن و تەیلەسانیان لەبەرە، جا کە دەجال دەڕوانێتە عیسای کوڕی مەریەم ﵇ وەکو خوێی ناو ئاوی دەتاوێتەوە، بۆیە پێ بە غارێ وەدەنێ و هەڵدێ؛ بەڵام عیسا ﵇ لەلای دەرگەی رۆژهەڵاتی شاری لید کە شارێکە لە فەلەستین، دەیگاتێ و، دەیکوژێ، جا خودا جولەکان بەدۆڕان دەدا و، هیچ شتێك نامێنی لە بەدیهێنراوانی خوا جولەکە خۆیانی لە پەنا بشارنەوە، بچنە پەنای هەر شتێك خوا بە زمانی دێنی، جا بەرد یا دار، یا دیوار، یا گیانەوەر بێ. جگە لە غەرقەدە، ئەمەش درەختی جولەکانە و دەنگێ ناکا. دەنا ئەوانی دیکە هەمو دەڵێن: هۆ موسڵمانی بەندەی خودا، ئەمە جولەکەیە، وەرە بیکوژە)).[2]**

**لە ئەبو هورەیرە ﵁، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:** ((لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود، فيقتلهم المسلمون، حتى يختبيء اليهودي من وراء الحجر والشجر، فيقول الحجر أو الشجر: يا مسلم، يا عبدالله، هذا يهودي خلفي، فتعال فاقتله، إلا الغرقد، فإنه من شجر اليهود:
**قیامەت دانایێ هەتا موسڵمان شەڕی جولەکان دەکەن و دەیانکوژن، تا وای لێدێ**

---

[1] شێخ ناصر لە (صحيح الجامع: (٢٧٥\٦) دا دەڵێ: کورتکردنەوەي تێدایە و مەبەست ئەوەیە، بۆ بەیتولمەقدیس بە ڕێ دەکەوێ، کە موسڵمانانی تێدا گەمارۆ دراون.

[2] في سنن ابن ماجة، و صحيح بان خزيمة، ومستدرك الحاكم عن ابي امامة باسناد صحيح. صحيح الجامع الصغير: (٢٧٦\٦) ورقمه: (٧٧٥٢).

جولەکە لە پەنا بەرد و داران خۆ حەشار دەدەن، بەردەکەش یان دارەکەش دەڵێ: هۆ موسڵمان، هۆ بەندەی خوا، ئەوە جولەکەیە لە پشتم، جاوەرە بیکوژە، لە غەرقەد[1] بترازێ چونکە لە دەرختی جولەکانە)).[2]

## خوازگەی چاردەم

## بیروباوەڕی ئەهلی سونەت لەبارەی دەجال

نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا دەڵێ: (قازی گوتی: ئەم فەرمودانەی کە موسلیم و هی دیکەش، لەبابەت دەجال دەیگێڕنەوە، بیانوە بۆ ڕاڕەوەی ئەهلی هەق لەبارەی ڕاستی هەبونی دەجال، کە بریتیە لە کەسێك خودا بەندەکانی خۆی پێ تاقیدەکاتەوە، جا هێندێك توانای وای داوەتێ لە تواناکانی خوادان وەکو زیندوکردنەوەی ئەو مردوەی بەخۆی دەیکوژێ و نەشونماکردنی دونیا و فەڕو پیت لەگەڵیدا، بەهەشت و دۆزەخەکەی و، هەردو روبارەکەی و شوێنکەوتنی گەنجینەکانی زەوی بۆوی و، فەرماندانی بە ئاسمان تا باران ببارێنی و بارانیش ببارێ و، فەرماندانی بە زەوی تا لێی بڕوێ و بەرفەرمان بونی زەوی، ئەمانە هەموی بە تواناو ویستی خودای بەرز ڕودەدەن و دێنە ئارا، پاشان خودا کەنەفتی دەکا، نەدەتوانێ ئەو پیاوە بکوژێ کە پێشتر کوشتبوی و زیندوی کردبۆوە، نەکەسێکی دیکە، کارەکەی مایەپوچ دەبێ و، عیسا ﷺ دەیکوژێ و، خوای مەزنیش بڕواداران جێگیر و سەلامەت دەکا. ئەمە ڕێڕەوی ئەهلی سونەتە، لەگەڵ سەرجەم فەرمودەناسان و فەقیهان و وردبینان، بە پێچەوانەی ئەوانی ئینکاری دەکەن و بەڕاستی دانانێن لە

[1] غەرقەد: جۆرە دارێکی درکاوی ناسراوە لە وڵاتی بەیتولمەقدیس و، هەر ئەوی جولەکە دەکوژرێن؛ النووي في شرحه على مسلم (١٨/٤٥).

[2] حديث قتال المسلمين اليهود رواه البخاري، كتاب الجهاد، باب قتال اليهود فتح الباري: (٦/١٠٣) ومسلم في صحيحه، كتاب الفتن وأشراط الساعة، حديث رقم (٤٩٢٢) (٤/٢٢٣٩)، وقد رواه عن أبي هريرة وإبن عمر من أكثر من طريق، واللفظ الذي أثبتناه لفظ مسلم.

خـەواريج و جوهميـە و هـەندێك موعتـەزيلان. هـەروەها بـە پێچەوانـەی بوخـاری موعتەزيلی و هاوڕايانی لە جوهميەكان و غەيری وان، كە دەڵێن بونی دەجال ڕاستە، بەڵام بانگەشەكانی خەڵەفان و خەياڵاتە و، حەقيقەتيان نيە. دەڵێن گوايە ئەگەر ڕاست بايـە بـە موعجـيزەی پێغەمبـەران پاڵپشـت نـەدەكرا. ئەمـەش هەڵەيەكـە هـەمو تێـی كەوتون، چونكە ئەو بانگەشەی بۆ پێغەمبەرايەتی نەكردوە، تا كردەوە سەراساكانی و ئەو شتانە دەگەڵيدان وەك بەڕاست دانانی وابن. بەڵكو ئەو بانگەشـەی خواوەندێتی دەكـا، كـەچی هـەر لـە هـەمان بانگەشـەكەی خۆيـدا، حـاڵ و بـاری مايـەی وەدرۆ خستنەوەيەتی، لەگـەڵ بونـی بەڵگـەی وەديـهاتويی تێيـدا و، كـەموكوڕی لـە وێنـەو شێوەی و، ناتـەوانی لـە ئاست لابردنـی كوێريەكـەی چاوی، سڕينەوەی ئـەو گـەواهی كوفرەی لـە نێوچاوانيدا نوسـراوە. جا لەبەر ئەو بەڵگانـە و هیدیكـەش، كەسـی پـێ فريـو نـادرێ لـە شـوانەوێرەی خـەڵكی(رعـاع النـاس) بترازێ، ئـەويش بـۆ پڕكردنـەوەی پێويستيەك يا بە ئارەزوی تێربون يا لە ترسان و بۆ خۆپاراستن، چونكە ئاشوبەكەی هێند مەزنە عەقڵەكان دەتاسێنێ و سـەران دەسوڕمێنێ، لەگەڵ خێرايی تێپـەڕينی بە زەويدا، كە هێندە لە شوێنێكدا نامێنێتەوە تا لاوازەكان لە حاڵی ڕامێنن و، بەڵگـەكانی وەديهاتويی و كەموكوڕيەكانی تاوتوێ كەن و هەڵيان سەنگێنن. جا لـەو بارەدا ئـەوی بەراستی بزانێ باوەڕی پێ دێنێ).[1]

## خوازگەی پازدەم

## ئيبنی صەياد و دەجال

ئيبنـی صـەياد پياوێكـە لـە جولەكـەكانی مەدينـە، نـاوی (صـاف)ە، لـە زۆربـەی سيفەتەكانی بە دەجال دەچو، پێغەمبەر ﷺ گومانی لێدەكرد، زێتر لە جارێك هەوڵی دا دەری بخا و ڕاستەقانی بزانێ، ئەمەش بەڵگەيە كە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی وی هيچی بۆ نيگا نەكراوە، جارێك عومـەری خـەطاب لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ و كۆمەڵـە پيـاوێكدا

[1] شرح النووي على مسلم: (١٨ \ ٥٨)

بەرەو لای ئیبنی صەیاد چون، دیتیان لەگەڵ کوڕیژگان لەلای قەڵاتی بەنی موغالە گەمان دەکا، لەو ڕۆژەدا ئیبنی صەیاد دەوروبەری بالّق بونی بو، هەستی نەکرد تا پێغەمبەر ﷺ شەپێکی لە پشتی دا، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ بە ئیبنی صەیادی فەرمو: ((اتشهد اني رسول الله؟: ئایا شایەدی دەدەی من پێغەمبەری خوام؟))، ئیبنی صەیاد سەیری پێغەمبەری کرد و گوتی: شایەدی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارانی. ئەوجا ئیبنی صەیاد بە پێغەمبەرﷺی گوت: ئەدی تۆ شایەدی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەر ﷺ ڕەتی کردوە و، فەرموی: ((امنت بالله و رسله: بڕوام بەخوا و بە پێغەمبەرەکانی هێناوە))[1].

پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: ((ماذا ترى؟: چ دەبینی؟)) ئیبنی صەیاد گوتی: ڕاستگۆیەك و درۆزنەك دێنە لام، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((خلط عليك الامر: بەڕاستی لێت تێکەڵ بوە)).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اني قد خبأت لك خبئا: شێتکم بۆ لە دڵدا گرتوی)). ئیبنی صەیاد گوتی: ئەوە دوکەڵ(الدخ)ە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اخسأ فلن تعدو قدرك: ڕوزەرد بە تۆ هەرگیز لە قەدەری خۆت ڕەت نابی)). جا عومەری کوڕی خەطاب گوتی: لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا با لەگەردەنی دەم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ان یکنه فلن تسلط علیه، وان لایکنه فلا خیر لك في قتله: ئەگەر دەجال بێ، ئەوا دەسەڵاتت بەسەریدا ناشکێ، ئەگەر هەویش نەبێ لەکوشتنی چ قازانج ناکەی)).

جارێکی دیکەش پێغەمبەر ﷺ چوەلای، هەروەك موسلیم لە صەحیحەکەیدا لەپاش ئەم فەرمودەیە دەیهێنێتەوە، لە سالمی کوڕی عەبدوڵلا، دەڵێ: گوێم لێبو عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەیگوت: پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ و ئوبەی کوڕی کەعبی ئەنصاری چونە نێو ئەو دارخورمایانەی ئیبنی صائیدی تێدابو، کە پێغەمبەرﷺ چوە نێو کۆزە دارخورماکە. بە لك و پۆپی دارخورماکە خۆی حەشاردەدا و، دەیوست ئیبنی صەیاد بخافڵێنێ و شتێکی لێ ببیستێ، حەقیقەتەکەی پێ بزانی، بەر لەوەی ئیبنی صەیاد

---

[1] رواه مسلم في صحيحه عن عبدالله بن عمر رضي الله عنه.
ڕەنگە هەبێ بڵێ، چۆن داوای پێغەمبەرایەتی کردوە و، و پێغەمبەر ﷺ وازی لێ هێناوە. وەرام ئەوەیە کە لەو ڕۆژانەدا پەیمانامە لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و جولەکەکاندا هەبوو.

ببینێ. جا پێغەمبەر ﷺ دیتی وا لەسەر ڕایەخێکی مەخمەڵ ڕاکشاوە و منگەمنگێکی لێوەدێ، جا ئوم صائید پێغەمبەرﷺی دیت، لە پەنای لك و پۆپان خۆی حەشارداوە، بە ئیبنی صائیدی گوت: هۆ (صاف) (کە نێوی ئیبنی صەیاد بو) ئەوە موحەممەدە، جا ئیبنی صەیاد لە جێیەکەی خۆی ڕاپەڕی. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لو ترکته لبین: ئەگەر ژنەکەی وازی لێ هێنابا حەقیقەتی دەردەکەوت)).[1]

نەوەوی لە ڕاڤەکەی بۆ موسلیمدا، لەبارەی ئیبنی صەیاد دەڵێ: (زانایان دەڵێن: چیرۆکەکەی گرێکوێرەی تێدایە، گرفتەکەش لەوەیدایە، ئایا ئیبنی صەیاد هەمان مەسیحی دەجالی بەناوبانگە یا یەکێکی دیکەیە، گومانیش لەوەیدا نیە کە یەکێکە لە دەجالەکان. زانایان دەڵێن: ڕواڵەتی فەرمودەکان وا دەگەیەنێ کە ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ نیگا نەکراوە، ئایا ئیبنی صەیاد دەجالە، یا یەکێکی دیکەیە، بەڵکو سیفەتەکانی دەجالی بە سروش بۆ هاتوە. ئیبنی صەیادیش هێندێك بەڵگەی ئەگەر هەڵگری تێدابو، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ یەکجاری ڕاینەدەگەیاند دەجالە یا یەکێکی دی. هەر لەبەر ئەوەش بە عومەری فەرمو: ((ان یکن هو فلن تستطیع قتله: ئەگەر هەوبێ ئەوا ناتوانی بیکوژی)).[2] عومەریش ﷺ بەیەکلایی دەیگوت: ئیبنی صەیاد دەجالە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ هەر هەمان ڕای هەبو، جا ئیبنی عومەر دەیگوت: سوێند بە خوا گومانم لەوەی دانیە کە ئیبنی صائید مەسیحی دەجالە.[3]

هەروەها نەوەوی قسەیەك لە بەیهەقی ڕادەگوێزێ کە دەڵێ: (لە فەرمودەکەی جابیردا چی دی نیە بێجگە لە بێدەنگ بونی پێغەمبەر ﷺ لە ئاست قسەکەی عومەر، ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ لەمەسەلەی ئیبنی صەیاد وەك ڕاوەستاو وابێ، پاشان ڕون کردنەوەی بۆ هاتبێ کە یەکێکی دیکەیە، هەروەکو بەڕاشکاوی لە فەرمودەکەی تەمیمدا دیارە).[4]

ئیبنی صائید ماوەیەکیش پاش پێغەمبەر ﷺ مایەوە، بانگەشەی موسڵمان

---

[1] رواه مسلم في صحيحه: (٤/٢٢٤٤) ورقمه (٢٩٣١).
[2] شرح النووي على مسلم: (١٨/٤٦).
[3] رواه ابو داود باسناد صحيح عن ابن عمر؛ سەرچاوەی پێشو.
[4] شرح النووي على مسلم: (١٨/٤٨).

بونیشی کرد، بەڵام خەڵك متمانەیان بە ئیسلامەکەی نەبو، هەر لێی بەگومان بون، موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێڕتەوە کە ئیبنی عومەر دو جاران ئیبنی صائیدی دیوە، جا بە یەکێکی گوت کە لەگەڵی دابو: ئایا دەڵێن ئەوە هەوە؟ گوتی: نا بەخوای، دەڵێ: گوتم: درۆت لەگەڵ کردم، سوێند بە خوا هەندێك لە ئێوە، هەواڵی ئەوەتان پێدام کە ئیبنی صەیاد نامرێ هەتا ماڵ و منداڵی لە هەموتان پتر دەبێ، دەشڵێن گوایە ئەمڕۆ وایە. ئیبنی عومەر دەڵێ: جا پێکەوە ئاخافتین، پاشان جیابومەوە. پاشان جارێکی دیکەش ئیبنی عومەر دیتی، چاوی وەرەمی هەڵێنابو و دەرپەڕیبو. دەڵێ: گوتم: کەینێ چاوت ئاوای لێهاتوە؟ گوتی: نازانم. دەڵێ: گوتم: چاو چاوی سەری خۆتەو نازانی کەی وای لێهاتوە؟ گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ چاوێك لەو دارەی دەست تۆ دەخوڵقێنی. دەڵێ: جا مشەیەکی وای لە لوتی هات هێندەی توندترین مشەی کەر بو کە من بیستبم. دەڵێ: هاوەڵەکانم گوتیان گوایە تا داردەستەکەم شکاوە پێی لێیم داوە، کەچی بە خۆم، سوێند بە خوا دەخۆم هەر هەستم پێ نەکردوە.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەی موسلیمدا هاتوە، ئیبنی عومەر قسەیەکی وا بە ئیبنی صەیاد دەڵێ توڕەی دەکا. ئەویش هێند دەئاوسێ و با دەخوا تا ڕێگەکە پڕ دەکاتەوە. جا ئیبنی عومەر دەچێتە لای حەفصە، ئەمیش ئەو ڕوداوەی پێ گەیشتبۆوە، جا پێی دەڵێ: بەرمیهری خوا کەوی، چت لە ئیبنی صائید دەویست؟ ئەدی نەتزانیوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إنما يخرج من غضبة يغضبها: دەجال لە ئەنجامی توڕە بونێکیەوە دەردەکەوێ)).[1]

هەروەها موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕتەوە، کە دەڵێ: بۆ حەج و عەمرە کردن دەرچوین و ئیبنی صائیدیشیمان لەگەڵ بو، جا لە شوێنێك بارگەمان خست، خەڵکەکە پەرت بون و، هەرئەمن و ئەو ماینەوە. جا زۆر لێی ترسام بەهۆی ئەو قسانەی لەبارەی دەگوترا. دەڵێ: جا شتومەکی خۆی هێنا و لەگەڵ شتومەکی منی دانا، منیش گوتم: دنیا زۆر گەرمە، ئەگەر بیان بەی لە سێبەری ئەو دارەیان دانێی.

---

[1] صحيح مسلم: (٤/٢٢٤٧) ورقمه: (٢٩٣٢)

دەڵێ: ئەویش بردنی. دەڵێ: بزنەکانمان هاتن بۆ لامان و ئەویش چو بادیەکی گەورە شیری هێنا و گوتی: فەرمو ئەبو سەعید بیخۆوە. گوتم: زۆر گەرمایە و، شیریش گەرمە. مەبەستیشم هەر ئەوەبو حەزم نەدەکرد لە دەستی وی وەریگرم و بیخۆمەوە. جا گوتی: ئەبو سەعید، هێندەی نەماوە لەبەر ئەو قسانەی خەڵك پێمی دەڵێن گوریسێك ببەم و لەو دارە خۆمی پێ هەڵواسم، ئەی ئەبو سەعید، ئەو فەرمودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کێ بزرن کە لە ئێوەی گەلی ئەنصارییان گوم بون، ئەدی ئەتۆ لە هەموخەڵکی شارەزاتر نی لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ؟ ئەدی نەیفەرموە ((هـو کـافر: دەجال کافرە))، وا منیش موسڵمانم؟ ئەدی نەیفەرموە ((عقیـم لا یولـد لـه: نەزۆکە و منداڵی نابێ))، وا منیش منداڵەکانم لە مەدینە جێهێشتوە. ئەدی نەیفەرموە ((لایدخل المدینة و لا مكة: نەدەچێتە مەدینە و نە مەککە))، وامنیش لە مەدینە ڕا هاتوم و دەچمە مەککە؟[1]

بەڵام ئەو بەڵگانەی ئیبنی صەیاد هێنایەوە، وە لەرزەکەوتن و کاریگەرییان لە دەرونی ئەبو سەعید نەما، پاش ئەوەی ئیبنی صەیاد بەردەوام بو و گوتی: (بەڵام سوێند بە خوا من دەزانم ئێستا لە کوێیە و باوك و دایکیشی دەناسم). دەڵێ: پێشیان گوت: پێت خۆشە ئەتو ئەو پیاوە بی؟ گوتی: ئەگەر بمدرێتی پێم ناخۆش نابێ.[2]

## خوازگەی شازدەم

## دەجال لەسەربردەکەی تەمیمی داری

فاطیمەی کچی قەیس، خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیس، دەڵێ: گوێم لە بانگوێژی پێغەمبەر ﷺ بو، بۆ نوێژی جەماعەت بانگی ڕادەهێشت، منیش بۆ مزگەوت وەدەرکەوتم و، نوێژم لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا کرد و، لە ڕیزی ژناندا بوم کە لە پشت خەڵکەکەوە ریز ببون. کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بۆوە، لەسەر مینبەر دانیشت

---

[1] رواه مسلم في صحيحه: (٤\٢٢٤٢)، ورقمه: (٢٤٢٧).

[2] هەمان سەرچاوە.

**پێدەکەنی و فەرمووی:** ((ليلـزم كـل انسـان مصـلاه: **با هەر کەس لە نوێژگەکـەیدا بمێنێتەوە**))، **پاشان فەرمووی:** ((اتدرون لم جمعتكم؟: **ئایا دەزانن بۆچی کۆتانم کردەوە**))، **گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی:**

((إني، والله ما جمعتكم لرغبة ولا لرهبة، ولكن جمعتكم، لأن تميما الداري، كان رجلاً نصرانياً، فجاء، فبايع وأسلم. وحدثني حديثاً وافـق الـذي كنـت أحدثكـم عـن مسـيح الدجـال: **بەخودا من نە بۆ ئارەزوو و نە بۆ ترسێك كۆم نەكردونەتـەوە. بـەڵكو بـۆ ئـەوەم كـۆ كردونـەوە كـە تـەميمی داری، پیـاوێکی گـاور بـو، هـات بەیعـەتی دا و موسـڵمان بـو، سەربردەیەکیشـی بۆ گێڕامەوە، کۆکە لەگەڵ ئەو باسـانەی مـن لـە بـارەی مەسـیحی دەجال بۆ ئێوەم دەکرد))**.

((حدثني: أنه ركب في سفينة بحرية، مع ثلاثين رجلاً من لخم وجذام، فلعب بهم الموج شهراً في البحر، ثم أرفؤوا إلى جزيرة في البحر حتى مغـرب الشـمس، فجلسـوا في أقـرب السـفينة، فدخلوا الجزيرة، فلقيتهم دابة أهلب كثير الشعر، لا يدرون ما قبله من دبره من كـثرة الشـعر، فقالوا: ويلك، ما أنت؟ فقالت: أنا الجساسة، قالوا: وما الجساسة. قالت: أيها القوم، أنظـروا إلى هذا الرجل في الدير، فإنه إلى خبركم بالأشواق، قال: لما سمت لنا رجلاً فرقنـا منـها أن تكـون شيطانة، قال: فانطلقنا سراعاً، حتى دخلنا الدير، فإذا فيه أعظم إنسان رأيناه قط خلقـاً، وأشـده وثاقاً، مجموعة يداه إلى عنقه، مابين ركبتيه إلى كعبيه بالحديد، قلنا: ويلك ما أنت؟

قال: قد قدرتم على خبري، فإخبروني ما أنتم؟

قالوا: نحن أناس من العرب، ركبنا في سفينة بحرية، فصادفنا البحر حين اغتلم، فلعب بنا المـوج شهراً، ثم أرفأنا إلى جزيرتك هذه، فجلسا في أقربها، فدخلنا الجزيرة، فلقيتنا دابـة أهلـب كثـير الشعر، لا يدري ما قبله من دبره من كثرة الشعر، فقلنا ويلك ما أنت؟ فقالت: أنـا الجساسـة، قلنا: وما الجساسة؟ قالت: أعمدوا إلى هذا الرجـل في الديـر، فإنـه إلى خـبركم بالأشـواق، فأقبلنا إليك سراعاً، وفزعنا منها، ولم نأمن أن تكون شيطانة.

قال: فأخبروني عن نخل بيسان، قلنا عن أي شأنها تستخبر؟ قال: أسألكم عن نخلها، هل يثمـر؟ قلنا: نعم. قال: أما إنه يوشك أن لا يثمر.

قال: أخبروني عن بحيرة طبرية. قلنا: عن أي شأنها تستخبر؟ قال: هـل فيـها مـاء؟ قـالوا:

هي كثيرة الماء. قال: أما إن ماءها يوشك أن يذهب.

قال: أخبروني عن عين زغر، قالوا: عن أي شأنها تستخبر؟ قال هل في العين ماء؟ وهل يزرع أهلها بماء العين؟ قلنا له: نعم، هي كثيرة الماء، وأهلها يزرعون من مائها.

قال أخبروني عن نبي الأميين ما فعل؟ قالوا: قد خرج من مكة ونزل يثرب. قال: أقاتله العرب؟ قلنا: نعم، قال: كيف صنع بهم؟ فأخبرناه أنه قد ظهر على من يليه من العرب. وأطاعوه، قال لهم: قد كان ذلك؟ قلنا: نعم، قال: أما إن ذلك خير لهم أن يطيعوه.

وإني مخبركم عني؛ إني أنا المسيح، وإني أوشك أن يؤذن لي في الخروج، فأخرج فأسير في الأرض، فلا أدع قرية إلاّ هبطتها في أربعين ليلة، إلاّ مكة وطيبة، فهما محرمتان علي كلتاهما، كلما أردت أن أدخل واحدة أو واحداً منهما، إستقبلني ملك بيده السيف صلتا يصدني عنها، وإن على كل نقب منها ملائكة يحرسونها:
تەمیم وای بۆ گێڕامەوە، کە لەگەڵ سی پیاو لە لەخم و جەذام سواری کەشتیەکی دەریایی بون. مانگێك شەپۆلەکان یارییان پێ کردن و بەولاولای دادان، پاشان پەنایان بردە بەر دورگەیەك لە دەریاکەدا هەتا رۆژئاوابون، ئەوجا لە بەلەمەکانی کەشتیەکەیان دانیشتن و، لە دورگەکە وەژورکەوتن، جا گیانەوەرێکی زۆر تیسکنیان گەیشتێ لەبەر زۆری موەکەی پێش و پاشیان لێك جیانەدەکردەوە، پێیان گوت: کۆستت کەوێ، تۆ چیت؟ گوتی: من جەساسەم، گوتیان: جا جەساسە چیە؟ گوتی: گەلۆ، تەماشای ئەو پیاوەی کەن کە لەو دێرەدایە، زۆر موشتافی هەواڵی ئێوەیە. دەڵێ: کەناوی پیاوێکی بۆ ئێمە هێنا، لێی ترساین کە شەیتانێك بێ. دەڵێ: بەپەلە بۆی دەرچوین تا چوینە ناو دێرەکە، پیاوێکمان تێدا دی لە هەمو مرۆڤێك زەلامتر بو کە ئێمە دیتبمان. زۆر بە توندی دەست و ملی پێکەوە بەسترا بو، لە هەردو چۆکەکانیەوە تا پاشپانی پێی لە ئاسنی گیرابو. پێمان گوت: هەش بەسەر تۆ چی؟

گوتی: ئێوە هەواڵی منتان دەسکەوت، جارێ پێم بڵێن ئێوە چین؟

گوتیان: ئێمە خەڵکانێکی عەرەبین، سواری کەشتیەکی دەریایی بوین، دەریا هاروهاج بو و، شەپۆلەکان مانگێك ئێمەیان بە ملاولادا دا. پاشان پەنامان بردە بەر ئەم دورگەیەی تۆ، جا گیانەوەرێکی زۆر تیسکنمان گەیشتێ، لەبەر موەکانی

پێش و پاشی جودا نەدەکراوە، گوتمان: هەشبەسەر تۆچی؟ گوتی: من جەساسەم، گوتمان: ئەدی جەساسە چیە؟ گوتی: بچنە لای ئەو پیاوەی نێو ئەو دێرە، ئەو زۆر بە ئارەزوی هەواڵی ئێوەیە. ئێمەش خێرا هاتینە لای تۆ، چونکە لێی ترساین و دڵنیا نەبوین لەوەی کە شەیتان بێ.

پیاوەکە گوتی: هەواڵی دارخورماکانی (بیسان[1])م بدەنێ، گوتمان: لەچی دەپرسی. گوتی: ئایا بەردەگرێ. گوتمان: بەڵێ بەردەگرێ. گوتی: نێزیکە چیدی بەر نەگرێ.

گوتی: هەواڵی دەریاچەی (طەبەریە[2])م پێ بڵێن. گوتمان: لەچ بارێکی لێمان دەپرسی. گوتی: ئاوی تێدایە؟ گوتمان: ئاوێکی زۆری تێدایە. گوتی: نێزیك بوە ئاوەکەی بڕوا.

گوتی: دە هەواڵی سەرچاوەکەی شاری (زوغەر)[3]م بدەنێ. گوتمان: لەچ لایەنێکی؟ گوتی: سەرچاوەکەی ئاوی هەیە یان نا، وە ئایا خەڵکی ئەوێ بە ئاوەکەی کشتوکاڵ دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ، ئاوێکی زۆری هەیە، خەڵك کشتوکاڵی پێ دەکەن.

گوتی: دەپێم بڵێن پێغەمبەری نەخوێندەواران چی کرد؟ گوتمان: لە مەککە دەرکەوت و لە مەدینە جێنشین بو. گوتی: عارەب لەگەڵیدا جەنگاون یان نا؟ گوتمان: بەڵێ، گوتی: چی لەگەڵ عارەبان کرد. هەواڵمان دایێ کە بەسەر عەرەبەکانی دەوروبەری خۆیدا زاڵ بو و هەمو گوێڕایەڵی بون.

پێی گوتن: بەڕاستی، ئەوەش ڕویدا؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی: ئەگەر گوێڕایەڵی بکەن بۆ وان چاتر و خێرترە.

منیش با هەواڵی خۆمتان بدەمێ؛ من مەسیحم. نێزیك بوە ئیزن بدرێم و دەربکەوم، جا بە زەویدا دەگەڕێم، لەمیانەی چل شەواندا، جگە لە مەککە و مەدینە، شوێن نامێنی نەیچمێ. مەککە و مەدینە هەردوکیان بۆ من حەرام کراون، هەرچەند

[1] بیسان: شارێکي فەلەستینە.

[2] طەبەریە: دەریاچەیەك ئاوەکەي سازگارە، دەکەوێتە فەلەستین

[3] شاروچکەي یەکە لەلاي ڕۆگەي شام.

بمەویٚ بچمە ناو یەکێکیان فریشتەیەکی دەست بە شمشێری لەکالآن دەرکێشراو بەرەو ڕووم دیٚ و، ڕێم لیٚ دەگریٚ، لەسەر هەمو کەلەبەرێکی مەککە و مەدینە فریشتەیەك هەیە پاسی دەکا و دەیپارێزیٚ)).

فاطیمە (خوا لێی ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەر ﷺ داردەستەکەی بە مینبەرەکەیدا کێشا و فەرموی: ((هذه طيبة، هـذة طيبـة: ئەمە طيبەيە)) کە مەبەستی مەدینە بو، ((ألا هـل كنـت حدثتكـم ذلـك: ئایا من لەم بارەوە هەواڵم پێ داون؟)) خەڵك گوتیان: بەڵیٚ. فەرموی: ((فإنه أعجبني حديث تميم أنه وافق الذي كنت حدثتكم عنـه وعن المدينة ومكة، ألا أنه في بحر الشام أو بحر اليمن، لا بل من قبل المشرق، ما هـو مـن قبـل المشرق، ما هو من قبل المشرق ما هو: سەیرم بە قسەی تەمیم دیٚ کە کۆکە لەگەڵ ئەوەی من لەبارەی دەجال و مەککە و مەدینە بۆم باسکردون. بزانن کە لە دەریای شامدایە یا لە دەریای یەمەندا لەلای ڕۆژهەڵاتەوەیە، لەلای ڕۆژهەڵاتەوەیە) بەدەستی پیرۆزیشی ئاماژەی بۆ لای ڕۆژهەڵات کرد، فاطیمە گوتی: منیش ئەوەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەبەر کرد.[1]

ئەم فەرمودەیە بە ڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئیبنی صەیاد دەجالی گەورە نەبوە، بەڵکو دەجالی گەورە لە هەندیٚ دورگەی دەریایان لە بەندیٚ دایە، دەشبیٚ وەك گۆتەی هەندیٚ زانایان: یەکێك بیٚ لەو شەیتانانەی سلێمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەندی کردون، چونکە مانەوەی مرۆڤ لە ژیندا بۆ ئەم ماوە درێژە شتێکی دروە و، خودای بەرزیش زاناترە.

---

[1] رواه مسلم في صحيحه؛ (٢٢٦١/٤) ورقم الحديث ٢٩٤٢.

# جێباسی سێیەم

## دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم

خـودای بـەرز و کاربـەجێ پێـی ڕاگـەیاندوین، جولەکـە عیسـای کـوڕی مەریـەمی نـێردراو و پەیامبـەری خودایـان نەکوشـتوە، هەرچـەندە ئـەم بانگەشـەیە دەکـەن و گاوریش بەڕاستی دادەنێن، بەڵام لە حەقیقەتدا عیسا نەکوژراوە، بەڵکو خودا یەکێکی دیکەی بەو شوبهاندوە. هەرچی عیساشە خودا بۆ ئاسمانێی بەرزکردۆتەوە:

﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا، بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا: عیسایان نەکوشتبو، لە داریشیان نەدابو، بەڵکو لێیان شێوا و کەسانێکی کە توشی جیاڕاییێ هاتن لەبابەت کوشتنی عیساوە، لە دودڵی دان و، چ زانیاریەکیان نەبو و هەر بە دوای گومان کەوتون و بە یەقین ئەویان نەکوشتوە. بەڵکو خوا ئەوی بۆ لای خۆی بەرزکردەوە، خوا دەسەڵاتدار و دانایە﴾[1].

هـەروەها خـودا لـە کتێبـە پیرۆزەکـەیدا، ئاماژەی بـەوەی داوە کـە عیسـا لـە ئاخـیر زەمانێ دادەبـەزێ، دابەزنیشـی نیشـانە و بەڵگـەی نـێزیک بونـەوەی داهـاتنی قیامـەت دەبێ ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ: بەڕاستی عیسا هـۆی ئاگاداریـە بۆ ڕۆژی قیامـەت.﴾[2] هـەروەك هـەواڵی ئەوەشـی پێداویـن کـە خـەڵکی ئـەو سـەردەمی بـاوەڕی پـێ دێنـن ﴿وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ: هـەمو یـەکێك لـە کتێبییـان بەولـە مردنی بڕوا بە عیسا دێنن.﴾[3].

---

[1] سورة النساء: ١٥٧-١٥٨

[2] سورة الزخرف: ٦١

[3] سورة النساء: ١٥٩.

درێژەی ئەم دەقانەش لە فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺدا هاتوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەوەی ڕاگەیاندوە، کاتێك ئاشوبی دەجال توند دەبێ‌و، حاڵی بروودارانی ئەوکاتە تەنگ دەبێ، خودا، عیسای بەندە و پێغەمبەری خوا ﷺ دادەبەزێنی و، لەلای منارەی سپی ڕۆژهەڵاتی دیمەشقدا دێتە خوار، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ينزل عيسى بن مريم عند المنارة البيضاء شرقي دمشق: عیسای کوڕی مەریەم لەلای منارەی سپی خۆرهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێ))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی عیسای بۆ فەرموین کە دادەبەزێ وەك دەفەرموێ: ((ليس بيني وبين عيسى نبي، وإنه نازل، فإذا رأيتموه فاعرفوه، رجل مربوع، إلى الحمرة والبياض، ينزل بين ممصرتين، كأن رأسه يقطر، وإن لم يصبه بلل: هیچ پێغەمبەرێك لەنێوان من و عیسادا نیە، عیسا دادەبەزێ. جا ئەگەر دیتتان بیناسن، پیاوێکی بەژن مامناوەندیە. بەلای سور و سپیاتی دایە. لەنێوان دو بەرگی ڕەنگ کراو دایە و، وەك بڵێی سەری دڵۆپەئاوی لێ دەتکێ، هەرچەندە تەڕیش نەبوە))[2].

## خوازگەی یەکەم

## کاتی دابەزینی

عیسا ﷺ لەکاتێکدا دادەبەزێ کە جەنگاوەرە موسڵمانەکان بۆ نوێژی سبەینێ ڕیزبون و، پێشەواکەیان بۆ پێشنوێژی وە پێش کەوتوە، جا ئەو پێشەوایە دەکێشێتەوە و داوای لە عیسا دەکا پێشکەوێ و پێشنوێژیەکە بکا، بەڵام ئەم ڕازی نابێ.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((وإمامهم رجل صالح، فبينما إمامهم قد تقدم يصلي بهم الصبح، إذ نزل عليهم عيسى بن مريم الصبح، فرجع ذلك الإمام ينكص، يمشي القهقري ليتقدم عيسى، فيضع عيسى يده بين كتفيه، ثم يقول له: تقدم فصل، فإنها لك أقيمت، فيصل بهم إمامهم:

[1] رواه الطبراني في معجمه الكبير عن اوس بن اوس. صحيح الجامع الصغير: (٣٦١/٦) ورقمه: (٨٠٢٥)، وإسناده صحيح كما قال الشيخ ناصرالدين الألباني.

[2] في سنن ابي داود باسناد صحيح عن ابي هريرة. صحيح جامع الصغير (٩٠/٥) ورقم الحديث (٥٢٦٥).

پێشەوا و سەرلەشکری موسڵمانان پیاوێکی چاك دەبێ، جا لەوکاتەی پێشەواکەیان وەپێشیان کەوتوە تا نوێژی بەیانیان پێ بکا، عیسای کوڕی مەریەم لەو سبەینەیەی دادەبەزێ، جا ئەو پێشەوایە پشتاوپشت بەرەو دوا دەکشێتەوە تاکو عیسا پێشکەوێ، عیسا دەستی لەنێوان هەردو شانی دادەنێ و پێی دەڵێ: پێشکەوە و نوێژ بکە، چونکە قامەتەکە بۆ تۆ کراوە، جا پێشەواکەیان نوێژەکەیان پێ دەکا)).[1]

ئەمەش لەو کاتیدا دەبێ کە موسڵمانان لەباری خۆسازدان و ئامادەبونن بۆ شەڕی دەجال.،لە فەرمودەیەکی ئەبو هورەیرە لەلای موسلیمدا هاتوە: ((فبینما هم یعدون للقتال، یسون الصفوف، إذ أقیمت الصلاة، فینزل عیسی بن مریم، فأمهم: کاتێك موسڵمانان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکەن و، ریزەکانیان ڕێك دەخەن، قامەتی نوێژ دەکرێ، جا عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێ و پێشەوایەتیان بۆ دەکا)).

لە کتێبی (ایمان)یشدا هەر لەلای موسلیم بەم بێژەیە هاتوە: ((کیف أنتم إذا نزل إبن مریم فیکم وأمکم: ئەدی ئێوە چۆنن ئەگەر ئیبنی مەریەم لەناوتان دابەزێ و پێشەوایەتیتان بۆ بکا)).[2]

لێرەدا لەم فەرمودەیە مەبەست ئەوە نیە کە عیسا لە نوێژێ وەپێشیان دەکەوێ، چونکە فەرمودەی یەکەم وادەگەیەنێ عیسا پێشنوێژی ڕەت دەکاتەوە و ئەو پێشەوایە وەپێش دەخات کە قامەتی نوێژەکەی بۆ کراوە.

فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە لای بوخاری و موسلیم هەروایە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((کیف انتم اذا نزل بن مریم فیکم و امامکم منکم: ئێوە چۆنن ئەگەر ئیبنی مەریەمتان تێدا دەبەزی و پێشەواشتان لە خۆتان بو)).[3]

لە صەحیحی موسلیمیشدا لە جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ هاتوە کە گوێی لە

---

[1] رواه إبن ماجة، وابن خزيمة، والحاكم، وإسناده صحيح، أنظر صحيح الجامع الصغير: (٦/٢٧٧).

[2] رواه مسلم عنم أبي هريرة، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٤/٢٢٢١) ورقم الحديث (٢٨٩٧)، ورواه في كتاب الإيمان، باب نزول عيسى بن مريم: (١/١٣٦) ورقمه (١٥٥).

[3] رواه البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب نزول عيسى بن مريم، فتح الباري: (٦/٤٩١)، ورواه مسلم في صحيحه، كتاب الإيمان، (١/١٣٦) ورقمه (١٥٥).

پێغەمبەر ﷺ بوە دەیفەرمو: ((لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحـــق ظــاهرين إلى يـــوم القيامة، قال: فيـــزل عيسى بن مريم، فيقول أميرهم: تعال صل لنا، فيقول: لا، إن بعضكم علـــى بعض أمراء، تكرمة الله هذه الأمة: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من لەسەر حەق شەڕ دەکەن و سەردەکەون هەتا ڕۆژی قیامەتێ، فەرموی: جا عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوار، فەرماندەکەیان دەڵێ: فەرمو وەرە نوێژمان بۆ بکە. دەفەرموێ: نەخێر، ئێوە هەندێکتان فەرماندەی هەندێکتانن، ڕێزانەی خودایە بۆ ئەم ئوممەتە)).[1]

## خوازگەی دوەم

## عیسا پاش دابەزینی بەچی حوکم دەکا؟

دەقەکانی پێشو بەڕاشکاوی دەڵێن پێشنوێژ هەر یەکێکە لەم ئوممەتە، هەرچی ریوایەتی (فأمّکم) و (أمـــهم) واتە عیسا پێشەوایەتی دەکا، مراز و مەبەست لێرەدا پێشنوێژی کردن نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە حوکمی کتێبی خودای بەرزیان تێدا بەرپا دەکا، واتە بەکتێبی خوای مەزن پێشەوایەتیان دەکا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((کیف انتم اذا نزل فیکم ابن مریم فامکم منکم: ئێوە چۆنن ئەگەر عیسای کوڕی مەریەم لەنێوتان دابەزی و لەخۆتان پێشەوایەتی کردن)).[2] جا یەکێك لە بگێڕەوەکانی ئەم فەرمودەیە کە (ئیبنی ئەبی ذئیب)ـە بە (وەلیدی کوڕی موسیلم)[3]ی گوت: دەزانی (امّکم منکم) مانای چیە؟ گوتی: پێم دەڵێی؟ گوتی: بە کتێبی پەروەردگاری بەرزتان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ پێشەوایەتیتان دەکا.[4]

هۆی وەپێش نەکەوتنی عیساش بۆ پێشنوێژی، بەڵگەیە کە عیسا وەکو شوێنکەوتەیەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە و، بە قورئان حوکم دەکا نەك بە ئینجیل،

---

[1] رواه مسلم في كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٧/٤) ورقمه (١٥٦).

[2] حديث ابي هريرة عند مسلم.

[3] بگێرەوەی فەرمودەکەیە لە ئیبنو ئەبی ذئیب.

[4]:صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٧/٤) ورقمه (١٥٦).:

**چونکه شەریعەتی قورئانی پیرۆز، شەریعەتەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوە، خودای بەرزیش بەڵێن و پەیمانی لەهەمو پێغەمبەران وەرگرتوە، کە ئەگەر موحەممەد ﷺ ڕەوانە کراو ئەوان لەژیاندا بون، هەمو باوەڕی پێ بێنن و شوێنی بکەون:**

﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ، فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: **کاتێك خودا بەڵێنی پتەوی لە پێغەمبەران وەرگرت کە کتێب و داناییمان بە ئێوە دا، پاشان پێغەمبەرێك هاتە لاتان، ئەمەی لاتانە بەڕاست دادەنێ و دەیسەلمێنێ، دەبێ بڕوای پێ بێنن و یارمەتی بدەن. جا پێیانی گوت: ئایا بڕواتان بەوە هەیە و پەیمان و بەڵێنی پتەوتان لەسەر گرێداوە؟ گوتیان: بەڵێ بڕوامان هەیە. جا خودا پێی فەرمون: دە لەسەر ئەم بەڵێنە شایەد بن، منیش لەگەڵ ئێوەدا شایەدم. کەوایە هەر کەسێکی لەمەودوا لەبەڵێنی پتەوی خۆی ڕو وەربگێڕێ، ئەوانە فاسیق و لە دین دەرچون.**﴾[1]

**جا عیسا بە شوێنەکەوەتی پێغەمبەر ﷺ دادەبەزێ و شەریعەتی قورئان دەکاتە فەرمانڕەوا، هەر بۆیە لەدوای ئەو پیاوە صاڵحەدا نوێژ دەکا، ئەمەش شانازیەکی مەزنە بۆ ئەم ئوممەتە. لە فەرمودەیەکی صەحیح کە ئەبو سەعید لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە، هاتوە دەفەرموێ:** ((منا الذي يصلي عيسى بن مريم خلفه: **پیاوی وا لە ئێمەدا هەیە عیسای کوڕی مەریەم نوێژی لە پشت دەکا**)).[2]

**لەمیانەی وەرامدانەوەی ئەوان کەسانی دابەزینی عیسا وەدرۆ دەخەنەو، وا هەڵدەبەستن ئەگەر دابەزینەکەی هەق بوایە پێچەوانەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەبو کە دەفەرموێ:** ((لانبي بعدي: **چ پێغەمبەری دی لە پاش من نیە**)) **و، دابەزینیشی مایەی سڕینەوەی شەرعی پێغەمبەر ﷺە.**

**ئەوەوی دەڵێ: (ئەم بەڵگەهێنانەوەیە گەندەڵ(فاسد)ە، چونکە مەبەست لە دابەزینی عیسا ئەوە نیە کە وەکو پێغەمبەرێك بە شەرعێکی نوێ دابەزێ کە شەرعی**

---

[1] سورة ال عمران: ٨١–٨٢.

[2] رواه ابو نعيم في كتاب المهدي صحيح الجامع الصغير: (٥/٢١٩)، حديث رقم: (٥٧٩٦).

ئێمە بسڕێتەوە. نە لەم فەرمودانە و نە لە هی دیکەش شتێك بە مانایە نیە، بەڵکو وا بە ڕاستی هاتوە کە وەك فەرمانڕەوایەکی دادوەر دادەبەزێ، بەشەرعی ئێمە حوکم دەکا، ئەو شتانەش لە شەرعی ئێمەدا زیندو دەکاتەوە کە خەڵکی وازیان لێ هێناوە).[1]

## خوازگەی سێیەم

## لەناوبردنی دەجال لەلایەن عیساوە

یەکەم کاری عیسا ئەنجامی دەدا، بەرەنگار بونەوەی دەجالە، عیسا هەر پاش دابەزینی، ڕودەکاتە بەیتولمەقدیس، کە لەوێ دەجال کۆمەڵە موسڵمانێکی گەمارۆ داوە، جا عیسا فەرمانیان دەداتێ دەرگەکە بکەنەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((فإذا إنصرف، قال عيسى: إفتحوا البـــاب، فيفتحـــون ووراءه الدجال، معه سبعون ألف يهودي، كلهم ذو سيف محلى وساج، فإذا نظر إليه الدجال ذاب كمـــا يذوب الملح في الماء وينطلق هارباً...، فيدركه عند باب لد الشرقي، فيقتله، فيهزم الله اليـــهود..: جا کە جێی دێڵی، عیسا دەڵێ: دەرگەکە بکەنەوە، جا دەیکەنەوە و دەجالیشلەپشت دەرگاکەیە و هەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵە، هەمو شمشێری ڕازاوەیان پێیە و تەیلەسانیان لەسەرە، جا کە دەجال تەماشای عیسا دەکا وەکو خوێی ناو ئاو دەتاوێتەوە و، هەڵدێ و ڕادەکا...، جا عیسا لە لای دەرگەی ڕۆژهەڵاتی لید دەیگاتێ و دەیکوژێ: جا خودا جولەکان بە دۆڕان دەدا..))[2]

هەروا لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دابەزینی عیسا و نوێژی بە بڕوادارن ڕاگەیاندوە و، پاشان فەرمویەتی: ((فإذا رآه عـدو الله، ذاب كما يذوب الملح في الماء، فلو تركه لانذاب حتى يهلك، ولكن يقتله الله بيده، فيريـــهم دمه في حربته: جا کە دوژمنی خوا دەیبینێ، وەکو خوێی ناو ئاوێ دەتاوێتەوە، جا

---

[1] شرح النووي على مسلم: (١٨ \ ٧٦)

[2] في سنن ابن ماجة و صحيح ابن خزيمة، مستدرك الحاكم عن ابي امامة. صحيح الجامع الصغير: (٦/٢٧٥)، ورقمه: (٧٧٥٢).

ئەگەر وازی لێ بێنێ، دەتاوێتەوە تا لەناودەچێ. بەڵام خودا بەدەستی وی دەیکوژێ، جا خوێنەکەی بە نێزەکەیەوە بە موسڵمانان نیشان دەدا)).[1]

نهێنی و ڕازی تاوانەوەی دەجالیش لەوەیدایە، کە خوای گەورە بۆنێکی تایبەتی بەخشیوەتە هەناسەی عیسا، هەر کافرێك ئەو بۆنە بکا دەمرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((فبينما هو كذلك إذ بعث الله المسيح بن مريم، فينـــزل عند المنارة البيضاء شرقي دمشـــق، بين مهرودتين، واضعاً كفيه على أجنحة ملكين، إذا طأطأ رأسه قطر، وإذا رفعه تحدر منـــه جمـــان كاللؤلؤ. فلا يحل لكافر يجد ريح نَفَسه إلا مات، ونَفَسه ينتهي حيث ينتهي طرفه، فيطلبـــه حـــتى يدركه بباب لدّ، فيقتله، ثم يأتي عيسى بن مريم قوم قد عصمهم الله منه، فيمسح عن وجوهـــهم، ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة: جا کە ئاوایە، خودا مەسیحی کوڕی مەریەم دەنێرێ، لەلای منارەی سپی لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێ، لەنێو دو بەرگی ڕەنگ کراو بە ویرس و پاشان بەزەعفەران، هەردو ناولەپی لەسەر باڵی دو فریشتان داناوە، ئەگەر سەری دانەوێنێ، دڵۆپی لێ دەتکێ، ئەگەر بەرزیشی کاتەوە، موروی زیوین و دڵۆپی وەك مرواری لێ دەبارێ، هەر کافرێکی بۆنی هەناسەی بکا دەمرێ، تا چاوی بڕدەکا هەناسەشی دەڕوا، جا شوێن دەجال دەکەوێ تا لە دەرگەی لید دەیگاتێو، دەیکوژێ، پاشان عیسای کوڕی مەریم دێتە لای قەومێك خوا لە دەجالی پاراستبون، ڕویان دەسڕێتەوە و، باسی پلەو پایەکانیان دەکا لە بەهەشتێدا)).[2]

عیسا بۆیە وازی لە دەجال نەهێناوە تا کوشتویەتی و لێنەگەڕاوە بۆ خۆی بمرێ، تاکو کۆتایی بە ئەفسانەی ئەو مەخلوقە و ئاشوبەکەی بێنێ. چونکە ئەگەر خەڵك کوشتن و مردنی ببینن. دەزانن و باوەڕ دێنن کە بەندەیەکی لاوازی بێ دەسەڵاتە و، بانگەشەکەی پوچ و بەتاڵ و درۆیە.

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٢٢٢١/٤) ورقم الحديث (٢٨٩٧).

[2] في صحيح مسلم عن النواس بن سمعان عن النبي في حديث طويل؛ صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكـر الدجال: (٢٢٥٣\٤)، ورقمه: (٢٩٧٣).

## خوازگەی چوارەم

# ئەرکی عیسا پاش لەناوبردنی دەجال و تونا کردنی یاجوج و ماجوج

عیسا، دەجال و ئاشوبەکەی لەناو دەبا، لەسەردەمی ویشدا یاجوج و ماجوج دەردەکەون هەروەك باسی دەکەین و ئاژاوەیەکی مەزن لە زەویدا بەرپادەکەن، جا عیسا لە خوا دەپاڕێتەوە و، دوعاکەی گیرا دەبێو، یاجوج و ماجوج بەمردوێتی رۆژ دەکەنەوە و، کەسیان لێ نامێنێ، ئەوجا عیسا خۆی تەرخان دەکا بۆ مەزنترینی ئەو ئەرکانەی بۆی دابەزیوە و، بریتیە لە فەرمانڕەواکردنی شەریعەتی ئیسلام و، لەنێوبردنی رێبیر(مبادئ)ە وێڵەکان و، ئاینە گۆڕاوەکان.

لە ئەبو هورەیرەﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((والذي نفسي بيده، ليوشكن أن ينـزل فيكم ابن مريم حكما عدلاً، فيكسر الصليب، ويقتل الخنـزير، ويضع الحرب، ويفيض المال، حتى لا يقبله أحد، حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها: سوێند بەو خوایەی گیانی منی ها وە دەس، نێزیك بوە -عیسای کوڕی مەریم-تان وەك فەرمانڕەوایەکی دادگەر تێدا دابەزێ، جا خاچ دەشکێنێ و، بەراز دەکوژێ و، شەڕ کۆتادێنێ و، ماڵ زۆر زێدە دەکا، تا یەکێك نابێ وەریگرێ، هەتا وای لێدێ تاکە سوژدەیەك چاتر دەبێ لە دونیا و ئەوی تێی دایە[1]))[2].

لەگێڕانەوەیەکی دیکەش لەلای موسلیمدا، لەئەبو هورەیرەوە هاتوە: ((والله لينـزلن ابن مريم حكما عدلاً، فليكسرن الصليب، وليقتلن الخنـزير، وليضعن الجزية، ولتتركن القلاص،

---

[1] بۆیە لەلای هەر یەکێکیان سوژدەیەك لە دنیا خۆشەویستتر دەبێ، چونکە گەلێك ئارەزوی خێرو چاکە دەکەن بەهۆی ئەو ئاوەرەی بەدیتی عیسا و نیاشەکانی پێشتر لە دڵیاندا ئارام دەگرێ و، دڵنیا بونیان لەنێزیکبونەوەی قیامەت.

[2] رواه البخاري في صحيحه، كتاب أحاديث الأنبياء، باب نزول عيسى بن مريم، فتح البـاري: (٦/٤٦٠) ورواه البخاري في موضعين آخرين: الأول في كتاب المظالم، باب كسر الصليب، فتح البـاري: (٥/١٢١) والثاني: في كتاب البيوع، باب قتل الخنزير، فتح الباري: (٤/٤١٤). ورواه مسلم في كتاب الإيمان، بـاب نزول عيسى: (٤/١٣٥) ورقمه (١٥٥).

فلا يسعى عليها، ولتذهبن الشحناء والتباغض والتحاسد، وليَدعونّ إلى المال فــلا يقبلــه أحــد:

سـوێند بـه خـوا، كـوڕی مەریـەم وەك فەرمانڕەوایـەكی دادوەر دادەبـەزێ، جـا خـاچ دەشـكێنێ و، بـەراز دەكـوژێ و، سـەرانە هـەڵدەگرێ و، حوشـتری نـێر و مـێ واز لێ دەهێنـدرێ و كـەس ئیشـی پـێ ناكـا. دژمنایـەتی و رق و كینـە و ئیرەیی(حەسـودی) بەرامبەر یەكتر نامێنێ، خەڵك بانگ دەكرێ ماڵی پێ بدەن هیچ كەس قبوڵی ناكات))[1].

هەروەها لە صەحیحی موسلیم لـە فەرمودە درێژەكەی نەواسی كوڕی سەمعاندا، كە باسی دەجال و دابەزینی عیسا و دەركـەوتنی یـاجوج و مـاجوجی تێدا هـاتوە، لـە كۆتاكەشـیدا، پێغەمبــەر ﷺ دوعاكـەی عیسـای باسـكردوە، لـەو كاتـەی بارودۆخیـان تـەنگ دەبێ و، خـوداش دوعاكـەی قبـوڵ دەكا و، یـاجوج و مـاجوج تونـا دەكـا، پاشـان دەفەرموێ:

((ثم يهبط نبي الله عيسى وأصحابه إلى الأرض، فلا يجدون في الأرض موضع شــبر إلا مــلأه زهمهم، ونتنهم. فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه إلى الله، فيرسل الله عليهم طيراً كأعناق البخــت، فتحملهم، فتطرحهم حيث شاء الله، ثم يرسل مطراً، لا يُكَنُّ منه بيت مدر ولا وبر، فيغسل الأرض حتى يتركها كالزلقة، ثم يقال للأرض: أنبتي ثمرتك، وردي بركتك، فيومئذ تأكل العصابــة مــن الرمانة، ويستظلون بقحفها، ويبارك في الرسِّل، حتى أن اللقحة من الإبل لتكفي الفئام من النــاس، واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس، واللقحة من الغنــم لتكفــي الفخــذ مــن النــاس:

پاشـان عیسـای پێغەمبـەری خـوا و هـاوەڵانی دادبەزنەسـەر زەوی، بسـتەخاكێك نادۆزنەوە، مەگەر دۆن و بۆگەنی وان داینەگرتبێ، ئەوجا عیسای پێغەمبـەری خـوا و هاوەڵانی ڕودەكەنە خودا، خوداش باڵندەی گەورەی وەكو ملی حوشتری خوراسانیان دەنێرتە سەر، كەلاكەكان هەڵدەگرن و، بەویستی خوا لە شوێنێكیان هەڵدەدەن، پاشـان بارانێكی وا دەنـێرێ، چ خـانو و ڕەشمـاڵان هـەڵناوێرێ، تـا زەوی دەشـواتەوە و، وەك ئاوێنە پاكی دەكاتەوە، ئەوجا بەزەوی دەگوتـرێ: بەروبومت بڕوێنـە و، پیت و فـەڕت بگەڕێنەوە. ئەوێ ڕۆژێ كۆمەڵێك لە هەنارێك دەخۆن و، بە تویكڵەكەی سێبەر لەخۆ

---

[1] رواه مسلم. كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (٤/١٣٥) ورقمه (١٥٥).

دەکەن و. شیر بەرەکەتی دەکەوتێ، تا شیری حوشترێکی تازە زاو بەشی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر دەکا و، شیری چێڵێکی تازە زاو بەشی هۆزێك دەکا و، شیری مەڕێکی تازە زاو بەشی بەرەبابێك دەکا)).[1]

## خوازگەی پێنجەم

## پوختەی ئەو دەقانەی لەبارەی عیساوە هاتون

١- هیچ گومان لەوەدا نیە کە عیسا ﷵ لە ئاخیرزەماندا دادەبەزێ، دەقەکانیش لەم بابەتە بە تەواتور لە پێغەمبەر ﷺ هاتون. بەڕاست نەزانینی دابەزینی عیساش وەدرۆ خستنەوەی هەواڵی پێغەمبەر ﷺە. بێشك هەواڵی پێغەمبەرﷺیش ڕاست و دروستە و چ درۆی تێدا نیە. قورئانی پیرۆزیش لە زێتر لەشوێنێکدا ئاماژەی بە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم فەرموە. هەروەك دەفەرموێ:

﴿وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا: هیچ یەکێك لە ئەهلی کیتاب نیە، مەگەر ئەوەی بەر لەمردنی بە عیسا بڕوا دێنی و، لە ڕۆژی دواییدا لەسەر هەمویان شایەد دەبێ﴾.[2]

بۆیەش کاتێك ئەبو هورەیرە فەرمودەی دابەزینی عیسای وەك فەرمانڕەوایەکی دادوەر هێناوە...[3] لە کۆتاییدا گوتی: ئەگەر حەزیش دەکەن ئەو ئایەتە بخوێنەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ . .﴾ الآية.[4]

٢- عیسا بۆ هەندێ دێ تا شەریعەتی قورئان بکاتە فەرمانڕەوا: پێشتر ئەم مەسەلەیەو بەڵگەکانمان ڕون کردەوە.

٣- عیسا سەرجەم دینەکان لەنێو دەبا و، بێجگە لە ئیسلام چی دی لە کەس قبوڵ

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٤/٢٢٥٤)، ورقمه: (٢٩٣٧).

[2] سورة النساء: ١٥٩.

[3] فەرمودەکە لە صەحیحی بوخاري و موسلیم دا هەیە وەك باسکرا.

[4] صحيح الجامع الصغير: (٥/٢٢٦)، ورقمه: (٥٨٧٧).

ناکا، لەبەر ئەوە خاچ دەشکێنێ کە ڕەمزی نەصرانیەتی شێوێندراوە و، بەراز دەکوژێ کە ئیسلام حەرامی کردوە و، سەرانە هەڵدەگرێ، باجی سەر لە جولەکەو دیانان وەرناگرێ، لەموسڵمان بون بترازێ چیتریان لێ قبولْ ناکا. هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((فيقاتل الناس على الإسلام، فيدق الصليب، ويقتل الخنـــزير. ويضع الجزية، ويـــهلك الله في زمانه الملل كلها إلا الإسلام: جا لەسەر ئیسلام شەڕی خەلْکی دەکا، خاچ دەکوتێ و، بەراز دەکوژێ و، سەرانە هەڵدەگرێ و، لەسەردەمی ویشدا لە ئیسلام بترازێ خودا هەمو میللەتان لەنێو دەبا)).[1]

وەرەنەگرتنی سەرانەش بە نەسخ ناژمێردرێ. چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندوە، تاکو دابەزینی عیسا سەرانە قبول دەکرێ. پاشان قبولْ ناکرێ. ئەوەوی دەڵێ: کە دەفەرموێ ((ويضع الجزية)) مانای وایە چی دی قبولی ناکا و، لە موسڵمان بون بترازێ چی دی لە بێبڕوایان قبولْ ناکاو، ئەوی سەرانەشی بداتێ وازی لێ ناهێنێ، لە ئیسلامەتی یا کوشتار بترازێ چی دی قبولْ ناکا. ئەبو سلێمانی خەطابی پێشەواو زانای تریش وایان گوتوە.

جا لەوانەیە بگوترێ: ئەمە پێچەوانەی حوکمی شەرعە لەمڕۆدا، چونکە ئەگەر کتێبیەك سەرانەکەی دا، واجبە لێی قبولْ بکرێ و، کوشتنی دروست نیە و، نابێ بۆ موسڵمان بونی زۆری لێ بکرێ.

وەرامەکەی وایە: کە ئەم حوکمە تا قیامەت بەردەوام نیە، بەڵکو بە زەمانی پێش عیسا عليه السلام وابەستەیە. پێغەمبەرﷺیش لەو فەرمودە صەحیحانە نەسخەی ئەو حوکمەی پێ ڕاگەیاندوین، بۆیە عیسا نیە کە حوکمەکە لادەبا و هەڵیدەگرێ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ سڕینەوەکەی ڕون کردۆتەوە، دەنا عیسا هەر بە شەرعی ئێمە حوکم دەکا).[2]

---

[1] حديث ابي هريرة عند ابي داود باسناد صحيح. صحيح الجامع: (٥/٩٠)، ورقمه: (٥٢٦٥).

[2] شرح النووي مسلم: (٢/١٩٠)

**٤- خۆشـی و هـەرزانی و، سـەروەرێتی ئاشـتی و ئاسـایش لـەو زەمـانیدا، ئـەو دەقانەی هاوردمان هەواڵی ئەو ڕێژەو و پیت و فەرە مەزنەی ئەو سەردەمیمان پێدەدا. لـەپاڵ ئـەو ئاسایشـە فرەیـەی لـەوان ڕۆژانـدا خـودا وە بـەندانی خـۆی دەبەخشـێ. ئەوشیان رون کردۆتـەوە؛ چـۆن نـاکۆکی و ڕق و کینـەی نێـو خـەڵکی هـەڵدەگیرێ و، سەرجەم مرۆڤایەتی لەسەر پەرستنی خودای بەرز کۆك و جەم دەبن.**

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((فيكون عيسى بن مريم في أمتي حكماً عدلاً، وإماماً مقسطاً، يدق الصليب، ويذبح الخنزير، ويضع الجزية، ويترك الصدقة، فلا يسعى على شاة ولا بعير، وترفع الشحناء والتباغض، وتنزع حُمَةُ كل ذات حُمَة، حتى يدخل الوليد يده في الحيّة، فلا تضرّه، وتضرّ الوليدة الأسد، فلا يضرها، ويكون الذئب في الغنم كأنه كلبها، وتملأ الأرض من السلم، كما يملأ الإناء من الماء، وتكون الكلمة واحدة، فلا يعبد إلا الله، وتضع الحرب أوزارها، وتسلب قريش ملكها، وتكون الأرض كفاثور الفضة، تنبت نباتها بعهد آدم، حتى يجتمع النفر على القطف من العنب، فيشبعهم، ويجتمع النفر على الرمانة، فتشبعهم، ويكون الثور بكذا وكذا من المال، ويكون الفرس بدريهمات..:

**جا عیسای کوڕی مەریـەم لـەنێو ئوممـەتی منـدا دەبێتـە فەرمانڕەوایـەکی دادەور و، پێشـەوایەکی سەرڕاسـت و دادگـەر، خـاچ دەکوتـێ و، بـەراز سـەردەبرێ و، سـەرانە هەڵدەگرێ و، واز لەماڵ بەخشین دێنێ. نە بەدوای کاوڕدا دەچێ نە بەدوای حوشتر[١]. ناکۆکی و کینـە هـەڵدەگیرێ و، ژەهـری هـەمو ژهرداریـك دەسـتێنرێ[٢]، تـا وای لێـدێ کوڕی ساوا دەستی دە زاری ماری ڕادەکا و، زیانی پێ ناگەیەنێ، کچی ساواش زیان بە شێر دەگەیەنێ، ئەم زیـانی پـێ ناگەیـەنێ، گورگیـش لـەنێو مـەڕی وەکـو سـەگی شوانی لێدێ و، چۆن ئاو دەفرێك پڕدەکا، ئاوا زەوی پڕ ئاشتی دەبێ. قسـەش هـەمو دەبنە یەك و، بێجگە لەخوا ناپەرسترێ و، شەڕ و شۆڕ دادەکەوێ و، موڵك لە قوڕەیـش دەستێنرێ و، زەمین وەکو مافورێکی زیویـنی لێدێ، وەکو سەردەمی ئادەم روەکـی خۆی دەڕوێنێ، تا وای لێدێ کۆمەڵە کەسێك لەسەر هێشوە ترێیەك خڕ دەبنەوەو پێی تێر دەبن و، کۆمەڵێك لەسەر هـەنارێك کۆدەبنـەوە و تێریـان دەکـا، جـا جوانەگایـەك**

---

[١] چونکە کەس پێویستی بەکۆشینی گەڕان بەدوای بژێوی دانابێ.

[٢] وەکو ژاری مار و دوپشکان.

بەهێندە و هێندە ماڵەی دەبێ و، ماینێك بە چەند درهەمێك دەبێ...))[1]

## خوازگەی شەشەم

## خۆشی ژیان لە پاش مەسیح

ئەو بارەی دەقەکان باسی دەکەن لەبابەت ژیانی ئەو ماوەیە، تاکە حاڵەتە لە مێژوی مرۆڤایەتیدا، کە خەڵکی لە خۆشی و ئاسایش و ئاشتیدا دەژین و ژیانیان فرە ئاسودەیە، بۆیە حەزرەت بەبەهرەکانی ژیانی ئەوانە دەبردرێ، لە فەرمودەشدا هاتوە: ((طوبى لعيش بعد المسيح، يؤذن للسماء في القطر، ويؤذن للأرض في النبات، حتى لو بذرت حبك على الصفا لنبت، وحتى يمر الرجل على الأسد فلا يضره، ويطأ على الحية فلا تضره، ولا تشاحّ، ولا تحاسد، ولا تباغض: مزگێنی بۆ ژیانی دوای مەسیح، ئاسمان مۆڵەتی بارینی دەدرێ و، زەوی مۆڵەتی ڕوانی دەدرێ، تاکو ئەگەر تۆو بەبەردێکی لوس وەرکەی، شین دەبێ و دەڕوێ، و وای لێدێ پیاو بەلای شێردا دەڕوا و زیانی پێناگەیەنێ و، پێ لەماری دەنێ زیانی پێناگەیەنێ، ڕژدی و ڕەزیلی نامێنێ و، ئێرەیی و کینە نامێنن)).[2]

## خوازگەی هەفتەم

## مانەوەی عیسا لە زەوی

عیسا چل ساڵان لە زەویدا دەمێنێتەوە، هەروەکو لە فەرمودەیەکی صەحیحی سونەنی ئەبو داود لە ئەبو هورەیرە هاتوە: ((فيمكث في الأرض أربعين سنة، ثمّ يتوفى، ويصلي عليه المسلمون: ئەوجا چل ساڵان لە زەویدا دەمێنێتەوە، پاشان کۆچی دوایی دەکا و، موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن)).[3]

---

[1] صحيح الجامع الصغير: (٦\٢٧٦) ورقمه: (٧٧٢٥).

[2] حديث صحيح، رواه أبوبكر الأنباري، والديلمي، والضياء عن أبي هريرة، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٥٥٩/٤)، ورقمه: (١٩٢٦).

[3] صحيح الجامع: (٩٠/٥)، ورقمه: (٥٢٦٥).

لـەم ماوەیـەی ژیـانیدا، حوکمـی ئیسـلامی بـەرپادەکا و، ڕوەو ڕوگـەی موسـڵمانان نوێـژ دەکا. ئـەو فەرمودانـەشمان پێشـتر هێناوەتـەوە کـە باسـی نوێژکردنـی دەکـەن لـە دوای پیاوە صالْحەکە لەکاتی دابەزینی، هەروەکو ئەوەش سەلماوە کە حەجی ماڵی خوا دەکا، لە صەحیحی موسلیم و موسنەدی ئەحمەد، لە ئەبو هورەیرە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((والذي نفسي بيده، ليهلنَّ ابن مريم بفـــج الروحـــاء، حاجـــاً ومعتمـــراً، أو ليثنيـــهما: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئیبنـی مەریـەم لـە ڕێگـەی ڕەوحـاء تـەهلیل دەکا، حەج و عەمرە بەجێ دەگەیەنێ یا هەردوك تەثنیە دەکا)).[1]

(روحاء)یش جێگەیەکە لەنێوان مەدینە و دۆڵی زەردی ڕێگەی مەککە و نێزیکەی چل یان سیوشەش میل لە مەدینەوە دورە.[2]

## خوازگەی هەشتەم

## پایەداری ئەوانەی هاوەڵێتی عیسا ﷺ دەکەن

لە موسنەدی ئەحمەد و سونەنی نەسسائی لـە ثـەوبان هـاتوە، لـە پێغەمبەرﷺەوە، فەرموی:

((عصابتان من أمتي أحرزهما الله من النار، عصابة تغزو الهند، وعصابة تكون مـــع عيســـى بـــن مـــريم: دو کۆمـەڵ هـەن لـە ئوممـەتی مـن خـودا لـەئاگر دەیانپـارێزێ، کۆمـەڵێك شـەڕی هینـد دەکەن، کۆمەڵێکیش لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دادەبن)).[3]

[1] صحيح الجامع الصغير: (٦/١٠٠)؛ ورقمه: (٦٩٥٥).
[2] لوامع الأنوار البهية: (٢/١١٣).
[3] صحيح الجامع: (٤/٣٥)؛ ورقمه: (٣٩٠٠).

## جێباسی چوارەم

# دەرکەوتنی یاجوج و ماجوج

**خودای بەرز لە سورەتی (کەهف)دا باسی ئەوەی کردوە، کە ذولقەرنێن لەگەڕان و سوڕانەوەکەیدا گەیشتە نێوان دو کێوان، لە نزیك ئەو دو کێوە قەومێکی بەدی کرد تەنانەت زۆر لە قسانیش نەدەگەیشتن، گازاندە و سکالاّیان بردەبەر لەبەر ئەو زیانەی یاجوج و ماجوج پێیان دەگەیەنن، داواشیان لێکرد بەربەستیکیان لەنێوان بنیات نێ: گەندی و خراپەکاری وانیان لێ وەدورخات، ئەویش داواکەی بۆ جێبەجێ کردن:**

﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا قَوْمًا لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً، قَالُوا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا، قَالَ مَا مَكَّنِي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا، آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا، فَمَا اسْطَاعُوا أَنْ يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا، قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا، وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا:

**تا گەیشتە نێوان دو کێوان و لەوێ هۆزێکی دیت لە قسان حاڵی نەدەبون، گوتیان: هۆ ذولقەرنەین، بەڕاستی یاجوج و ماجوج فەسادکاری سەر ئەم زەویەن، جا ئێمە خەرجەکەی بدەین هەتا تۆش بەربەستێك لەنێوان ئێمە و ئەواندا سازبدەی، ذولقەرنەین گوتی: ئەوی خوا پێی داوم باشترە، بەهێزێك یارمەتیم بدەن تا لەنێوان ئێوە و ئەواندا بەربەستێکی پتەو ساز بدەم. لەتە ئاسنی گەورەم بۆ بێنن، جا لەسەریەکی کەڵەکە کردن هەتا بەتەواوی نێوان دو کێوەکەی داگرت، گوتی: جا ئاگری بە دەوریدا هەڵکەن و خۆشی بکەن، کە ئاسنەکە سۆر بوەوە، گوتی:**

ئێستا مسی قاڵم بۆ بێنن تا بەسەریدا بڕێژم. جا سەرەنجام بەربەستێکی وای سازدا، کە هێند بەرز بو نەیانتوانی بپەڕنەوە سەری و هێند پتەو بو نەیانتوانی کونی کەن. گوتی: ئەمە میهرێکە لە پەروەردگارمەوە، بەڵام کاتێ وادەی پەروەردگارم دێ، بەسەریەکیدا دەکوتێ و، وادەی پەروەردگارم هەقە. جا لەو ڕۆژەدا کە دنیا دوایی دێ ئەوانە واز لێ دێنن کە لە نێو یەکدا شەپۆل دەدەن و جمەیان دێ و، فودەکرێ بەشەیپور(صور)دا، جا هەمویان کۆ دەکەینەوە﴾.[1]

یاجوج و ماجوج دو نەتەوەی ژمارە زۆرن، هەردوکیش لەوەچەی ئادەمن‌ﷺ. لە هەردو صەحیحاندا هاتوە:

((إن الله تعالى يقول: يا آدم، فيقول: لبيك وسعديك، فيقول: أبعث بعث النار، فيقول: وما بعث النار؟ فيقول: من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعون إلى النار وواحد إلى الجنة، فحينئذٍ يشيب الصغير، وتضع كل ذات حمل حملها، فقال: إن فيكم أمتين ما كانتا في شيء إلا كثرتاه، يأجوج ومأجوج: خودای بەرز لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمێ: هۆ ئادەم، دەڵێ: بەڵێ، پەروەردگارم، دەفەرموێ: نێردەی دۆزەخ بنێرە، دەڵێ: نێردەی دۆزەخ چیە؟ دەفەرمێ: لە هەر هەزاری نۆ صەد و نۆهەت و نۆی بۆ دۆزەخە و یەکێکی بۆ بەهەشتە، جا ئەو کاتی ساوا پیر دەبێ و زگپڕ زگەکەی دادەنێ، جا دەفەرمێ: دو نەتەوەتان تێدان لەهەر شتێکدا بن زۆریان دەکەن. ئەوانیش یاجوج و ماجوجن)).

ئیبنی کەثیر پاش هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: (نەوەوی لە ڕاڤەی موسلیمدا، لەبارە خەڵکێك دەگێڕتەوە، کە یاجوج و ماجوج لە تۆم(مَنيّ)ێك بەدیهێنراون کە لە ئادەمەوە دەرچوە، جا لەگەڵ خۆڵ تێکەڵ بوە و ئەوانی لێ بەدیهێنراون، کەواتە یاجوج و ماجوج تەنها لە ئادەم کەوتونەتەوەو لە حەوا نین).

جا ئیبنی کەثیر ئەم گۆتەیەی ڕەت کردۆتەوە و دەڵێ: (ئەمەش گۆتەیەکی زۆر نامۆیە، پاشان هیچ بەڵگەیەکی عەقلی یا نەقلی لەبارەوە نیە و، دروست نیە لێرەدا پشت بەوان شتان ببەسترێ کە هێندێك لە کتێبیەکان دەیگێڕنەوە و لە قسە هەڵبەستراوەکانی لای خۆیاندا هەیە).[2]

---

[1] سورة الكهف: ٩٣-٩٩

[2] تفسير ابن كثير: ٤/٣٢٤.

خـوای گـەورە پێـی ڕاگـەیاندوین، ئـەو بەربەسـتەی ذولقەرنـەین سـازی دا، ڕێــی دەرکەوتنی یاجوج و ماجوجی گرتوە: ﴿فَمَا اسْطَاعُوا أَنْ يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًـا: نە توانیـان پێـی هەڵگەڕێن و، نـە توانیان کونـی کـەن.﴾ هەروەك هـەواڵی پێداویـن تـا ئاخیرزەمان و داهاتنی وادەی خوا هەروا دەمێنێتەوە. ئـەوجا ڕێـی دەرچونیـان دەدرێ و ئەوکاتـە بەربەسـتەکە بەسـەریەکدا دەڕوخێ‌و، ئـەوانیش لـە خـەڵکی وەدەر دەکـەون ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّـا: بەڵام کە وادەی پـەروەردگارم دێ، بەسەریەکیدا دەکوتێ‌و، وادەی پەروەردگارم هەقە﴾. جا ئـەو کاتـە وەکو شـەپۆلی دەریا پۆل پۆل دەردەکەون، ﴿وَتَرَكْنَـا بَعْضَـهُمْ يَوْمَئِـذٍ يَمُـوجُ فِـي بَعْـضٍ: وا وازیـان لێ دێنـین کـە لەنێویـەکدا شـەپۆڵ دەدەن و دەجمێـن.﴾، ئەمـەش لـە نـێزیك داهاتنی قیامەت و فوکردن بەکاڕەنادا ڕودەدا؛ ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًـا: فودەکرێ بە شەیپوردا جا هەمویان کۆدەکەینەوە﴾.

لـە شـوێنێکی دیکەشـدا خـوا هـەواڵی پێداویـن لـەبارەی بەربەسـت سمـین و دەرکەوتنیان:

﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ، وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَـقُّ فَـإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَاوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِـي غَفْلَـةٍ مِـنْ هَـذَا بَـلْ كُنَّـا ظَـالِمِينَ: تا ئەو دەمی ڕێگە بۆ یاجوج و ماجوج دەکرێتەوەو، ئەوانە لەهەر بەرزاییەکەوە بە تالۆکە دێنە دەرێ﴾.[1]

ئەمەش لە ئاخیرزەماندا ڕودەدا، کە دەشفەرمێ ﴿مِـنْ كُـلِّ حَـدَبٍ يَنسِـلُونَ﴾ مەبەستی ئەوەیە بە خێرایی زەوی پیس و گەند دەکەن، کە دەریش دەکـەون ڕەوش و سیفەتیان وایە.

پێغەمبەری پایەداریش ﷺ هەواڵی ئەوەی پێداوین کە لەسەردەمی ویدا، کونێکی بچوکی هێندەی بازنەی نێوان هەردو پەنجەی دۆشاوەژە و ئەسپێ‌کوژەی تێکەوتوە. هـەروەك لـە صـەحیحی بوخـاریدا لـە زەینـەبی کچـی جـەحش هـاتوە، کـە ڕۆژێـك

---

[1] سورة الأنبياء ٩٦-٩٧.

پێغەمبەرﷺ بە پەشۆکاوی هاتە لای و دەیفەرمو: ((لا اله الا الله، ویل للعرب من شر قد إقترب، فتح من ردم یأجوج ومأجوج مثل هذه: لا اله الا الله، وا وەیلا بۆ عارەبان لەتاو ئەو شەڕەی نێزیك بۆتەوە کونێکی ئەمەندە کەوتە بەربەرستەکەی یاجوج و ماجوج))، بە پەنجەی دۆشاومژە و ئەسپێکوژە بازنەیەکی کرد و ئامارژەی پێکرد، زەینەب گوتی: جا گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە دەفەوتێین ئەگەر صالحانیشمان تێدابن؟ فەرموی: ((نعم، إذا کثر الخبث: بەڵێ، ئەگەر پیسی زۆر بو)).

دەرکەوتنی ئەو دو نەتەوەیەش، دەکەوێتە دوای دابەزینی عیسا و، سەرکەوتنی بەسەر دەجالدا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ثم یأتي عیسی بن مریم قوم قد عصمهم الله منه (أي من الدجال)، فیمسح عن وجوههم، ویحدثهم بدرجاتهم في الجنّة، فبینما هو کذلك إذ أوحی الله إلی عیسی، إني قد أخرجت عباداً لي، لا یدان لأحد بقتالهم، فحرز عبادي إلی الطور، ویبعث الله یأجوج ومأجوج، وهم من کل حدب ینسلون، فیمر أوائلهم علی بحیرة طبرية، فیشربون ما فیها، ویمر آخرهم، فیقولون: لقد کان بهذه مرة ماء، ویحصر نبي الله عیسی وأصحابه، حتی یکون رأس الثور لأحدهم خیراً من مائة دینار لأحدکم الیوم، فیرغب نبي الله عیسی وأصحابه، فیرسل الله علیهم النغف في رقابهم، فیصبحون فرسی کموت نفس واحدة، ثم یهبط نبي الله عیسی وأصحابه إلی الأرض، فلا یجدون في الأرض موضع شبر إلا ملأه زهمهم ونتنهم، فیرغب نبي الله عیسی وأصحابه إلی الله، فیرسل طیراً کأعناق البخت، فتحملهم فتطرحهم حیث شاء الله، ثم یرسل الله مطراً، لایکن منه بیت مدر ولا وبر، فیغسل الأرض حتی یترکها کالزلقة: پاشان عیسای کوڕی مەریەم دێتە لای قەومێك خوا لە دەجالی پاراستون، دەست بە رویان دادێنێ و، باسی پلە وپایەکانیان دەکا لە بەهەشتێدا، کە لەو بارەدایە، خوا نیگا بۆ عیسا دەنێرێ، کە بەندەگەلێکی خۆم دەرخستون کەس توانای شەڕی وانی نیە، جا بەندەکانم بەکێواندا سەرخە تا لەوێ پەنابگرن. ئەوجا خودا یاجوج وماجوج دەنێرێ، کە لەهەمو بەرزاییەکەوە بەتاڵوکە دێنە دەرێ و سەرزەوی گەند دەکەن. جا پێشقەڕەوڵیان بەلای دەریاچەی طەبەرییەدا ڕەت دەبن و، هەرچی تێیدایە فڕی

---

صحیح البخاري، کتاب الفتن، باب یأجوج ومأجوج، فتح الباري: (١٣/١٠٦).

دەکەن، کە کۆتاکەسیان دەگاتێ، دەڵێن: جارێك ئێرە ئاوی تێدابوە. جا عیسای پێغەمبەری خوا و یاوەرانی گەمارۆ دەدرێن، تا وای لێدێ سەرکە گایەك بۆ هەریەك لەوان لە صەد دیناری ئەمڕۆ بۆ ئێوە چاتر دەبێ. ئەوجا عیسای پێغەمبەری خواو هاوەڵانی ڕو دەکەنە خوا، ئەوجا خودا کرمیان دەخاتە گەردن، بۆ سبەینێ وەکو مردنی تاکە کەسێك دەمرن. پاشان عیسای پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بۆ سەر زەوی دێنە خوارێ و، جێ بستە خاکێك وەنادۆزن مەگەر بە دۆن و بۆگەنی پڕ بوبێ. دیسان عیسای پێغەمبەری خوا و یاوەرانی ڕودەکەنەوە خوا، خوای گەورەش باڵندەی هێندەی ملی حوشتری خوراسانی دەنێرێ، ئەو باڵندانە کەلاکەکانیان هەڵدەگرن و لەوجێی خوا حەز بکا هەڵیان دەدەن، پاشان خودا بارانێك دەنێرێ، چ خانو و ڕەشماڵان هەڵناوێرێ، زەوی دەشواتەوە وەك ئاوێنەی لێدەکا)).[1]

لە ریوایەتێکی دیکەدا لەپاش ئەوەی دەفەرمێ: ((لقد كان بهذه مرة ماء)) ئەم زیادەیەش هەیە: ((ثم يسيرون حتى ينتهوا إلى جبل الخمر، وهو جبل بيت المقدس، فيقولون: لقد قتلنا من في الأرض، هلمّ فلنقتل من في السّماء، فيرمون بنشابهم إلى السماء، فيرد الله عليهم نشابهم مخضوبة دما. پاشان دەڕۆن تا دەگەنە چیایەکی پڕ داروباری چڕ، کە کێوی بەیتولمەقدیسە، ئەوجا دەڵێن: ئەوی لەزەویدا بو کوشتمان، دەبا ئەوانی ئاسمانیش بکوژین. جا تیرەکانیان بەرەو ئاسمانێ هەڵدەدەن، خودا تیرەکانیان بە لەخوێن وەردراوی بۆ دەگێڕتەوە)).[2]

هەروەها لە ریوایەتی ئیبنی حەجەردا هاتوە: ((فاني قد انزلت عبادا لي، لا يدي لأحد بقتالهم: بەندەگەیەکی خۆم دابەزاندون کەس توانای کوشتاری وانی نیە)).[3] هۆی ئەوەی کە کەس ناتوانێ بەرەو ڕویان راوەستێ زۆری ژمارەیانە. بۆ بەڵگەی

---

[1] في صحيح مسلم عن النواس بن سمعان في حديثه الطويل؛ صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٢٢٥٤/٤)، ورقمه (٢٩٣٧).

[2] قال مسلم بعد سياقة للحديث السابق: حدثنا علي بن حجر السعدي، حدثنا عبدالله بن عبدالرحمن بن يزيد بن جابر، و الوليد بن مسلم، قال ابن حجر: دخل حديث احدهما في حديث الاخر عن عبدالرحمن بن يزيد بن جابر بهذا الاسناد (اسناد الحديث السابق).

[3] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٢٢٥٥/٤)، ورقمه (٢٩٣٧).

زۆریشیان ئەوە بەسە کە موسڵمانان حەفت ساڵ پاش تونا بونیان ئاگر لە چەکەکانیان دەکەنەوە. لەسونەنی تیرمیذیش بەسەنەدی موسلیم لە ریوایەتەکەی پێشتودا هاتوە: ((سیوقد المسلمون من قسي يأجوج ونشابهم وأسلحتهم وأترستهم سبع سنين: موسڵمانان هەشت ساڵان ئاگر بە خۆتره وتیر وچەك و قەڵغانی یاجوج و ماجوج هەڵدەکەن)).

جا ئەم فەرمودانە و فەرمودەگەلێکی هاوشێوەش بەڵگەی ئەوەن کە ئەم ژیارە مەزنەی، ئەو هەمو هێزە گەورەیەی داهێناوە لە بۆمب و موشەك، تێکڕای لەنێو دەچێو نامێنێ، واش پێدەچێ هەر خۆی خۆی بڕوخێنێ. جا مرۆڤایەتی دیسانەکێ دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی سەرپشتی وڵاخان و بە ڕم و خوتره و چەکی لەم بابەتە دەجەنگێ. خوداش زاناتره.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((إن يأجوج ومأجوج يحفرون كل يوم، حتى إذا كادوا يرون شعاع الشمس، قال الذي عليهم: إرجعوا فسنحفره غداً، فيعيده الله أشدّ ما كان، حتى إذا بلغت مدتهم، وأراد الله أن يبعثهم على الناس حفروا، حتى إذا كادوا يرون شعاع الشمس، قال الذي عليهم: إرجعوا فستحفره غداً إن شاء الله تعالى، واستثنوا، فيعودون إليه، وهو كهيئة يوم تركوه، فيحفرونه، ويخرجون على الناس، فينشفون الماء، ويتحصن الناس منهم في حصونهم، فيرمون بسهامهم إلى السماء، فترجع عليها الدم الذي أجفظ، فيقولون: قهرنا أهل الأرض، وعلونا أهل السماء، فيبعث الله عليهم نغفاً في أقفائهم، فيقتلون بها، قال رسول اللهﷺ: "والذي نفسي بيده إن دواب الأرض لتسمن، وتشكر شكراً من لحومهم": یاجوج و ماجوج هەمو رۆژێ بەربەستەکەیان هەڵدەکۆڵن، تا هێندەی نامێنێ تیشکی رۆژ بەدی کەن، ئەوی لەسەریانە دەڵێ: بگەڕێنەوە سبەینێ هەڵی دەکۆڵین، جا خودا لە جاران پتەوتری دەکاتەوە. تا دەگاتە ئەوکاتەی بۆیان دیاریکراوە و، خوا ویستی لەسەرە بۆ سەر خەڵکیان بنێرێ، ئەو جارەش هەڵی دەکۆڵن، تا هێندەی نامێنێ تیشکی رۆژ بەدی کەن، ئەوەی لەسەریانە دەڵێ: بگەڕێنەوە بەویستی خودای بەرز سبەینێ هەڵی دەکۆڵین، ئەو رۆژی (إن شاء الله) دەڵێن، جا کە دەگەڕێنەوە سەری،

[1] رواه ابن ماجة في سننه؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٥٧٩)، ورقمه: (١٩٤٠).

دەبینن هێشتا وەکو ئەو کاتەیە کە جێیان هێشتبو، جا هەڵی دەکۆڵن و، لەخەڵکی وەدەر دەکەون و، ئاو هیشك دەکەن و، خەڵکیش لە قوللە و قەڵاتەکانیان خۆیانیان لە دەست حەشار دەدەن، جا تیرەکانیان لە ئاسمانێ دەگرن و، بە پڕ خوێنی بۆیان دەگەڕێتەوە، جا دەڵێن: ئەوە زەوی نیشینانمان لەنێوبردو، بەسەر ئاسمان نیشیناندا بالآبوین، ئەوجا خودا پشت ملەکانیان کرمی دەکا و، بەوی دەکوژرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: سوێند بەوی گیانی منی دەستە گیاندارەکانی زەوی بە گۆشتی وان قەڵەو دەبن و گوانانیان پڕی شیر دەبن))[1].

لە ئەبوسەعیدی خودریەوە هاتوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم بیست دەیفەرمو: ((یفتح یأجوج ومأجوج، یخرجون علی الناس كما قال الله ﷻ: ﴿مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾، فیغشون الأرض، وینحاز المسلمون عنهم إلی مدائنهم وحصونهم، ویضمون إلیهم مواشیهم، ویشربون میاه الأرض، حتی أن بعضهم لیمر بالنهر، فیشربون ما فیه حتی یترکوه یبساً، حتی إن من بعدهم لیمر بذلك النهر، فیقول: قد كان هنا ماء مرة، حتی إذا لم یبق من الناس إلا أحد في حصن أو مدینة، قال قائلهم، هؤلاء أهل الأرض قد فرغنا منهم، بقي أهل السماء، قال: ثم یهز أحدهم حربته، ثم یرمي بها إلی السماء، فترجع مخضبة دما للبلاء والفتنة، فبینما هم علی ذلك، إذ بعث الله دوداً في أعناقهم كنغف الجراد الذي یخرج في أعناقهم، فیصبحون موتی لا یسمع لهم حس، فیقول المسلمون: ألا رجل یشري نفسه، فینظر ما فعل هذا العدو، قال: فیتجرد منهم محتسباً لنفسه، قد أظنها علی أنه مقتول، فینزل فیجدهم موتی، بعضهم علی بعض، فینادي: یا معشر المسلمین: ألا أبشروا، فإن الله قد كفاكم عدوكم، فیخرجون من مدائنهم وحصونهم، ویسرحون مواشیهم،، فما یكون لها رعی إلا لحومهم، فتشكر عنه كأحسن ما تشكر عن شيء من النبات أصابته قط: یاجوج و ماجوج ڕێ دەکەنەوە و، لە خەڵکی وەردەکەون هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ ﴿مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ: لە بەرزاییانەوە بەتاڵۆکە دێنەدەرێ﴾، جا زەوی دادەپۆشن و، موسڵمانان لە شار و قەڵاکانیان خۆ حەشار دەدەن و ماڵاتەکانیان دەبەنە لای خۆ

[1] في سنن الترمذي و ابن ماجة، و صحيح ابن حبان و مستدرك حاكم و مسند احمد عن ابي هريرة؛ وإسناده صحيح ؛ قال فيه الحاكم (صحيح على شرط الشيخين)، وافقه الذهبي، وقال الألباني: وهو كما قالا، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣١٣/٤) ورقمه (١٧٣٥).

و، ئەوانیش ئاوی زەوی دەخۆنەوە، تەنانەت هەندێکیان بەلای ڕوباردا تێدەپەڕن، هەرچی تێیدایە دەیخۆنەوە و وشکی دەکەن. تاکو وای لێدێ ئەوانی لە پاشەوان بەلای ئەو ڕوبارەدا ڕەت دەبن، دەڵێن: جارێکیان ئاو لێرە هەبو. تاکو هیچ کەسێك لە خەڵکی نامێنی مەگەر یەکێك لە قەڵات یا لە شاردا. یەکێکیان دەڵێ: ئەوە زەوینیشین بون لێیان بوینەوە، ئاسماننشین ماون، دەڵێ: جا یەکێکیان نێزەکەی هەڵدەشەقێنی و، هەڵیدەداتە ئاسمانێ، بۆ تاقیکردنەوە بە تێر خوێنی دەگەڕێتەوە. جا کە خەریکی ئەوەن، خودا کرمیان داوێتە گەردن و ملیان کرمی دەکا، بۆ سبەینێ هەمو دەمرن و هەستیان دەبڕێ. جا موسڵمانان دەڵێن پیاوێك نیە سەری خۆی بکڕێتەوە و، بزانێ ئەو دوژمنە چی کردوە، دەڵێ: جا یەکێکیان بۆ خێری خۆی لێدەبڕێ و، وا گومان دەبا هەر دەکوژرێ، کە دادەبەزی دەبینێ هەمو مردون و، کەلاکیان لەسەریەك کەوتوە، جا بانگ دەکا: هۆ گەلی موسڵمانان: موژدەتان لێبێ، خودا دوژمنەکەتانی لەکۆڵ کردنەوە، ئەوجا لەنێو قەڵات و شارەکانیان دێنەدەرێ و، ماڵاتەکانیان بەرەڵا دەکەن، جا لە گۆشتی وان بترازێ چ ڕەوەڵگەیەکی دیکەیان چنگ ناکەوێ، بەو خواردنە لە خواردنی هەمو ڕوەکێك زیاتر شیریان دەگوانی داگەڕێ)) [1].

ئەم دەقانەش بەڵگەی زۆری ژمارەی یاجوج و ماجوجە، بەشێوەیەك کەس نەتوانێ بەرەو ڕویان ڕاوەستێ.

[1] في سنن ابن ماجة، و صحيح ابن حبان، و مستدرك حاكم، و مسند احمد عن ابي سعيد الخدري؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٤٠٢)، وقد ذكر الشيخ ناصرالدين أن الحاكم قال فيه: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي، ألا أن الشيخ لم يرتض هذا، لأن إبن إسحاق أحد رواة الحديث، لم يخرج له مسلم إلا في المتابعات، فالحديث حسن.

# جێباسی پێنجەم

## دارنینی ئیسلام و هەڵگیرانی قورئان و لەنێوچونی چاکان

پاش ئەو بڵاوبونەوە مەزنی ئیسلام کە هەمو رۆژهەڵات و رۆژئاوایان دادەگرێ، دیسانەکێ ئیسلام لاواز دەبێتەوە و، تۆوی شەڕو خراپە چەکەرە دەکا و، ئەم دینە مەزنە و قورئانی پیرۆز هەڵدەگیرێن و، زانست نامێنێ و، خودا گیانی هەمو ئەو کەسانە دەکێشێ کە برە بڕوایەکیان لەناخدا ماوە. پاش ئەوە بێجگە لە خەڵکانی خراپەکار کەس نامێنی و، قیامەت لەوان هەڵدەستێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((يدرس الإسلام كما يدرس وشي الثوب، حتى لا يدري ما صيام، ولا صلاة، ولا نسك، ولا صدقة، وليسرى على كتاب الله في ليلة، فلا يبقى في الأرض منه آية، وتبقى طوائف من الناس: الشيخ الكبير والعجوز، يقولون: أدركنا آباءنا على هذه الكلمة "لا إله إلا الله" فنحن نقولها: نەخشی پۆشاك چۆن دەڕنرێ ئیسلامیش ئاوا دەڕنرێ، تا وای لێدێ نە کەس دەزانێ رۆژی چیە، نوێژ چیە، قوربانی و صەدەقە چین؟ جا لە شەوێکدا شەورۆیی بە سەر قورئاندا دەکرێ، تەنانەت ئایەتێکیش لەسەر زەویدا نامێنێ. هێندێك پیرو کەنەفتی خەڵکی دەمێنن، دەڵێن: لەسەر واژەی (لا إله إلا الله) بە باب و باپیری خۆمان ڕاگەیشتین، جا ئێمەش دەیڵێین)).[1]

ئەو پاشماوەیەش کە لە واژەی یەکخواناسی بترازێ چی دی لە ئیسلام نازانن، تونا دەبن و لەنێو دەچن. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لاتقوم الساعة الا على شرار الخلق:

[1] اخرجه ابن ماجة و، الحاكم عن حذيفة بن اليمان؛ قال الحاكم فيه، صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي، وقال البويصري: إسناده صحيح، رجاله ثقات؛ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة، للشيخ ناصرالدين الألباني، حديث رقم (٨٧).

**قیامەت تەنیا لەسەر خراپترینی خەڵکی هەڵدەستێ)).**[1]

**لە فەرمودەیەکی تریشدا پێغەمبەر ﷺ بۆمانی رون کردۆتەوە چۆن ئەو چاکەکار و صالحانەی ماون لە ئاخیرزەماندا لەنێو دەچن. هەروەك دەفەرموێ:**

((إن الله يبعث ريحاً من اليمن، ألين من الحرير، فلا تدع أحداً في قلبه مثقال ذرة من إيمان إلا قبضته: **خودا بایەکی ناسکتر لە ئاوریشم لەیەمەنەوە دەنێرێ، هەر کەسێکی تۆزقاڵێك بڕوای دە دڵیدا هەبێ لێی ناگەڕێ و گیانی دەکێشێ)).**[2] **لەئەنەسەوە هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لاتقوم الساعة حتى لا يقال في الارض: الله الله: **قیامەت هەڵناستێ تاکو کەس لە زەویدا نامێنی بڵێ:- الله الله)).**[3]

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((فبينما هم كذلك إذ بعث الله ريحاً طيبة فتأخذهم تحت آباطهم، فتقبض روح كل مؤمن، وكل مسلم، ويبقى شرار الناس يتهارجون تهارج الحمر، فعليهم تقوم الساعة: **جا کە لەو حاڵەتەدان، خودا سروەیەك دەنێرێ بەبن هەنگڵیان دادەچێ و گیانی هەمو بڕوادارێك و هەمو موسڵمانێك دەکێشێ، ئەوجا بەدکارترینی خەڵکی دەمێننەوە، لەبەرچاوی خەڵکی وەك کەر سوارێ یەکدی دەبن و گوێ نادەنێ،**[4] **جا قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێ)).**[5]

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((يذهب الصالحون الأول فالأول، وتبقى حثالة كحثالة الشعير أو التمر، لا يباليهم الله بالة: **صاڵح و چاکەکاران یەك بە دوای یەك لەنیو دەچن و نامێنن، ئەوجا کۆمەڵەکی گەندەی وەکو بن جۆخینی جۆ یا خورما دەمێننەوە، هەر**

---

[1] في صحيح مسلم عن عبدالله بن مسعود. رواه مسلم في كتاب الفتن، باب قرب الساعة، (٤/٢٢٦٨)حديث رقم (٢٩٤٩).

[2] يرويه مسلم عن ابن هريرة؛ رواه مسلم في صحيحه، حديث رقم (٧٩١٥)، وأنظر جامع الأصول: (١٠/٤١٠).

[3] رواه مسلم في صحيحه، مشكاة المصابيح: (٣/٥٠) حديث رقم (٥٥١٦).

[4] دەڵێم: ئەمڕۆ حاڵی خەڵکی وایە لەزۆر کۆمەڵگەی رۆژئاوا، لەو یانانەی بە یانەی ڕوتان ناودەبرێن و لەکەنار دەریاکان و، لەنێو باخ و دارستانان بەڕاستی وەك کەر سواری یەکتر دەبن.

[5] في صحيح مسلم عن النواس بن سمعان يرفعه؛ رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، بان ذكر الدجال ورقمه: (٢٩٣٧).

**خودایان بەخەیاڵدا نایێ)).**[1]

**لە داڕنینەکانی ئیسلام لەوان ڕۆژاندا نەمانی حەج وعەمرەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((لا تقوم الساعة حتى لا يحج البيت: **تا حەجی ماڵی خوا بکرێ، قیامەت دانایێ**))،[2] **گومانیش لەوەدا نیە پاش هەڵکردنی سروەبایەکە و کێشانی گیانی صاڵحان حەج کردن نامێنێ، دەنا پێشتر ئەو پەرستشە هەر بەردەوامە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((ليحجن هذا البيت وليعتمرن بعد خروج يأجوج ومأجوج: **بەڕاستی پاش دەرکەوتنی یاجوج و ماجوج، حەج و عەمرەی ئەم ماڵی خوایە دەکرێ**)).[3]

---

[1] رواه البخاري باسناده الى مرداس الاسلمي؛ انظر النهاية لابن كثير: (١\١٨٦).

[2] في مسند ابي يعلي و مستدرك الحاكم باسناد صحيح عن ابي سعيد؛ صحيح الجامع الصغير: (٦/١٧٤)، ورقمه: (٧٢٩٦).

[3] في صحيح البخاري عن ابي سعيد الخدري؛ رواه البخاري، أنظر النهاية لإبن كثير: (١/١٨٦).

## جێباسی شەشەم

# گەڕانەوەی مرۆڤایەتی بۆ جاهلیەت و بتپەرستی

**جاکە ئیسلام داڕنراو، قورئان هەڵگیراو، سروە با گیانی هەمو ئەوانەی کێشا کە تۆزقاڵە بڕوایەکیان لە دڵیدا هەیە، مرۆڤایەتی بۆ جاهیلیەتی سەرەتا یا توندتریش دەگەڕێتەوە، جا گوێڕایەڵی شەیتان دەکا و، بتان دەپەرستێ.**

**پێغەمبەرﷺیش ئەو باسەی بۆ فەرموین، کە پاش مردنی مەسیح ﷺ لە ئاخیرزەماندا چی ڕودەدا:**

**لە فەرمودەی عەبدوڵلای کوڕی عەمر لەلای موسلیمدا هاتوە:**

((ثم يرسل الله ريحاً باردة من قبل الشام، فلا يبقى على وجه الأرض أحد في قلبه مثقـال ذرة من خير أو إيمان إلا قبضته، حتى لو كان أحدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه، حتى تقبضه: **ئەوجا خوا کزەبایەکی فێنك لەلای شامەوە دەنێرێ، گیانی هەمو یەکێکی سەر روی زەوی دەکێشێ کە تۆزقاڵێك خێر یا بڕوایی لە دڵدا هەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێکتان بچێتە نێو جەرگەی کێوێك، هەر لێی دەچێتە ژورو دەیگاتێ و گیانی دەکێشێ))، عەبدوڵلا دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستوە دەفەرموێ:** ((فيبقى شرار الناس في خفة الطير، وأحلام السباع، لا يعرفون معروفاً، ولا ينكرون منكراً، فيتمثل لهم الشيطان فيقول: ألا تستجيبون؟ فيقولون: ما تأمرنا؟ فيأمرهم بعبادة الأوثان، وهم في ذلك دارة أرزاقهم، حسن عيشهم، ثم ينفخ في الصور...: **جا خراپترینی خەڵكی لە سوکی باڵندە و، خەونی درِندانـدا دەمێنن، نە چاکەیەك ئەنجام دەدەن و نە ڕێ لە خراپەیەك دەگرن، ئەوجا شەیتان خۆیان بۆ ڕادەنوێنێ و دەڵێ: ئەدی وەرامی من نادەنەوە؟ دەڵێن: چ فەرمانێکمان پێ دەدەی؟ جا فەرمانی بتپەرستییان پێدەدا لەگەڵ ئەوەشدا بژێوییان**

**دەگەڕێ و، ژینیانچاکە، پاشان فو بە شەیپوردا دەکرێ...))**[1]

**لەوان بتانی دەشپەرسترێن (ذو الخلصة)ی تاغوتی دەوس و، لات و عوززان. لە ئەبوهورەیرەوە؛ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((لا تقوم الساعة حتى تضطرب اليات نساء دوس على ذي الخلصة: **قیامەت ڕانابێ هەتا کەفەڵی ژنانی دەوس بە دەوری ذولخیلصەدا هەڵتەك هەڵتەك دەکا))، ذولخیلصەش ئەو بتەیە کە خێڵی دەوس لەکاتی جاهیلیەتدا دەیانپەرست.**[2]

**لە صەحیحی موسلیمیش لە عائیشەوە هاتوە، کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بو دەیفەرمو:** ((لا يذهب الليل و النهار حتى تعبد اللات و العزى: **شەو و ڕۆژ بەسەر ناچن هەتا لات و عوززا دەپەرسترێنەوە)).**

**جا عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە ئەم ئایەتە دابەزێ وامزانی تاسەرە، کە دەفەرموێ:**

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ: **ئەو خودایەیە کە پێغەمبەرەکەی خۆی بەرێنمایی و دینی هەق ڕەوان کرد هەتا بەسەر هەمو دیناندا سەری خا، ئەگەرچی موشریکانیش پێیان ناخۆش بێ﴾**[3].

**فەرموی:** ((إنه سيكون من ذلك ما شاء الله، ثم يبعث الله ريحا طيبة، فتوفي كل من في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان، فيبقى من لا خير فيه، فيرجعون الى دين آبائهم: **هەتا ویستی خوای لەسەر بێ وا دەمێنتەوە، پاشان خودا سروە بایەك دەنێرێ، هەرچی بەقەد دەنکە خەردەلەیەك بڕوای دە دەڵیدا هەبێ، گیانی دەکێشی، تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خێریان پێوە نیە، ئەوانیش دەگەڕێنەوە سەر دینی باب و**

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب خروج الدجال، (٤/٢٢٥٨)، ورقمه (٢٩٤٠).

[2] في صحيح البخاري و مسلم؛ رواه البخاري، في كتاب الفتن، باب تغير الزمان حتى تعبد الأوثان، فتح الباري: (١٣/٧٦). ورواه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، (٤/٢٢٣٠)، ورقم الحديث: (٢٩٠٦)، والسياق للبخاري. -ناساندنيذۆولخيلصە لەهەردو صەحیحاندا هاتوە.-

[3] سورة التوبة: ٣٣

**باپیریان))**.[1]

**هەروەها لەو سەردەمیدا ئاستی ڕەوشت یەكجار زۆر دادەبەزێ، عەبدوڵلای كوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقوم الساعة حتى يتسافدوا في الطريق تسافد الحمير: قیامەت دانایێ هەتا خەڵك لەچەقی ڕێگادا وەكو كەر سواری یەكدی دەبن)). گوتم: جا ئەمە ڕودەدا، فەرموی: ((نعم، ليكونن: بەڵێ ڕودەدا)).**

**ئەم فەرمودەیەش پاڵپشتێكی لەلای حاكیم هەیە لە فەرمودەی ئەبو هورەیرە بەمەرفوعی: ((والذي نفسي بيده لا تفنى هذه الأمة حتى يقوم الرجل إلى المرأة فيفترشها في الطريق، فيكون خيارهم يومئذٍ من يقول: هلاّ واريتها وراء هذا الحائط: سوێند بەو زاتەی گیانی منی وەدەستە، ئەم ئوممەتە تونا نابێ، تا پیاو بۆ ژن هەڵدەستێ و لەچەقی ڕێگا ڕایدێخێ، جا چاكترین كەسێكی ئەوێ ڕۆژێ ئەو كەسەیە كە بڵێ: ئەگەر بتبردبایە پەنا ئەو دیوارەی))**.[2]

**پاڵپشتێكی تریشی هەیە لە فەرمودەكەی نەواسی كوڕی سەمعان لە فەرمودە درێژەكەی دەربارەی دەجال و یاجوج و ماجوج، لەكۆتاكەیدا دەفەرموێ: ((فبينما هم كذلك إذ بعث الله ريحا طيبة، فتأخذهم تحت آباطهم، فتقبض روح كل مؤمن، وكل مسلم، ويبقى شرار الناس، يتهارجون تهارج الحمر، فعليهم تقوم الساعة: كاتێك كە لەو بارەی دان، خوای گەورە سروەبایەك دەنێرێ و بەبن هەنگڵیان ڕەت دەبێ و، گیانی هەر بڕوادار و موسڵمانێك دەكێشێ و، تەنیا بەدكارترینی خەڵكی دەمێنن، وەكو كەر لەنێوەندی ڕێدا سواری یەك دەبن، جا قیامەت لەسەر ئەوان هەڵدەستێ))**.[3]

---

[1] رواه مسلم في كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، (٤/٢٢٣٠)، ورقم الحديث: (٢٩٠٦).

[2] اخرجه البزاز في مسنده، و ابن حبان في صحيحه عن عبدالله بن عمرو؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (١/٢٤٥).

[3] رواه مسلم و احمد و الحاكم.

## جێباسی هەفتەم

# روخاندنی کەعبە لەلایەن قاچ باریکەوە

ڕەنگە هەر ئەو سەردەمەش بێ کە ذولسوەیقەتەین (قاچ باریك) کەعبەی تێدا وێران دەکا:

ئەحمەدی پێشەوا لە موسنەدەکەیدا بەچەند ڕێگەیەك دەگێڕێتەوە؛ لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((يبايع لرجل ما بين الركن والمقام، ولن يستحل البيت إلا أهله، فإذا استحلوه فلا يسأل عن هلكة العرب، ثم تأتي الحبشة فيخربونه خراباً لا يعمر بعده أبداً، وهم الذين يستخرجون كنزه: لەنێوان روکن و مەقامدا بەیعەت دەدرێتە پیاوێك، ئەوەی ماڵی خواش حەڵاڵ دەکا هەر ئەهلی ئەوێن، جا کە حەڵاڵیان کرد ئەوکات پرسیار لە بە هیلاك چونی عارەبان ناکرێ، پاشان حەبەشی دێن و وا وێرانی دەکەن جارێکی دی بنیات نەنرێتەوە، ئەوانیشن کە گەنجینەکەی دەردێنن)).[1]

هەر ئەحمەدی پێشەوا لە موسنەدەکەیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بو فەرموی: ((يخرب الكعبة ذو السويقتين في الحبشة، ويسلبها حليها، ويجردها من كسوتها، ولكأني أنظر إليه أصيلعاً أفيدعاً، يضرب بمسحاته ومعوله: قاچ باریك لە حەبەشەیەو کەعبە خاپور دەکا و، خشڵەکانی دەستێنێ، لە پۆشاکەکەی دایدەماڵێ و، وەك بڵێی وا سەیری دەکەم؛ کەچەڵیکی گۆجەیە و، کوتکەکەی ڕادەوشێنێ)).[2]

---

[1] سلسلة الاحاديث الصحيحة: (١\٢٤٥).

[2] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (١١٩/٢)، ورقم الحديث: (٥٧٩).

• له ئیبنیعەباسەوە؛ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((كأني أنظر إليه أسود أفحج، ينقضها حجراً حجراً، يعني الكعبة: دەڵێی وا سەیری دەکەم؛ ڕەشێکی کەپو فشە، بەرد بەرد کەعبە تێك دەدا و هەڵیدەوەشێنێ)).[1]

لەصەحیحی موسلیمیش لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((يخرب الكعبة ذوالسويقتين من الحبشة: ذولسوەیقەتەین لە حەبەشە کەعبە خرا دەکا)).[2]

بۆیەش بە ذولسەویقەتەین ناوبراوە چونکە قاچی باریکە، زۆربەی ڕەش پێستەکانیش ئاوان.

ڕەنگە بشکوترێ جا چۆن کاولی دەکا و دەیڕوخێنێ لەکاتێکدا خودا مەککەی کردۆتە حەرەمێکی پارێزراو؟ وەرام وایە: تا نێزیکی قیامەت و کۆربونەوەی دنیایێ مەککە پارێزراو و بەر ئاسایشە. نەوەوی وای گوتوە. ئەمە ڕاستە ئەگەر روخاندنەکە لەوکاتە ڕوبدا، ئەگەر نا ئەوا مەسەلەکە حوکمێکی شەرعیە و خودا بەندانی خۆی پێ پەیوەست کردون، جا ئەگەر یەکێك یاخی بو حورمەتی ماڵی خوای بەزاند، ڕەنگە وەکو ئەبرەهە خودا ڕێی لێبگرێ، هەروەك ڕەنگە لەبەر بونی حیکمەتێك کە خۆی پێی زانا و دانایە، ڕێیان لێ نەگرێ، وەکو قەرامیطەکان کە کەعبەیان داگیر کرد و ئەوی کردیان کردیان، یا وەك ئەوەی ئەو قاچ باریکە پیس و بودەڵەیە دەیکات.

---

[1] في صحيح البخاري و مسند احمد؛ قال إبن كثير في النهاية: (١٨٧/١) إسناده قوي.

[2] رواه في صحيحه في كتاب الفتن؛ (٢٢٣٢/٤)ورقمه: (٢٩٠٩)؛ شرح النووي على مسلم(٣٥/١٨).

## جێباسی هەشتەم

# هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاوا

لەو نیشانە ڕون و ئاشکرایانەی بەڵگەی ڕودانی قیامەتن، هەڵاتنی ڕۆژە لە ڕۆژئاوا،

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە ئەبو هورەیرە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها، فإذا طلعت فرآها الناس آمنوا أجمعين، فذلك حين لا ينفع نفساً إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيراً: قیامەت هەڵناستێ هەتا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ. جا کە لەوێوە هەڵات و خەڵك دیتی هەمویان بڕوا دێنن، بەڵام ئەوکاتە کاتێکە بڕواهێنان بەکەڵك کەس نایێ کە پێشتر بڕوای نەهێنابێ یا لە بڕواکەیدا خێری وەدەست نەهێنابێ)).[1]

---

صحيح البخاري: كتاب الرقاق، فتح الباري: (١١/٣٥٢)، ورواه مسلم في كتاب الإيمان، بـــاب بيـــان

## جێباسی نۆیەم

## دەرکەوتنی گیاندارەکە( الدابة )

ئەم گیاندارە جوڵندەیە یەکێك لەو نیشانانەی خوای گەورەیە کە لە ئاخیرزەماندا دەردەکەون، لەو کاتەی کە خراپە زۆر دەبێ و، گەندی بڵاودەبێتەوە. چاکەکارانیش کەمینەی ئەو زەمانن. ئەو گیاندارەنەش هەر ئەوەتکە خودا لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردوە کە دەفەرمێ:

﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنْ الأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لاَ يُوقِنُونَ: هەر کاتێك فەرمانی عەزابی ئەوانە بگات و قیامەت دابێ گیاندارێك لە زەوی بۆ ئەوان دێنینە دەرێ کە قسەیان لەگەڵ دەکا، بەڕاستی ئەم خەڵکە باوەڕ و ئاوەر(یقین)یان بە نیشانەگەلی ئێمە نەبو﴾[1]

بێگومان ئەم گیاندارە وەکو ئەو گیاندارانە نیە کە مرۆڤ پێیان ڕاهاتوە، چونکە ئەمە خەڵکی دەدوێنێ و لەگەڵیان قسەدەکات، کۆمەڵە فەرمودەیەکیشمان هێناوە کە تیایاندا پێغەمبەر ﷺ دەرکەوتنی گیاندارەکەی بە یەکێك لە نیشانە مەزنەکانی قیامەت ئەژماردوە.

ئەبو ئومامە بۆ پێغەمبەر ﷺ بەرزی دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ((تخرج الدابة، فتسم الناس على خراطيمهم، ثم يعمرون فيكم حتى يشتري الرجل البعير، فيقول: ممن إشتريته؟ فيقول: إشتريته من أحد المخطمين: گیاندارەکە دەردەکەوێ و، خەڵکی لەسەر کەپویانەوە دەسمێ، ئەوانەش لەنێوتاندا تەمەنیان درێژدەبێ، تا وای لێدێ پیاوێك حوشترێك دەکرێ، دەڵێن: لە کێت کڕیوە؟ دەڵێ: لەیەکێك لە کەپوسمراوانم کڕیوە)).[2]

---

[1] سورة النمل: ٨٢.

[2] رواه الامام احمد في مسنده، و البخاري في الكبير، و البغوي في (حديث علي بن الجعد)، ابو نعيم في اخبار اصفهان باسناد صحيح. سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣١/١)، ورقمه: (٣٢٢).

## جێباسی دەیەم

## ئەو ئاگرەی خەڵکی کۆدەکاتەوە

**دوایین ئەو نیشانانەی بەر لە داهاتنی قیامەتێ دێنە ئارا، ئاگرێکە لە قولایی عەدەنەوە دەردەکەوێ و، خەڵکی بۆ حەشرگەیان کۆدەکاتەوە. پێشتر ئەو فەرمودانەشمان هێناوە کە پێغەمبەر ﷺ نیشانەکانی قیامەتی تێدا ژماردون و، باسی کردوە کە دە نیشانەن، دەفەرمێ:** ((وآخر ذلك نار تخرج من اليمن، تطرد الناس الى محشرهم: **دواییینی هەمو ئەوانە ئاگرێکە لە یەمەنەوە دەکەوێتەوە، خەڵکی بەرەو حەشرگەکەیان دەردەکا**)).[1]

**لەصەحیحی بوخاریدا لە ئەنەسەوە ﷺ هاتوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام هەواڵی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺی بۆ مەدینە پێگەیشت، جا هاتە لای تا هەندێك پرسیاری لێ بکا و، گوتی: من لەبابەت سێ شتانەوە پرسیارت لێ دەکەم: هەوەڵ نیشانەکانی قیامەتێ چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((أما أول أشراط الساعة فنار تحشرهم من المشرق الى المغرب: **هەرچی یەکەمین نیشانەکانی قیامەتە، ئاگرێکە خەڵکی لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا رادەپێچێ و کۆیان دەکاتەوە**)).[2]

**هەروەها لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((ستخرج نار من حضرموت قبل القيامة تحشر الناس: **بەر لە قیامەتێ ئاگرێك لە حەضرەمەوتەوە هەڵدەستێ خەڵکی کۆدەکاتەوە**)). **گوتیان: جا ئەی پێغەمبەری خوا، بەچی فەرمانمان**

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب الآيات التي تكون قبل الساعة، (٢٢٢٥/٤) ورقمه (٢٩٠١).

[2] ئەگەر ويستت تەواوى پرسيار و وەلامەكان بزانى بگەڕێوە بۆ صحيح البخاري، كتاب مناقب الأنصار، فتح الباري: (٢٧٢/٧).

پێدەکەی. فەرموی: ((عليكم بالشام: ڕو لە شام بکەن)).[1]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەی بۆ فەرموین، ئاگرەکە چۆن خەڵکی کۆدەکاتەوە، هەروەك دەفەرموێ: ((يحشر الناس على ثلاث طرائق راغبين راهبين، وإثنان على بعير، وثلاثة على بعير، وأربعة على بعير، وعشرة على بعير، ويحشر بقيتهم النار، تقيل معهم حيث قالوا، وتبيت معهم حيث باتوا، وتصبح معهم حيث أصبحوا، وتمسي معهم حيث أمسوا: خەڵکی لەسەر سێ ڕێچکان بە ئارەزو و ترسەوە حەشر دەکرێن، جا دوان لەسەر حوشترێك و، سێ لەسەر حوشترێك و، چوار لەسەر حوشترێك و، دە لەسەر حوشترێك. ئەوانی دیکەش ئاگر کۆیان دەکاتەوە، لەکوێ سەرخەوبشکێنن سەرخەو دەشکێنێ و، لەکوێ شەوبکەنەوە شەو دەکاتەوە و، لەکوێ سبەینە بکەنەوە لەوێ ڕۆژە دەکاتەوە و، لەکوێ ئێوارەیان بەسەردابێ ئێوارەی بەسەردا دێ)).[2]

هەروەها معاويەی کوڕی حيدە دەگێڕتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إنكم تحشرون رجالا وركبانا، وتجرون على وجوهكم هاهنا: ئێوە بە پیادەیی و بەسواری حەشر دەکرێن و، ئا لێرەدا بەسەر ڕوتان ڕادەکێشرێن))، بە دەستیشی ئاماژەی بۆ شام کرد.[3]

دوامین کەسیش ئاگر حەشریان بکا دو شوانی (مەزینە)ن، لەو فەرمودەی لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرمو: ((يتركون المدينة على خير ما كانت، لا يغشاها إلا العوافي، وآخر من يحشر راعيان من مزينة، ينعقان بغنمها، فيجدانها وحشاً، حتى إذا بلغا ثنية الوداع خرّا على وجههما: جا مەدینە لەباشترین باریدا جێ دێڵن، لە باڵندە و گیانداران بترازێ چی دی هاموشۆی ناکا، دوامین ئەوانەی حەشر دەکرێن دو شوانی مەزینەن، لە مەڕەکانیان

---

[1] سنن الترمذي، وقال حديث حسن صحيح؛ جامع الأصول: (١٠/٣٦٧) ورقم الحديث (٧٨٨٨)، وأنظر صحيح الجامع الصغير: (٣/٢٠٣) ورقم الحديث: (٣٦٠٣).

[2] في صحيح البخاري عن ابي هريرة. صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب الحشر، فتح الباري: (٣/٣٧٧).

[3] رواه احمد في مسنده و الترمذي في سننه، و الحاكم في مستدركه باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (٢/٢٧٢) ورقمه: (٢٢٩٨).

ڕادەخوڕن، دەبینن دڕندەنە، تا دەگەنە ئەنیەتولوەداع و لەوێ بەسەر ڕویاندا دەکەون)).[1]

ئەو خاکەی خەڵکیشی تێ کۆدەکرێتەوە، وڵاتی شامە. لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، دەفەرمێ: ((الشام ارض المحشر و المنشر: شام خاکی حەشر و نەشرە)).[2] جا هەندێك لە زانایان وای بۆچون، ئەم حەشر و کۆکردنەوەی لە دوایین دادەبێ، قورطوبی ئەم رایەی داوەتە پاڵ حلێمی و ئەبوحامدی غەزالی.[3]

خەطابی و طیبی و قاضی عەیاض و قورطوبی و ئیبنی کەثیر و ئیبنی حەجەر وای بۆدەچن کە ئەم کۆکردنەوەیە لە کۆتا تەمەنی دنیایێ دەبێ، کە ئاگر لە قولایی عەدەن دەکەوێتەوە و، خەڵکی بەرەو وڵاتی شام ڕاپێچ دەکا و کۆیان دەکاتەوە.[4]

ئیبنی کەثیر لەبارەی ئەم فەرمودانە دەڵێ: (ئەم بابەتانە بەڵگەن کە ئەم حەشرە کۆکردنەوەی ئەوانەیە کە لە دوایین دنیادا ماون لە شوێنی حەشردا، کە خاکی شامە. ئەوانەشی سێ پۆلن: بەشێك بەتێری و پۆشتەیی و سواری حەشر دەکرێن و، بەشێك دەمێك سوار و دەمێك پیادەن و، بەنۆرە حوشترێك ئاڵوگۆر دەکەن. هەروەك پێشتر باسکرا: ((اثنان على بعير، و ثلاثة على بعير، و عشرة على بعير: دوان لەسەر حوشترێك و، سێ لەسەر حوشترێك و، دە لەسەر حوشترێك)). واتە بەنۆرە سواری پشتی دەبن، چونکە کەمیان هەن، هەروەك پێشتر باسکرا و، لە فەرمودەکەی دیکەش مانا دراوەتەوە، ئەوانەی دەشمێننەوە ئاگر کۆیان دەکاتەوە، ئەو ئاگرەی لە قولایی عەدەن دەکەوێتەوە، لە پشتەوەڕا بەری خەڵکی دەگرێ و، لەهەمو لایەکەوە بۆ خاکی مەحەشەریان دەبات ئەوی لێشیان بەجێ بمێنێ ئاگرەکە هەڵی دەلوشێ.

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٠٢/٢) ورقمه: (٦٨٣).

[2] رواه احمد في مسنده و ابن ماجة في سننه و الربعي في فضائل الشام عن ميمونة بنت سعد: صحيح جامع الصغير: (٢٣٢/٣) ورقمه (٣٧٩/١١).

[3] التذكرة للقرطبي: ص١٩٨-١٩٩، فتح الباري: (٣٧٩/١١٤).

[4] فتح الباري: (٣٨٠/١١-٣٨٩)، التذكرة: ص٢٠٠.

ئەمانەش هەمو بەڵگەن کە ئەوە لە کۆتایی دنیادا دەبێ، کە خواردن و خواردنەوە هەن و سواری و شتی تریش هەن و ئەوانی جێش بمێنن بەئاگری تێدەچن.

جا ئەگەر ئەم ڕوداوە پاش شەیپوری زندیبونەوە بوایە، ئەوانە مردن دەما و، نە گیاندارێك سواری پشتی بن، نەخواردن دەماو نەخواردنەوە، نە پۆشین لە گۆڕەپانان.

یەکجار سەیریشە کە ئەبوبەکری بەیهەقی حافیز، پاش ئەوەی زۆربەی ئەم فەرمودانە دەگێڕتەوە، ئەوجا ئەم سوارییەی بە ڕوداوێکی قیامەت داناوە، ئەمەی بە صەحیح داناوە و، ئەوەشی بەلاواز داناوە کە ئێمە گوتمان، بەبەڵگەش ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە کە دەفەرمێ:

﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَانِ وَفْدًا، وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا: لەو ڕۆژەی کەخۆپارێزان بەتێکڕایی بۆ لای خودای میهرەبان کۆدەکەینەوە، تاوانبارانیش بە تینویەتی بە دۆزەخ لێ دەخوڕین.﴾[1]

جا چۆن گریمانەکەی خۆی لە ڕاڤەی ئایەتەکەدا بە فەرمودە ڕاست دەکاتەوە، لەکاتێکدا لە فەرمودە باسی ئەوە هاتوە کە، دوان لەسەر حوشترێکن و، دە کەس لەسەر حوشترێکن و بە ڕاشکاوی کەمی ئاژەڵی سواریی تێدا هاتوە؟ ئەمە لەگەڵ ئەو کۆك نین، خوداش زاناترە: ئەوان یەهاداری بەهەشتن و بڕواداران سواری دەبن لە گۆڕەپانانەوە تا بەهەشتێ و، بەم شێوە و سیفەتەش نین، هەروەك لەشوێنی خۆیدا ڕون دەکرێتەوە).[2]

---

[1] سورة مريم: ٨٥ –٨٦.

[2] النهاية لابن كثير: (١\٢٥٩)

# سەرچاوەکان

## (بە پێی پیتەکان ریز کراوە)


١ -احكام الجنائز وبدعها، للشيخ ناصرالدين الالباني، نشرة المكتب الاسلامي، بيروت، الطبعة الاولى، ١٣٨٨هة-١٩٦٩م٠

٢-ارواء الغليل، للشيخ ناصرالدين الالباني، نشره المكتب الاسلامي-بيروت-الطبعة الاولى ١٣٩٩ هـ-١٩٧٩م٠

٣-البداية والنهاية، لابن كثير٠طبعة مكتبة المعارف-بيروت- الطبعة الثانية، ١٩٧٧٠

٤-التذكرة في احوال الموتى وامور الاخرة، للقرطبي- طبعة المكتبة السلفية-المدينة المنورة٠

٥-تفسير ابن كثير٠طبعة دار الاندلس-بيروت-الطبعة الاولى- ١٣٨٥هـ- ١٩٦٦م٠

٦- تلخيص الحبير، لابن حجر- طبعة شركة الطباعة الفنية المتحدة-القاهرة٠

٧-جامع الاصول في احاديث الرسول، لابن كثير-تحقيق عبدالقادر الارناؤوط-نشر مكتبة الحلوانيومكتية الملاح- الطبعة الاولى٠ ١٣٩٢ هـ-١٩٧٢م٠

٨-جامع العلوم والحكم، لابن رجب٠ طبعة دار المعرفة- بيروت٠

٩-الرد على من كذب بالاحاديث الصحيحةالواردة في المهدي-لعبد المحسن ابن الحمد العباد- الطبعة الاولى- مطابع دار الرشيدالمدينة المنورة٠

١٠-الروح، لابن القيم-طبعة دار الكتب العلمية-بيروت-الطبعة الاولى: ١٤٠٢ هـ- ١٩٨٢ ٠

١١-الزهد والرقائق، لابن المبارك- طبع مؤسسة الرسالة٠ بيروت٠

١٢-سلسلة الاحاديث الصحيحة، للشيخ ناصرالدين الالباني، نشر المكتب الاسلامي-بيروت-الطبعة الاولى٠

١٣-سنن الترمذي- طبعة مصطفى الباني الحلبي-تحقيق أحمد محمد شاكر- الطبعة الاولى٠

١٤-سنن النسائي- طبعة دار احياءالكتب العربية-القاهرة - الطبعة الاولى ١٣٧٢هـ-١٩٥٢م٠

١٥-شرح العقيدة الطحاوية، لمحمد بن محمد بن محمدبن ابي العز الحنفي- نشر المكتب الاسلامي-بيروت، الطبعة الرابعة-١٣٩١هـ٠

١٦-شرح النوي على مسلم، للنووي- طبعة المكتبة العصرية-القاهرة ٠

١٧- صحيح البخاري، اعتمدنا على متن فتح الباري-الطبعة السلفية/ القاهرة/ الطبعة الاولى٠

١٨-صحيح الجامع الصغير، للسيوطي- تحقيق محمد ناصرالدين الالباني- نشره المكتب الاسلامي-بيروت- الطبعة الاولى ١٣٨٨ هـ-١٩٦٩م٠

١٩-صحيح مسلم- تحقيق محمد فؤادعبدالباقي- طبعة داراحياء الكتب العربية-بيروت- الطبعة الثانية-١٩٧٢

٢٠-العقل والروح، لابن تيمية- رسالة مطبوعة ضمن"مجموعةالرسائل المنيرية"٠

٢١-عقيدة أهل السنة والاثر في المهدي المنتنظر، لعبد المحسن بن حمد العباد-الطبعة الاولى- مطابع الرشيد-المدينة المنورة٠

٢٢-فتح الباري، لابن حجر العسقلاني- طبعة المكتبة السلفية-القاهرة- الطبعة الاولى٠

٢٣-الكبائر، للذهبي-طبعة المكتبة الثقافية-بيروت٠

٢٤-لسان العرب، لابن منظور- ترتيب يوسف خياط ونديم مرعشلي-دار لسان العرب٠

٢٥- لوامع الانوار البهية، للسفاريني- طبعة دولة قطر-الطبعة الاولى٠

٢٦-مجموع فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية - جمع ابن قاسم- طبعة دولة المملكة العربية السعودية- الطبعة الاولى٠

٢٧-مختار الصحاح- طبعة دار المعارف-مصر٠

٢٨-مسند الامام احمد- طبعة المكتب الاسلامي-بيروت٠

٢٩-مشكاة المصابيح، للخطيب التبريزي- طبعة المكتب الاسلامي-بدمشق- الطبعة الاولى: ١٣٨١ هـ-١٩٦١م٠

٣٠-المقدمة، لابن خلدون- الطبعة الثانية-طبعة مكيبة المدرسة، ودار الكتاب اللبناني-بيروت: ١٩٧٩م٠

٣١-المناتر المنيف في الصحيح والضعيف، لابن القيم- طبعة مكتبة المطبوعات الاسلامية-حلب- الطبعة الاولى: ١٣٩٠هـ-١٩٧٠م٠

٣٢-نهاية البداية والنهاية، لابن كثير- نشر مكتبة النصر الحديثة-الرياض- الطبعة الاولى: ١٩٦٨.

٣٣-يقظة اولى الاعتبارمما ورد في ذكر الناروأصحاب النار، لصديق حسن خان- طبعة دار الانصار-القاهرة- الطبعة الاولى: ١٣٩٨هـ-١٩٧٩م٠

٣٤-اليوم الاخر في ظلال القرآن، جمع واعداد احمد فائز-طبعة مؤسسة الرسالة- دمشق-الطبعة السابعة: ١٤٠٥هـ-١٩٨٤م٠

# ڕشتەی بابەتەکان

## بەندی دوەم



## بەندی سێیەم

## بەندی چارەم

## بەندی پێنجەم

## دەروازەی دووەم



### بەندی یەکەم

## بەندی دوەم



## بەندی سێیەم

## بەندی چارەم

## بەندی پێنجەم